# یەکەمین ترپە عاشقانەییەکانی دڵم

**نامەکانی فروغ فەڕوخزاد**

**بۆ ( پەرویز شاپور)ی هاوسەری**

**بەهەوڵ و کۆششی**
**کامیار شاپور و عومرانی سەلاحی**

**وەرگێڕانی لە فارسییەوە**
**ئەبوبەکر قەرەداغی**

**سلێمانی** – 2006

اولین تپش های عاشقانهء قلبم

نامه‌های فروغ فرخ زاد به پرویز شاپور

به‌کوشش کامیار شاپور

چاپ سوم شهریور 1382

چاپخانه دیدآور

**حکومەتی هەرێمی کوردستان**

**وەزارەتی ڕۆشنبیری**

**بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان**

www.roshnbiri.org
khanaywargeran@yahoo.com

- **ناوی کتێب**: **یەکەمین ترپە عشقانەییەکانی دڵم**
- **ناوی نووسەر**: **کامیار شاپور و عومرانی سەلاحی**
- **وەرگێڕانی لەفارسییەوە**: **ئەبوبەکر قەرەداغی**
- **بابەت**: **ئەدەبی**
- **سەرپەرشتیاری هونەری**: **زاناکەمال**
- **تایپ**: **وەرگێڕ**
- **نەخشەسازی کۆمپیوتەری**: **زانا کەمال**
- **نەخشەسازی بەرگ**: **زانا کەمال**
- **زنجیرە**: 130
- **تیراژ**: 1500
- **ژمارەی**(720)**ی وەزارەتی ڕۆشنبیری سلێمانی پێدراوە**
- **چاپ**:

## ڕوونكردنەوەیەك بەر لەخوێندنەوە

خوێنەری بەڕێز ....

بەمەبەستی وەرگێڕانو لەچاپدانی ئەم كتێبە، لەحوزەیرانی 2004 دا، بەندە گرێبەستێكی لەگەڵ بەڕێوەبەرێتی خانەی وەرگێڕان ئەنجامدا. لەتشرینی دووەمی هەمان ساڵدا لە وەرگێڕانەكەی بوومەوەو گەڕاندمەوە بۆ خانە. دوای پێداچوونەوەی لەلایەن شارەزایانی خانەوەو بەتەواوی لەسەرەتایی كانوونی یەكەمی ئەو ساڵەدا، كتێبەكە خرایە بەرنامەوەو، بەڵام لەبەر هەندێ گرفتی هونەری و دارایی خانەی وەرگێڕان كەڵەكە بوونی ژمارەیەك كتێبی زۆر، لەچاپدانی ئەم كتێبە دواكەوت بۆ ئەم كاتە. دەبێ ئەوەش بڵێم كەئەمە تەرجەمەی هەموو كتێبەكەیەو كەیەك دوو نامە لەم نامانە، لەو ساڵەداو لەیەك دوو گۆڤارو ڕۆژنامەدا بڵاوكراونەتەوەو برادەرانی خانەو چەند نوسەرو ڕوناكبیرێكی تر ئاگایان لەم وەرگێڕانە هەیە. هیوادارم بەم كارەم خزمەتێكی بچووكم لەو بوارەدا كردبێتو جێی ڕەزامەندی ئێوەی بەڕێزیش بێت.

ئەبو بەكر قەرداغی

شوباتی 2006

حەزدەکەم ئەوەندە بچووك ببمەوە تا
هێندەی باڵندەیەکم لێ دێ ، ئەو کاتە
بدەم لەشەقەی باڵ و بێم بۆ لای تۆ

"فروغ"



## کامی گیان "

سەردەمێ کە فروغ ئەم نامانەی بۆ پەروێز دەنووسی ،باوەڕی نەدەکرد ڕۆژێ لەڕۆژان کەسێکی خۆتێهەڵقورتێنەری گەڕەك پەیدا ببێ‌و دزە بکاتە ناو نامە تایبەتییەکانیەوە. ئەونامانەی کەهەندێکیان بەهەزار ترس و لەرز نوسراوە و بەهەزار کۆسپ و لەمپەر گەیشتۆتە دەستی وەرگر.

ئەم ڕۆژانە نەریتی نامە نووسین خەریکە لە ناو دەچێ دەبینین لە مەودوا فاکس و ئیمێڵ و تەلەفون ، لەناو هونەرمەنداندا شوێنی نووسین دەگرنەوە . بەڕای من هیچ یەکێ لە مانە ، جێگەی نامە ناگرێتەوە. نامە شتێکی دیکەیە. فاکس و ئیمێڵ و پەیام وەرگر و هاوشێوەکانیان هەموویان دەبینرێن و دەبیسرێن .شتە شاراوەکان چێژێکی دیکەیان هەیە . نامەیەك کە بە ترس و لە رز و شەیدایی و تامەزرۆییەوە ، دوور لە چاوان و لە شوێنی تایبەتدا دەخوێندرێتەوە لە کوێ و فاکسێك کە بەبێ زەرف و پێچانەوە دەکەوێتە بەر دەست و بەرچاوی هەموان لە کوێ. کردنەوەی نامە چێژێکی دیکەی هەیە ، بەتایبەتی ئەگەر لەلای خۆشەویستێکەوە هاتبێ . وەرگر زەرفەکە دەداتە بەر روناکی و بە وریاییەوە و بە جوانییدەیکاتەوە تا نامەکە نەدڕێت . کەنامەکە دەکاتەوە , روخساری کەسەکەی تیادەبینێ و

لەدێڕ بە دێڕییەوە بۆنی ئەوی لێد ێت. دیارە ئەم جۆرە نامانە لە کۆڕوکۆمەڵدا ناخوێندرێنەوە.لە چوڵەوانی و تەنیایدا دەخوێنرێتەوە وچەند جارێك دەخوێنرێتەوە. وتا ماوەیەکی زۆر دەپارێزرێت.وتم خۆتێهە ڵقورتێنەری گەڕەك . دەزانی کەمن لەگەڵ ئێوەدا. لەگەڵ تۆ ، فروغ و شاپور کوڕی گەڕەکین . لە چوار ڕییانی گومرگی ئەمیرییە. تەنیشت بەنزیخانە. قەیسەرییەکیکۆن هەیە . ئێمە لەوی دەژیاین. هێشتا پوورەکانم لەوێ دەژین. بەرامبەرقەیسەرییەکە کەمێ لەولاترەوە، کۆڵانی "خادم ئازاد"ە. هێشتا هەربەو ناوەوە ماوە. لە چوار ڕییانی گومرگ بەشی باشوری خۆرهەلاتی, قوتابخانەی کچانەی "سروش" ی لێ بوو . فروغ لە و قوتابخانەیە دەیخوێند. سالأنێك دواتر خوشکەکانی منیش لەو قوتابخانەیە دەیانخوێند. ئێمە مناڵبووین لە هیچ حاڵی نەدەبووین ، دواتر دایکم دەیووت "ئێمە هەندێ جار لە کاتی هاتن و رۆیشتن لە پیادەرەودا کچێکمان بە سەرو قژێکی درێژ و پەخشانەوە دەبینی کە دەیانووت شیعر دەنووسێ .رەنگە منیش لەگەڵ کوڕە پوورەکانما کاتێك لە جۆگەلەی ئاو دا یاریم دەکرد ئەوم بینیبێ . فروغ لە نامەکانیدا ناوی ئەو شوێنانە دەبا کەمن لەو شوێنانەدا ژیاوم و هەناسەم تیا داوە . وەك کۆڵانی کۆمەیلی, شەقامی سلێمانخانی. کەش و هەوای شیعرەکانی فروغ دەناسمەوە و هەستم پێکردووە من لە ساڵی (1966) بووم بە ئەندامی دەستەی نووسەرانی "تەوفیق" لەوێ لەگەڵ مرۆڤێکی گەورە ئاشنایەتیم پەیدا کرد لەگەڵ پەروێزی شاپور .بەلأم نەمدەزانی چیی فروغە. شاپور راوبۆچوونمی دەربارەی فروغ پرسی و منیش راستگۆییانە پێم وت.





ئەویش زۆری پێی خۆش بوو. دواتر بۆ چوونمی دەربارەی (شاملۆ) پرسی وتم کە ئەو ناناسم ! شاپور لە چاوپێکەوتنی دواتردا ، کتێبی "هەوای تازە "ی بۆ هێنام کە من بە یەك شەو خوێندمەوە و ئەوسا تێگەیشتم "شاملۆ" کێ یە. هێشتاکە ئەو کتێبەم هەیە . شاملۆ چەند جارێکیش بۆ بینینی شاپور هاتە نووسینگەی "تەوفیق" لە شەقامی ئەستانبول .زستانی هەمان ساڵ کاتێ فروغ کۆچی دوایی کرد ، شاپور مانگێك دیار نەما . هەقیشی بوو . هەوا ڵنێران وەکو و مێروو و کوللە لە هەموو لایەکەوە هێرشیان هێنابوو . تەنانەت شاپور لە ڕێ و رەسمی بە خاك سپاردنی فروغیشدا ئامادەنەبوو . رۆژێکیان شاپور هات بۆ ماڵمان لە "جەوادیە" پێکەوە سواری پاسی دوو نهۆمی بووین و چووینە نهۆمی دووەم و لەڕێزی پێشەوە دانیشتین تا سەیری دیمەنەکانیش بکەین. پاسەکە لە شەقامی ئەمیرییەوە دەهاتە خوارەوە .کە گەیشتینە چوار ڕبیانی گومرگ . ، شاپور پێشنیاری کرددا بەزین . پیاسەیەك بەوگەڕەکە کۆنەدا بکەین. ئەو رۆژە شاپور و من کۆلأن بە کۆلأنی نێوان گومرگی ئەمیرییەو چوار ڕییانی موختاری گەڕاین . کۆلأنی توتنچی ، کۆلأنی کومەیلی و شوێنانی دیکە. شاپور پەنجەرەی ماڵێکی نیشاندام . وتی فروغ هەمیشە دەهات و لە پشت ئەو پەنچەرەیەوە دەوەستا و منیش لەو کۆلأنەوە هات و چۆم دەکرد. دەرگای ماڵێکی نیشاندام و وتی لەو ماڵە دا لەگەڵێ ئاشنابووم .ماڵێکی تری نیشاندا م و وتی لێرە خواز بێنیم لێکرد.

کامی گیان ، من سی و سێ ساڵ هاوڕێی باوکت بووم ، بەلأم بە پێچەوانەی زۆر کەس هیچ کاتێ دەربارەی فروغ پرسیارم لێ نەکرد

بەلاّم ئەو خۆ ی هەندیٚ شەو قسەو باسیٚکی دەکرد و تەنانەت لە یادی ئەوەوە هەنگاوانیٚکی هەلْدەگرت . فروغ بۆ شاپور هەمیشە زیندوو بوو . هیٚشتا دەنگی شاپور لە گویٚمدایە "سەلاحی گیان !چەند نمرە دەدەی بە فروغ و چەندیش دەدەی بەمن . شاپور فروغی زۆر خۆشدەویست ، فروغیش زۆر بەگەرمییەوە عاشقی شاپور بوو. فروغ لەو نامانەی کە لەدوای جیابوونەوە لە شاپور ، بۆ ئەوی نووسیووە عاشقترە لە هەمیشە .

کامی گیان دەزانم کە ئەم نامانەت نەخویٚندوٚتەوە ، یانی د لْت نەهاتووە بیانخویٚنیتەوە ، هەر بەو شیٚوەیەی کەدلْت نایێ ویٚنەکانی ڕۆژانی دوایی تەمەنی باوکت ببینی . من لە دوای فروغ و پەرویٚز ، سیٚ یەمین کەسیٚکم کە نامەکان دەخویٚنمەوە و دووەمین کەسیٚکم کە نامەکانم نووسیوەتەوە!هەمان خۆتیٚهە لْقورتیٚنەری گەڕەك . شاپور چ کاریٚکی چاکی کردووە کە ئەم نامانەی پاراستووە ، تۆش چ کاریٚکی باشت کردووە کە ئەوانەت لە ئافاتی رۆژگار پاراستووە . ئەم نامانە ئیتر نەهی شاپورەو نەهی تۆ .ئەم نامانە میراتی ئەدەبیی ئەم سەرزەمینەیە .یادگاری ژنیٚکە کە بۆ یەکەم جار بە دەنگی خۆی هاواری کردووە .فروغ هەر بەو شیٚوە یەی کە قسەی کردووە ، نامەکانی نووسیووە .بە هەمان سادەیی و روونی و را ستگۆیی .چ پەخشانیٚك ، چ کەشیٚکی شاعیرانە و چ عەشقیٚك . لە نیٚوان ووشە و دیٚڕەکاندا هەناسەی فروغ دەبیستریٚ .

کامی گیان مەخابن کەجادەکە یەك سایدییە ، یانی نامەکانی پەرویٚز بۆ فروغ لە بەردەستدا نیە .نازانم ئەو نامانە لە کویٚ یە و لەلای کیٚیە .رەنگیشە لە ناوچووبیٚت .فروغ ئەوانەی لە ناوبردووە





یان بە کەسیٚکی سپاردووە .نازانم . جگە لەو یەك دوو یادداشتە کورتەی کە پەرویٚز لە پەراویٚزی نامەکانی فروغدا نووسیوویەتی شتیٚکی دیکەی لە بەر دەستدا نیە.لە نامەکانی فروغەوە دەکریٚ بزانین کە پەرویٚز چی نووسیووە . من لام وایە ئیٚستا کاتی خۆیەتی کە ئەم نامانە بلاّوببنەوە .ئیٚستا نە فروغ ماوە و نە شاپور ، نە دایك و باوکی فروغ ، نە دایك و باوکی شاپور .ئیتر هیچ کەس لە رووی هیچ کەسد ا دا نامیٚنیٚ !زۆر هەولْمدا کە میٚژووی نووسینی نامەکان پەیدا بکەم.هەندیٚك لە نامەکان رۆژی نووسینیان لە سەر نییە. هەندیٚکیان هەیە، هەندیٚکیشیان رۆژ و مانگیشیان دیارە ، بەلاّم سالْیان لە سەر نیە . من هەولْم دا لە ناوەرۆکی نامەکانەوە و بەسەرهات و ژیانی فروغەوە ئەو ریز بەندییە زەمانییە بدۆزمەوە. نازانم تاچ رادەیەك سەرکەوتووم .دیسانەوەش ئەگەری جیٚ گۆڕکیٚی نامەکان هەیە . نامەکان بە قەلْەمی جیاجیاو لە سەر کاغەزیجیاجیا نوسراون . هەندیٚ لە وشەکان ناخویٚندریٚتەوە .من ناچار بووم زەرەبینیٚکی قەبە ئامادە بکەم و بە دوور و نزیك خستەنەوەی ئەو وشانە بخوٚیٚنمەوە کە روون نەبوون .هەندیٚ لەوشەکانیش بە تەواوی سڕڕابوونەوە کەمن لە دارشتنی رستەکە وە ئەو وشانەم دوٚزیوەتەوە ، یەکیٚ لە نامەکانیش سەرەتاکەی بزرببوو کە من چیتر نە مدەتوانی هەر لە خۆمەوە بینوسمەوە .فروغ لە نامەکانیدا خالْبەندی نەکردووە و لەجیٚی خالْ لە نیٚوان وشەکاندا بۆ شایی جیٚ هیٚلاّوە .منیش لە دووبارە نووسینەوەی نامەکاندا رەوش و شیٚوازی ئەوم ڕەچاو کردووە .ئەو بیٚ وچان قسەی کردووە .خالْ دانان کاری خودی فروغە . من تەنانەت خالْەکانشیم ژماردووە !نامەکانم کردووە بەسیٚ بە

شەوە"بەر لە پێك گەیشتن, کاتی پێکەوە بوون ، دوای جیابوونەوە.
ناوی کتێبەکەش دێڕێکە لە نامەیەکی فروغ ""یەکەمین ترپە عاشقانەییەکانی دڵم

"کامی گیان لێرەدا دەمەوێ بیرو بۆ چونێکم دەربڕم .نازانم تاچ ڕا دەیەك ڕاستە. لە کۆنەوە لە ئەدەبیاتی عارفانەی ئێمەدا مشتومڕ, لەنێو عیشق و عەقڵدا هەبووە .وا دێتە پێش چاو ئەم مشتومرە لە نامەکانی فروغ و پەروێزیشدا هەبێ . فروغ زیاتر سەربە هەست و پەروێز زیاتر سەر بە بیر بوو .هەست بەرەو شیعر ڕۆیشتووە و بیر بەرەو تەنز . هەندێ جار ئەم دووانە لە پاڵ یەکدیدا دانیشتوون و کاریان لەیەکدی کردووە .لە لایەکەوە تەنز چۆتە ناو هەندێ لە شیعرە گەشاوەکانی فروغەوە و، لە لایەکی دیکەوە شیعر چۆتە ناو هەندێ لە باشترین وشەکاریکاتێرەکانی شاپورەوە. هەست و بیر، بە و هەموو دژایەتییەی کە لەگەڵ یەکدا هەیانە . هەندێ جار تەواوکەری یەکدین .

کامی گیان تۆ دەرەنجامی کۆی ئەم دووانەی. لە خۆڕڕا نیە کاتێ شاملۆ شیعری تۆی لە "خوشە" چاپکرد ، نووسی کامیار شیعری لە دایکیەوە و تەنزیشی لە باوکیەوە بۆ ماوەتەوە .هەڵبەت ئێستا نازانم تەنز و شیعر لە ناخی تۆدا تەبابوون ، یان کەوتوونەتە سەرو گوێلاکی یەکدی .باچاوێ بە نامەکاندا بگێڕین. لە نامەیەکدا پەروێز نیشانەی هێمایەکی بۆ فروغ کێشاوە ، فروغ نووسیویەتی"





" پەروێزم لە کۆتایی نامەکەتدا ، وێنەیەکت کێشابوو ، کە من هەرچی بیرم کردەوە سەرم لێی دەرنەچوو . پێم نالێیت ئەوە چییە .

ق ت
ش
پ

بە خوا من لەم شتانە تێ ناگەم ، وەکو هاوکێشەیەك وایە بەلامەوە ، بەلام لێکدانەوەی ئیشی حەزرەتی.....ە.پ،ش کە دەزانم یانی پەروێز شاپور ، بەلام سەرم لەو دوانەی سەرەوە دەرنەکرد . ڕاستییەکەی بڵێ ،ق .ت یانی چی و مەبەستت چی یە . ئیتر نیشانەیەکی لێکدان ( × ) یشت لەنێوانی یەکێ لە لاپەڕەکاندا کێشابوو . لەوەش هیچ شتێ تێ نەگەیشتم ، پێ دەچێ خەت و نیشانت بۆ من کێشا بێت ،وانیە؟"

کامی گیان دەبینی ، بابە ئەو کاتەش ئەو ڕۆحە تەنزاوییەی تێدا بوو .هاوکات وەك هەمیشە شەرمن بوو . ڕووی نەهاتووە بە فروغ بڵێ (بە قوربانت بم ) و نووسیویەتی (ق ت) دەشێ ڕازی نەبوونی خێزانەکان بۆ بە یەك گەیشتنی ئەو دووانە وایکردووە پەروێز بە جۆرێ بنوسێ کە ئەگەر نامەکە کەوتە بەردەستی نامە حرەم ، سەری لێدەرنەکات .

بە وتەی حافز "من ا ین حروف نوشتم چنان کە غیر ندانست توهم ز روی کرامت چنان بخوان کە تو دانی

واتە " من ئەم و شانەم وا نووسی کە کەسانی دیکە نایزانن تۆش لە ڕووی کەرەمەوە وا بیخوێنەرەوە کە دەیزانی .

له ئەنجامدا فروغ پەی بە و هێمایە دەبات و له نامەیەکی تریدا دەنووسیَ"_ پەروێزی من ، سەرم لەو مەتەلە دەرکرد و تیَ گەیشتم

ماناى (ق_ت) چی یه . ئێستا که تۆ نه تووت منیش لەرقی تۆ بەکاری ده هێنم . هەقی نارەزایشت نییە ، خوا حافیز پەروێزی خۆشەویستم

قـ ـ ت

ف

ف

پەیوەند کردنی شیعر و تەنز لە نامەکاندا دەبینین . فروغ ئەم دێرەی بۆ پەروێز نووسیووە که نازانم هی کیَ یە "

**تو در دل منی و من این قدر از تو دور**

**یارب چه قدر فاصله بین من و دل است**

**تۆ له دڵی مندایت و من ئەوەندە لە تۆ دوورم**

**خوایە ماوەی نێوانی من و دڵ چەندە زۆرە**

فروغ لە هەمان نامەدا نووسیوویە "

**"پەروێز ی ئازیزم ، دەزانی بۆچی هێندە تۆم خۆشدەویَ ، لەبەر ئەوەی تۆ هیچ کاتیَ لەبەردەم پرسیارەکانمدا دانامێنی و من هەرچی یەك بڵێم، تۆ ئەو توانایەت هەیە بە جۆریَ وەڵامم بدەیتەوە ، کە بیَ دەنگم بکات. باوەڕبکە لە بەرامبەر تۆدا زۆر کە فتەکار بووم . تۆ زۆر شەیتانی و دەمەویَ بڵێم کە لە وەڵامدا دانامێنی و دەستی هەمووانت لە دواوە شەتەکداوە ."**

ئەمە نیشاندەری گیانی تەنزئامێزی شاپوورە ، کەشەیتانی و قۆ شمەیی لە پشت شەرم و ئابڕووی ئەوەوەیە . لە هەمان کاتدا





فروغیش که قوتابی بووه ، و مابووەوە ، کچێکی شەیتان بووە و داوای لە شاپور کردووە کە دوعای بۆ بکات "_

**" پەروێز ، دوو سیَ رۆژی تر تاقیکردنەوەکانمان دەست پیَ دەکات ، تۆش کە دەزانی من دووپات کردنەوەم هەیە . دوعابکە کە دەربچم .دڵنیام ئەگەر تۆ دوعا بکەی ئەوە دەردەچم . سەیرکە هەموو شەویَ کاتیَ دەتەویَ بخەوی بڵیَ "**

**ئەی خوای گەورە من بە فروغ و فروغ بە من و دیسانەوە نمرەکەی فروغ لە تاقیکردنەوەی کیمیادا بە 20 یان(18) یان(16) بگەیەنە و سەرەنجام بەحەوتیش رازیم .**

کامی گیان بیرمە من خۆم کە خوێندکاربووم کەمترین نمرەم لەوانەی کیمیادا وەردەگرت ! سیَ ساڵیش لە قۆناغی ئامادەییدا دەرنەچووم . نازانم فروغ لە تاقیکردنەوەی کیمیادا چەندی هێناوە.

بەڵام دەزانم کە لە شیعردا نمرەکەی بیستە . ئێستا ئەگەر من سەیری نامەکانی فروغ بکەم ، ئاساییە بەڵام ئەو کاتە فروغ نەیویستووە جگە لە خۆیی و پەروێز کەسێکی دی نامەکانیان بخوێنێتەوە . فروغ بۆ پەروێز دەنووسیَ "

***وەڵامی نامەکەم بە ناونیشانی ماڵی خۆماندا مەنێرە ،چونکە بەردەستی مناڵ و مەزن دەکەویَو دەیکەنەوە . لەسەر زەرفەکە بنووسە "شەقامی سلێمان خان , کۆڵانی مەزا هیری ، نووسینگەی رۆژنامەی "سیروس ما" وە لەسەر زەرفەکەش نیشانەی (×) دابنیَ ، دڵنیابە راستەوخۆ بە دەستی خۆم دەگات ، چونکە زەرفەکانی نووسینگەی گۆڤارەکە دێنن بۆ ماڵی ئێمە و کەسێکیش نایانکاتەوە و من بەئاسانی دەتوانم کاغەزی تۆ وەربگرم.**

وه ئەم" سیروس"ە , هەمان سیروس ی  به همەن _ە، مێردی پورانی خوشکی فروغ و خاوەن ئیمتیاز و بە ڕێوەبەری گۆڤاری (ئاسیای جوان) ە . پەیوەندیی نێوان فروغ و پوران زۆر باش بووە . پوران مەحرەمی نهێنی یەکانی فروغ بووە ، وهەمیشە یارمەتی ئەوی داوە .

فروغ لە ماڵەوە خەڵوەتنشین و نائاسوودەیە . بەچ زەحمەتێك نامە بۆ پەروێز دەنووسێ و گوێی  لە چ سەرزنەشتکردنێك دەبێ . فروغ  و پەروێز خزمی یەكدین ، بەلاّم فروغ بۆی نییە بچێ بۆ ماڵی شاپور و پێ بنێتە دەرەوەی ماڵە کەیان . تەنها ئامرازی پەیوەندیی نێوان ئەو دووانە نامەیە .جارێکیان لەکاتی نووسینی نامە دا چراکە لە ژوورەکەی فروغ دەبەن و فروغ دوای شەڕێکی درێژ خایەن پاشماوەی نامەکە بە تاریکی  دەنووسێ . فروغ عاشقی پەروێزە "

**"نیگایەکی میهرەبانانەی تۆ ، گوشینێکی دەستی تۆ ، ماچێکی تۆ بەسە تا من هەست بکەم هیچ شتێکم کەم نەبێ .**

**من بە و کەسانە پێ دەکەنم کە خۆ شبەختی لە نێوان پارەو ئەسکەناس و ژیانی ئەفسانەیی شکۆ داردا دە بیننەوە و دەیانەوێ منەتی سەروەت و سامان و داراییان بە سەرما بکەن "**

فروغ لە میهر و خۆشەویستی خێزان بێ بەشە وە پەنای بۆ باوەشی پەروێز هێناوە

**" "پەروێز نازانی چەندە خۆشم دەوێی ، چەندە خۆ شم دەوێی . پەروێز کەی ئەو ڕۆژە دێ کە دووجاران تۆ لە باوەش بگرم ، پێم بڵێ کەی دێ ، ڕۆژی شادمانی من کەی دێ ، پەروێز ی ئازیزم " .**





ئەم نامانە  ,نامەنین ، شۆر و شەیدایی و شیعرن _ فروغ _ئەو کچە گەنجە, تینووی میهرەبانییە "

**"تۆ ناتوانی بیهێنیتە بەرچاوت کە من چەندە و تا چ ئەندازەیەك پێویستیم بە موحیبەتی تۆ هەیە . من لە ژیانی خێزانیمدا هیچ کاتێ خۆ شبەخت نەبووم و هیچ کاتێ دەرفەتی هاونشینیەکی ڕاستەقینەم پێ نە دراوە .**

فروغ لە بوونی پەروێز دا بۆ ئەم موحیبەتە دەگەڕێ "

کچێکی گەنج ، ئەویش ئەوکچەی کە هیچ کاتێ پابەندی خۆ جوانکردن و خۆش رابواردن و ئالْ و والأنیە و کاتێ لە لایەنی خێزانەوە ، لەلایەنی باوك، دایك، خوشك و براوە میهرو موحیبەتێکی نەدی . کاتێ لە نێو ئەوانە دا کەسێ نەبوو تا بتوانێ ڕوداوێ لە بیرو هەست و خۆزگەکانی گیان و د ڵی ئەو دا جێ بهێڵێ .

بێ گومان کاتێ کەسێکی دۆزییەوە کە هەموو ئاواتەکانی خۆی لە بوونی ئەودا بەرەنگدانەوەیی و بەرجەستە کراوی بینی یەوە بەیەکجاری هەموو موحیبەت و هەموو پەیوەندییەکی خۆی دەخاتە بەر پێی ئەو, وە لەرێی عیشق و موحیبەتی ئەوەوە بۆ موحیبەتەکانی تر دەگەڕێ  . ئەو موحیبەتانەی کە لێ یان بێ بەش بووە . واتە موحیبەتی دایك ، میهری باوك ، عیشقی براو پەیوەندی خوشك ....".

فروغ وەك ئاماژەی پێ درا لەگەڵ پورانی خوشکیدا پەیوەندییەکی تری هەیە "

**" من تەنها لە ناو ئەندامانی خێزانە کەی خۆماندا خوشکەکەم**

**دەپەرستم. لە بەر ئەوەی ئەو هەمیشە و لەهەموو حاڵێكدا بۆ من پشت و پشتیوان و خۆبەختكەربووە . جگە لە خوشكم هیچ كامێكیان ئەركی سەرشانی خۆیان نازانن . "**

فروغ لە موحیببەتی پەروێز دا ، بۆ موحیببەتی دایك ، باوك ، خوشك و براكەی دەگەڕێ و داوا لە خۆشەویستەكەی دەكات وەك باوك رێنماو وەك دایك نهێن ی پارێزو وەك خوشك دڵپێدەرەوەی ئەو بێ .

وە ئێستا بە سەرهاتێكی خۆش . جارێكیان پەروێز خۆی قاو داوە ! ناوی لەسەر زەرفەكە نوسیووە خۆ.ئەگەر ناوەكەشی نەنووسیبایە هەردیار بوو . دەست و خەتی شاپور لە دورەوە هاواری دەكرد كە خەتی شاپورە . فروغ تەنانەت لە پشتی زەرفی ئەو نامانەی كە بڕیارە پەروێز بۆ فروغی بنوسێ ، دەنووسێ و بۆی دەنێرێ "

فروغ ناوی پەروێز شاپور دەكات بە (جەواد شەریعەتی )! بۆ ئەوەی شاپور ڕۆڵی جەواد نەگێڕێ ،دەنووسێ "

**" بەلام لە بیرت نەچێ كە ئەم ناوە خوازراوە تەنها هی زەرفە كە یە نەك نامەكەی. وەتۆ ئیتر هیچ پێوستت نیە لە ژێر نامەكەتدا ناوی خوازراو دابنێی " !**

فروغ دەیەوێ كە نامەكەی بە پۆستی تایبەت بنێری، یان بەهۆی "دایەرەی تەرەقی" یەوە بە سیروس ـ ی بگەیەنێ و نامەكەی ئەوییش لە سیروس وەربگرێت .

كامی گیان نامە نووسینی فروغ فەروخزادو جەواد شەریعەتی ببورە پەروێزی شاپور! هەروا درێژەی هەیە. تەنانەت لە كاتی





زەواجدا ، ئەوكاتەی كە فروغ لەگەڵ تۆ لە ئەهوازەوە هاتۆتەوە بۆ تاران و پەروێز لە ئەهواز ماوەتەوە .ئەم نامانە, نامەی تامەزرۆیی و چاوەڕوانی و هەندێ جاریش دوو دڵییە .

كامی گیان لە نامەكانی ئەم قۆناغەدا تۆ ش بوونت هەیە و هەندێ جار شەیتانێتی دەكەی ,

فروغ بۆ پەروێزی نووسیووە " ـ

**" كامی هەر لە بەیانییەوە تاكو شەو . هەمووان بە شەیتانیەتی و گاڵتە جاڕی سەرقاڵ دەكا و منیش لەژوورەكەی سەرەوە یا بۆ خۆم كتێب دەخوێنمەوە یا شتێ دەنووسم وە یا ئەوەی كە سەرێ لە دایكت دەدەم " .**

لەم قۆناغەدا فروغ لەگەڵ تۆدا لە ماڵێ دایكیدا دەژی . پەروێز لە ئەهوازە ولە فەرمانگەی دارایی. چاپی یەكەمی كتێی " ئەسیر" بلاو بووەتەوەو هەراو زەنایەكی ناوەتەوە . هەمووان دەوری فروغیان گرتووە ، بەلام ئەو تەنها بیر لە پەروێز دەكاتەوەو لە ئامادەبوون لە كۆڕوكۆمەڵ خۆی دور دەگرێ . شیعرەكانی بۆ گۆڤارەكان دەنێرێت كە یەك لە سەریەك چاپ دەكرێن و بلاو دەكرێنەوە .

فروغ لە نامەیەكدا بۆ پەروێز دەنووسێ " ـ

**" كاتێ دەبینم دەتوانم سەرچاوەی بەرهەمێ بم و بوونیكی لە كاركەوتوو وبێ سوود م نیە و كاتێ هەست دەكەم كە لە ژیاندا هۆگری و پەیوەندییەكی بە هێزم بە شتێكەوە هەیە ئەوكاتە رازی دەبم لە ژیان " .**

ئالە و كاتەوە شیعری فروغ دەبێتە ڕەقیبی پەروێز . فروغ لە نامەیەكدا دەنووسێ "

" من دەزانم کە شیعر و هونەر خۆشبەختیان بۆ نەهێنام .هەروەك چۆن بۆ هیچ کە سێکیان نەهێناوە بەڵام من هەمدیسانەوەش بەو پەڕی هێزمەوە لە سەری بەردەوام دەبم " .

لە نامەیەکی تردا کاتێ هەست بەناڕەحەتی پەروێز دەکات ، دەنووسێ " ــ

" پەرۆیز من لەکوێ و هونەر لەکوێ .من کەی هونەرمەند بووم و بانگەشەی هونەرمەندێتیم کردووە . من کەی باسی هونەرەکەی خۆمم کردووە . هونەرەکەی من تەنها جوێن دانە . مردوو شۆر ئەو هونەرە بەرێ کەبیەوێت من لە تۆ جیا بکاتەوە . من هونەرم بێ بوونی تۆ ناوێ ." لەگەڵ هەموو ئەمانەدا هونەر ئیشی خۆی دەکاو قسە و باس و خواز دەست پێ دەکات. پەروێز جارێك , توندو تیژی دەنوێنێ . بەڵام فروغ لەوەڵامید ا دەنوسێ "

" خۆشم دەوێی خۆشم دەوێی وەك منالێك کە بۆ باوەشی گەرمی دایکی زیاد لە هەرشتێکی تر پەیوەندی هەیە وە ئەگەر دایکی ئەو بەتووندی سزا بدات دیسانەوە پەنا هەر بۆ لای ئەو دەهێنێ ."

کامی گیان, کاتێ پەروێز لە ئەهوازە. فروغ لەسەر لە بەیانیەوە دەچێ بۆ ماڵێ خانم گیان " دایکی پەروێز " ئەو لەگەڵ "دۆخی" پورت زۆر بوونەتە هاوڕێ . لەو ماڵەدا " خەسرەویش " هەیە و "مەنووچەر ــیش " "براکانی پەرۆێز" ئاغا گیان ـ یش هەیە "باوکی پەروێز " .

خانم گیان, فروغ و دۆخی دەبات بۆ پیاسە و گەڕان . لە نزیك "ئاوی کەرەج " ئەو کاتە سەیرانگای خەڵکی تاران بوو . ئەولاکەی گۆڕە پانی ئەسپ سواری جەلالیە بوو کە ئێستا بۆ تە "پارکی لالە لە". سیانزە بەدەر" ئاوی کەرەج" سەیرو سەفایەکی هەبوو . هەندێك





یاری تەنافیان دەکرد ، هەندێك یاری "هەقلی مەقۆ " و هەندێك یاری ماست و خەیار ! چە ند جارێکیش من لەگەڵ باوکما چوو بووم بۆ گۆڕەپانی "جەلالیە" پێشبڕکێی ئەسپ سواریم دیبوو . ئەو رۆژانە تاران ، تاران بوو . "کافیەی شارەوانی "یش هەبوو کە ئێستا بۆتە "شانۆی شار " کافیەی شارەوانی ، شوێنێ بوو وەکو شاری یاری ئێستا . مەلەوانگەیەکی هەبوو و چەند بە لەمێك . ناسراو بوو بە "بوت کلاب ". سینەمای "هاوین"ە ی هەبوو پڕ بوو لە چراو ڕۆشنایی. دایکت لە نامەیەکدا بۆ باوکتی‌نووسیووە " ــ

" پەروێز گیانم, دوێنێ شەو کامی لەگەڵ کلۆر و فەرەیدوون و منالەکان چوو بوو ن بۆ کافەی شارەوانی و بەکورتی کاتێ هاتەوە زۆر خۆشحاڵ بوو, چونکە دەزانی کە کەرەستەی یاریکرد ن بۆ منالاًن لەوێ زۆرە . بەکورتی بڕیارم دا هەندێك جار ئەو لەگەڵ منالەکاندا بنێرم ، چونکە لە ماڵەوە کەس نیە لەگەلێ یاری بکات و کاتیکش دەچێ بۆ لای دایکت لەبری یاریکردن بە سەرو کەللەی یەکتردا دەدەن و ئەمەش باش نیە " .

کامی گیان ,تۆ لە زۆرێ لە نامەکانی فروغدا بوونت هەیە . فروغ لە نامەیەکدا نووسیوویە " ــ

" ئەمرۆ چوومەلای دایکت . لە بەیانیەوە هەموو منالەکان لەوێ بوون و جێگەی تۆ بەتاڵ " خراپ نەبوو دانیشتین و باسی هەموو شو ێینکمان کرد و بە کورتی میهرداد بەباشی ئەو پەروەردە دەکات "رای دەهێنێ " .

فروغ لە هەمان نامەدا باس لە پاسکیلێکی سێ تایەیی دەکا کە دەیەوێ بۆ تۆی بکڕێ . ئەو پاسکیلە سێ تایی‌یە کراوە بە پاسکیلی دوو تایەیی .. نازانم سەرەنجام ئەو پاسکیلە سێ تایەییەی بۆ کڕیویت یان نە ؟ چونکە ئەو کاتە پارەی پێ نەبووە بۆ کڕینی .فروغ

به ڕێكوپێكی شیعر دەنووسیّ و هەندیّ جار دەیبا و دەیخانە ناو سندوقی پۆستەی گۆڤاری " سپیدو سیاە" . من نوسینگەی ئەم گۆڤارەم دیبوو . لە كۆلاّتی " تەبەس" دا بوو .

سەرەتای شەقامی فیردەوسی لە لای مەیدانی ، تۆ پخانەوە .

فروغ 17ا سالەّیە. لە هەموو شوێنیّ باس باسی ئەوە .بانگێشتی دەكەن بۆ كۆڕو كۆمەڵی ئەدەبی . بەلاّم بەهۆی هەستەوەری شاپور ناچیّ 720تمەنی لەبری نووسینی كتێبەكەیی وەرگرتووە. كتێبی "وەیس ورامین "و" گوڵستانی سەعدی " كڕیوە .

فروغ وەكو پەپوولەیەكە كە قۆزاخەكەی شكاندووە و حەز دەكات بفڕیّ بەلاّم ناتوانیّ "

" تۆ نازانی من چەندە خۆشم دەویّی, بە پێچەوانەی ڕیّ و شوێن و ئاداب و داب و نەریّت و بە پێچەوانەی یاساو بیروباوە ڕی خەلّك رەفتاربكەم . بەلاّم كۆتێك لە پێمدا یە كە سنوردارم دەكات .گیانی من ، بوونی من و كارەكانم لە نێو چوار دیواری یاسایەكی سست و بیّ مانای كۆمەلاّیەتی گیریان خواردووە و من بە بەردەوامی بیردەكەمەوە كە بەهەر شێوەیەك بووە دەبیّ هەنگاو ێك سەرووتر لە ئاستی سادەییەكان هەلّبێنم من ئەم ژیانە تاقەت پڕ و كێن و پڕ لەكۆت و بە ندەم خۆشناویّ .

فروغ لە نامەیەكدا كە زۆر گرنگە دەنووسیّ " _

" من هەمیشە دۆستی ژیانێكی سەیرو پڕ لە كارەسات بووم . رەنگە پێكە نینت پیّ بیّ ئەگەر بلّێم من پێم خۆشە بە پیّ دەوری دنیا بكەمەوە ، من پێم خۆشە لە سەر شەقامەكاندا وەك منالاّن سەما بكەم و پێبكەنم و بقیژێنم. من پێم خۆشە كاریّ بكەم كە یاساشكێن بیّ . رەنگە بلّێی سروشتی مەیلە و





گوناحكردنم هەیە بەلاّم بەوجۆرە نیە. من لەوەی كە كارێكی سەیر بكەم ، چێژوەردەگرم ."

فروغ " شێتی ژیانێكی سەربەست و بیّ شەڕوهەرایە " پێی خۆشە ژیانێكی ئاوای لەگەلّ پەروێز دا هەبیّ . " ژیانێكی سەیرو پڕ لە كارەسات و پڕ لە هەلّچوو ن و خرۆشان " . بەلاّم پەروێز بەپێچەوانەی فروغەوە , لایەنگری ژیانێكی ئارامە. ئالێرەوە مشتو مڕی عیشق و ئاوەز دەست پیّ دەكات . مشتومڕی هەست و ئەندێشە.

" كامی گیان . فروغ رۆژبە رۆژ پەیوەندیی لەگەلّ تۆ زیاتر دەبیّ وە تۆ چیت كردووە ، ئێستاكە وەبیرت دیّ ؟

هەر كاتیّ لەگەلّ ئەودا بەشەڕ دێم دەڕوات لە سووچێكدا دا دەنیشیّ و وەك ماتەم گێڕان دەلاوێنێتەوە ئەی باوكە گیان لە كوێی, ئەی باوكە گیان وەرە وە. بە كورتی زۆر بە دەستیە وە پیّ دەكەنین. ئوتۆمبیلێكم بۆ كڕی بە ( 10 )) تمەن گەورەیەو لە پاص دەچیّ و فڕۆكە یەكیشی هەیە كەبە( 16 )قران بۆم كڕیوە و رۆژانە لەگەلّ میهرداد و میهران بە شمشیر بازی و تەڕەزان بازی بەسەر دەبات "

لە هەموو شوێنیّ باس باسی فروغە و كتێبی شیعری ئەو ,"شیفا" پێشەكییەكی بۆ دیوانەكەی نوسیووە ، بڕیاریشە كەسانی تریش دەربارەی دیوانەكەی وتار بنوسن "دەشتی ,عەلی ئەكبەر كەسمایی ، محەمەدی سەعیدی ، سەعید نەفیسی . سوبحی. رۆژی هەینی لە بەرنامەی منالاّندا باسی ئەم شاعیرە لاوەی كردووە . باوكی فروغ تووڕەیە و لەگەلّ دایكی فروغ بەشەڕ دیّ و دەلّیّ كە تۆ كچەكە

مانت به د ڕەفتار کردووە . سەعید نەفیسی له روسیا موحازەرەی دەربارەی ئەدەبیاتی جیهان داوه و ناوی فروغی هێناوه و ئەوی لەگەڵ کچه شاعیری رووسی" خوانا دیبار بودو " بەراوردکردووە . فروغ حەزدەکات بگات بەجێگەیەك که باوکی شانازی به بوونیەوه بکات . بەڵام قسه و باس و خوازو قسەی خراب و تۆمه تەکان هەروا درێژەیان هەیه. که دەبێته هۆکاری نانه وەی ناکۆکی خێزانی و سەرەنجام کاردەگاته جیابوونەوه. فروغ نایەوێ جیابێتەوه . بەڵام وەك بڵێی ئیتر چارەیەکی نیه .

فروغ دوای جیابوونەوەی له شاپور, دەیەوێ بچی ٚ بۆ ئیتالیا ، نەك بۆ پیاسه و گەڕان و رابوارد ن . به بیانووی خوێندن بۆ هەڵاتن له رووکەش و دووپات بوونەوه . له نامەیەکدا دەنووسی ٚ " _

**" ئەگەر نەگریامایه دەتاسام ، هیچ شتێ دادی تەنیایی گیانی من نادا . وەکو دەفرێکی بەتاڵ وام له زۆنگاوەکاندا به دوای گەوهەردا دەگەڕێم " .**

ئەو دوو به یته بەناوبانگەی فروغم بیر دەکەوێتەوه ".له جوگەیەکی بچووکا که دەڕژێته ناو چاڵاوێ ، هیچ راو چییەك مرواری ناخاته داوێ". زۆر له فەزا شیعرییەکانی فروغ دەتوانین له نامەکانیدا بدۆزینەوه.ئاماژەم به هەندێك لەوانه لەبەشی "زیادکراوەکان" دا کردووە. فروغ لەدوای جیابوونەوه هەروا پشتی به شاپور قایمه و هەروا عاشقی ئەوه شاپوریش لەساته قەیراناوییەکاندا یارمەتی فروغ دەداو هەروا نیگەرانی ئەوه

**" " کاتێ دەڕوانمه چاوەکانی کامی دەمەوێ هاوار بکەم کاتێ به هۆی بوونی ئەوەوه بیر لەو ئەوینه دەکەمەوه که جەستەی ئێمەی بەیەك گەیاند, حەسرەتێکی سوتێنەر د ڵم لیێوان لیێو دەکات. پەروێز, من نامەوێ بیر لەتۆ**





**بکەمەوه. من بۆ ئەوەی که تۆم بیر بچێتەوه خۆمم له ناوبرد. بەڵام تۆ ڕۆژ بە ڕۆژ بۆ من زیندووترو به ماناتر دەبی و من تۆ لەکامی دا دەبینمەوه وەتا چاوەکانی من بەرووی ئەودا دەکرێنەوه یادی تۆش ئازارم دەدا. پەروێز گیان..**

**لەم رۆژانەی کەهیچ کەسێ له بیری مندا نیه وه هیچ کەس ناتوانێ درك به هەڵچوون و دا چوونی رۆحی من بکات . تەنها تۆیت که دەمخەیتە گریان. له بەر ئەوه هەست دەکەم که چاوەکانی تۆ له دوری چەند فرسەخەوه ,نیگەرانی منه .**

" فروغ لیێوان لیێوە لەهەقناسی و عاشقی گەورەیی شاپورە "

**" من خۆشم دەوێی نەك لەبەر ئەوەی که یارمەتیم دەدەی نەك لەبەر ئەوەی که ئاگات لیێمه نەك لەبەر ئەوەی که پارەم دەدەیتێ. ٚ نه .. پەروێز , لەبەر ئەوەی زانیم چاکیت و هیچ کەسێ ناتوانێ مەزنیی رۆحی نۆی هەبێت "**

فروغ لەو نامانەی که لەدەرەوەی وڵات بۆ شاپوری دەنووسێ هێشتاش ئەوی خۆشدەوێ و له حەسرەتی ئەودایه "

**" ئەمویست جارێکی تر تۆم ماچ بکردایه و جارێکی تر چاوه میهرەبان و دڵنەواییەکەتم سەیر بکردایه . پەروێز بوونی تۆ دیسانەوه ژیانی منی روناککردۆتەوه. هەست دەکەم که هیوا بوون به دۆستا یەتی تۆ هێز و گەرماییەکی تازه له منا دێنێته گۆڕێ . "**

فروغ هێشتا خۆی بەو کچه شانزه ساڵه یه دەزانی که" له خەرمانەیەك له شەرم و حەیای کچێنییەوه " بەرەو رووی ئەو هاتووەو یەکەمین ماچەکانی رشتۆته سەر رووی لیێوەکانی ئەو " _

**" راسته که من چیتر ژنی تۆنیم به لاٚم تۆ دەزانی و خواش دەزانێ که دیسانەوەش هی تۆم و سەرا پای بوونم هی تۆیه " .**

فروغ دڵشكاوە. تووڕە یە لە خەڵكی ، لە كۆمەڵ " بەڵام پەروێز ژیان زۆر پووچە بە وتەی هیدایەت " هەموو مرۆڤەكان هاوشێوەی یەكترن بە غەریزە و پێداویستی گەمارۆ دراو لە چوارچێوەیەكی پیس و چڵكندا " من ناتوانم بەرگەی ناشیرینیەكان بگرم. گیانم وەك باڵندەیەكی دیلكراو بێ تاقەتە . من دنیای جوان و روناكم خۆش و یستووە و ئێستا بە چاوی كراوەوە پیسێتی و رەشایی دەوروبەری ژیانم و كۆمەڵ لە یەكتر جیا دەكەمەوە ، دەتوانم پەنا بۆ كوێ بێنم .

فروغ بێ ئەوەی پەروێز ببینێ دەچێ بۆ ئیتالیا . دەچێ خۆی وون بكات لە كاتێكدا كە چاوەكانی نیگەرانی پەروێز و كامی یە و لەوە دەترسێ كە ئیتر هیچ كاتێ نەتوانێ ئەوان ببینێتەوە . فروغ كاتێ عاشقی پەروێز بوو, شانزە ساڵان بوو وەكاتێ لەو جیابۆوە بیست ویەك ساڵان بوو . لە نامەیەكدا دەنووسێ "

**" من بە 21ساڵ ژیان ,هێندەی ژنانی 60 یا 70 ساڵە پیر بووم "**

وە لە نامەیەكی تردا " _

**" تەنها گوناهم ئەوەیە كە زۆر زوو چوومە ناو ژیانی كۆمەڵایەتی, یانی كاتێ كە كچانی تر لە ماڵەوە یاری ماڵە باجێنە دەكەن ؟..."**

لەم نووسینەی فروغدا راستییەك شار دراوەتەوە . ژنێك كەلە27 ساڵیدا دەقێكی ئاوا درەخشانی هەیە و لە 17ساڵیدا بە دیوانێكی شیعرەكانی هەراوزەنایەكی ناوەتەوە، بە شەوێك رێگەیەكی سەدساڵە رۆیشتووە. ئەو لە (21) ساڵە ییدا بە ئەندازەی ئادەمیزادێكی شەست هەفتا ساڵە ئەزموونی ژیان و هونەری هەبووە . فروغ لە دوایین نامەیدا كە لە تارانەوە بۆ پەروێزی ناردووە بۆ ئەهواز شیعری "گەڕانەوە" ی بەخەتی خۆی نووسیووە و پێشكەشی ئەوی كردووە .





فروغ كاتێ كە لە شاپور جیا دەبێتەوە, زیاد لە هەمیشە ئەوی خۆشویستووە ودەستی لەو عیشقە تەنانەت كاتێ فروغ لە ئیتالیا بووە، هەڵنەگرتووە. فروغ لە نامەیەكدا لە ڕۆماوە بۆ پەروێز دەنووسێ "

**" حەز دەكەم ئەوەندە بچووك ببمەوە تا هێندەی باڵندە یەكم لێ دێ ئەوكاتە بدەم لە شەقەی باڵ و بێم بۆ لای تۆ " .**

فروغ نامەكانی لە رۆماوە بۆ ئەهواز ئەنێرێ . ئەو لەوەی ژیان لە دەرەوەی وڵات بێ گیان و مردووە و خەڵكی زۆر بێ هەستن گللەیی دەكاو دەنووسێ " _

**" لێرە عیشق یانی قەڵایەكی داگیركراو وە یان كتێبیكی خوێنراوە خرۆشان مانایەكی نیە و عیشق لە وپەڕی بێ مانایی دایە ...**

كامی گیان, فروغ دڵی لای پەروێز و تۆ بووە و بۆ باوكتی نووسیووە

**بەڵام پەروێز پێم خۆش بوو ئالێرەوە لە ئەهواز بوو مایە و شەو و رۆژ هەستم بەبوونی تۆ بكردایە لە پاڵ خۆمدا, وە كامیم بۆ پیاسە ببردایە.**

" كامی گیان ، فروغ دڵێ زۆر بۆ تۆ تەنگ دەبێ. رۆژێ لە پاسدا منداڵێك دەبینێ كە لە تۆ چووە, یەكسەر دڵێ پڕ دەبێ لە گریان. فروغ كاتێ تێ دەگا پەروێز هاتۆتەوە تاران وتۆ ئیتر تەنیا نیت، زۆر خۆشحاڵ دەبێ ، نامەیەك نیە كە تیایدا باسیكی تۆی تیا نەكرابێت .

كامی گیان. چ مۆسیقایەكی تیایە ئەم دەقە . لە راستیدا شیعرە "

**" بیر لە تۆ دەكەمەوە, لە تۆ لە قسەكانی تۆ, لە چاوانی تۆ لە پێكەنینەكانی تۆ لە گاڵتە جاڕییەكانی تۆ لەوپیاسەو گەڕانانەی كە لەگەڵ تۆدا دەرچووم, لەوساتانەی كە لەگەڵ تۆدا بەسەرم بردوون لەو**

شەوان و بەیانیان و نیوەشەوان و لە ماچەکان و لە فرمێسکەکان و لە شەڕەکان و زیزبوونەکان و لە ئاشت بوونەوەکان و لە ماڵەکەمان و لە کامی . ".

کامی گیان وەك ئەوەی منیش هاتبێتمە جۆش و خرۆش وەکو منالێکم لێ هاتبێ کە لە سینەما هاتبێتە دەرێ و هەموو فیلمە کە بۆ منالآنی تر بگێڕێتەوە . با شترە کە مێکیشی بۆ خوێنەر جێ بهێڵم. قورسترین کاری دونیا بۆ من نامە نووسین و پێشەکی نووسینە. ئێستا سەیر بکە کاتێ مرۆڤ گرفتاریکی وەك من بیەوێ ئەم دوو کارە لەیەك شوێندا ئەنجام بدات ، چی لێ دێ .

فروغ و پەروێز داوایان لێکردم کە ئەم نامەیە بۆ تۆ بنووسم و منیش نەمتوانی بێ دڵییان بکەم . بەوتەی پەروێز ، رووی مانگت ماچ دەکەم . لە منەوە سلاو بە خۆت بگەیەنە .

**هاوڕێت " عومران سەلاحی**
**تاران 22 ی ئابی 2003**





**فروغ لە دایکبووی 5 ی کانوونی دووەمی 1935**
**پەروێز لە دایکبووی 24 ی شوباتی 1924**
**نامەنووسینەکان لە ساڵێ 1950 وەدەستی پێکرد. لەم ساڵەدا ، فروغ 16 ساڵە بوو و پەروێز 27 ساڵە. ساڵێ 1955 یش کۆتایی نامە نووسینەکانە . لەم ساڵەدا فروغ 21 ساڵەیە و پەروێز 32 ساڵە. فروغ 15 ی شوباتی 1967 کۆچی دوایی کرد و پەروێز 4 ی ئابی 1999. فروغ 32 ساڵ ژیاو پەروێز 72 ساڵ کامیاریش لە دایکبووی " 18 ی حوزەیرانی 1952 " ە ، خۆتان حسابی کەن بزانن ئێستا چەند ساڵەیە .**

**پەرویز** ، بە دڵنیاییەوە چاوەڕێی وەڵامی نامەکەتی ، من وام دەزانی کە بەدیعە خان هەموو شتێکی پێگوتوویت و چیتر پێویستی بە دوو پاتکردنەوە یان نیە بەڵام لەلایەکی ترەوە ش بیری ئەوە لێم ناگەڕێ ئاسوودەبم، کەرەنگە تۆ هێشتا نەزانی من چ بڕیارێکم لە بەرامبەر ئەو داواکارییەی تۆدا داوە . من نامەکەی تۆم خوێندۆتەوە. راستە " کە چاوەڕێی ئەوەم لێ نەدەکردی بەڵام هەمدیسانەوە لەبەر خاتری تۆ، ئەوە قبوڵ دەکەم و ئەوانی تریشم رازیکردووە. لەو رووەوە خەیاڵت ئاسوودە بێ، تۆ بەتەلەفون پێت وتم کە دەبێ رۆژی لەبەر چاوگیراو هەینی بێت. زۆر باشە ئەگەر بڕیارت داوە کەواتە دەبێ زووتر بجووڵێی، چونکە تارۆژی هەینی پێنج رۆژ زیاتری نەماوە و ئێمە ناتوانین ئەو هەموو ئیش و کارە لە ماوەیەکی کورتدا بە ئەنجام بگەیەنین. ئەوە وەڵامی منە

**رازیم رازیم چاوەڕێی دەستپێشخەری تۆم .**

**خواحافیز / فروغ**



**پەرویزی خۆشەویستم**، دەزانی بۆچی ناچار بووم دووبارە ئەم نامەیەت بۆ بنوسم چونکە دوانیوەڕۆ یەك سەعاتی تەواو نەم هێشت دایکم بخەوێ. قسەم لەگەڵ کردو دەمەوێ بڵێم کە ئەنجامە کەی بە تەواوی دڵخۆشکەرەیە. ئەو نامەیە من بەیانییەکەی نووسیم وە ئەمەیان عەسر دەینوسم. وەپشت بەخوا سبەی بەیانی هەردووکیان دەخەمە پۆستەوە. بەڵام لە نێوان نامەی سەر لە بەیانی و عەسری مندا تا رادەیەك جیاوازی هەیە. لەبەر ئەوەی سەر لە بەیانی بێ هیوا بووم بەڵام ئێستا کە عەسرە بەتەواوی هیوادارم کە دەتوانم تۆم هەبێت.

پەروێزەکەم، من لەگەڵ دایکما سەبارەت بە تۆ زۆر قسەم کردو ئێستا دەمەوێ بڵێم کە دایکم تا ئەندازەیەك لەگەڵ من و تۆدا هاوبیروباوەڕە. هۆی دژایەتی تۆم لەگەڵ مەرجەکان و بڕی مارەیی بۆ شەرح کردو ئەوم  بە تەواوی ڕازی کردووە. تەنها شتێ کەماوە هەمان مەسەلەی سازدانیرێورەسمی مارە بڕینەکەیە. بێڵە بەوردی بۆتی حساب بکەم . تابزانی دەبێ چەند خەرج بکەی وە پێوستیت بەچەند پارە هەیە ، پەروێز. من دەمەوێ خۆم جلو بەرگی بوکێنییەکەم بدوورم. بەو بیانووەی کە بەرگدرووەکان. یەکەم ناتوانن بەو جۆرەی کە خۆم دەمەوێو دڵم پێوەیەتی. جلەکانم بۆ بدوورن و

ئیتر ئەو پارەیەی کە دەمانەوێ بیدەین بە بەرگدردووەکە لە راستیدا 100تا 200 تمەن دەکا دەیخەینە سندوقی پاشەکەوتەوە و یان دای دەنێین بۆ شتی زەروری تر  کە واتە نرخی جلوبەرگ لام وانیە 100تمەن زیاتر بکات .  200تا 250 تمەنیش خەرجی رێو ورەسمی مارەبڕینە کە  واتە میوە وشیرینی و لەو شتانە (هەڵبەت ئەگەر زۆر بێ, تۆ دەبێ ئاگادارم بکەیتەوە و من لێرەدا حەزی تۆ رەچاو دەکەم ) و ئیتر 100 تا250 تمەنیش خەرجی جیاجیاو ئەملاوئەولا , کەشتێ دێتەپێش کەواتە هەرهەمووی ئەو پەڕەکەی 500 تمەن کەمن هەمان رۆژی یەکەم بۆتم دیار یکرد وکە لانی کەم دەکاتە 400 تمەن. وەئێستا

پەروێزەکەم تۆ دەبێ ئەوبڕە پارەیە ئامادەبکەی.ئەگەریش ناتوانی پێم بڵێ تاکەمێك پیابچمەوە و شتە نازەروورییەکان بخەینە ئەولاوە تا تەواو بەحەزی تۆ بێت. بیروڕاتم لەمبارەیەوە بۆ بنووسە. لەراستیدا دەمەوێ بڵێم کە باوکم ئەمڕۆ یان سبەی بە دڵنیاییەوە دێتەوە. من ئەم مەسەلەیەم بەیانیەکەی نەدەزانی بەڵام دایکم پێی وتم .تۆ ئەو نامەیەی کە دەتەوێ بۆباوکمی بنووسی. بینووسە و بیدە بە خودی من و من لە کاتی خۆیدا دەیگەیەنم بەباوکم و هاوکات دایکیشم قەولی داوە کە لەگەڵ هاتنەوەی ئەودا قسەکەی تۆی بخاتەبەردەم و هەر چۆنێك بێت رازی بکات . دڵنیام کە رازییە بەڵام پەروێز, ناوەرۆکی نامەکەی تۆ دەبێ بە جورێك بێ کە تاڕادەیەك شێوەی ئیزن خواستن ( احترامات) بێ بۆ مارەبڕین. بۆ نموونە بنووسی لەبەر ئەوەی من لە رووی ماد ییەوە ئامادەییم هەیە و جگەلەوەش وەزعی دواییم پێ تەحەمووڵ ناکرێ. داواکارم رێم پێ بدەی کە زووتر ئەم کارە کۆتایی





پێ بێ وە ئەوەش بنووسە کە ئەگەر ئێستا من لە رووی تەمەنەوە هێشتا ئامادەنیم تۆ ئامادەیت کە ئەم تەگەرەیە لاببەیت و ئەمجا داوای کاتیش بکە, دەمەوێ بە جۆرێك بێ کە ئەو چیتر بواری رەخنەگرتنی نەبێ. لام وایە وەزعی ئێمە ئێستا ئیتر بە تەواوەتی روون بێت ئەمشەو دوعا دەکەم " دەپاڕێمەوە" و ئەوە ندە سەرکەوتنی تۆ لەم مەسەلەیەدا لەخوا  دەخوازم کە خوا دڵێ بە حاڵم بسووتێ و لەمە زیاتر لە چاوەڕوانیدا نە مهێڵێتەوە و تۆش دوعا بکە و بپاڕێوە, بە خوا زۆر باشە. من کە هەمیشە داوای کۆمەك و یارمەتی لە خوا د ەکەم. تۆش هەروابە. دەزانم کە سەر دەکەویت .

خوا حافیزت

فروغ

## پەروێز ی خۆشەویستم "

من نازانم چۆن داوای لێبوردن لە گوناهی خۆم بکەم. ئەمە خرا پترین کاریٚ بووە کە تاکو ئێستا کردبێتم " بەڵام خەتای منیش نیە. لە دوایین ساتێکدا کە دەمویست لەگەڵ دایکما بۆ لای تۆ بێین ، میوانمان هات وە ناچار بووین لەماڵەوە بمێنینەوە . من بەقەدەر دنیایەك داوای لێبوردنت لیٚ دەکەم ، دەزانم کە زۆر چاوەڕانیت کردووە . بم بەخشە ، هیوادارم بەر لێبوردنی تۆ بکەوم . ویستم هەندیٚ شتت پیٚ بڵێم کە پێویست بوو بەر لە چوونت بۆ چاوپێکەوتنی باوکم ، تۆ ئەوانەت گویٚ لیٚ بیٚ . بەڵام بەداخەوە نەکرا . ئەم کاغەزەم بە هۆی فەرەیدوونەوە نارد . ئەو پێت دەڵیٚ کە میوانەکانمان کیٚ بوون و بۆچی ئێمە نەمانتوانی بێین .

خوا حافیز

فروغ



## وەڵامی پەروێز ی شاپور لە پەراوێزی نامەکەدا "

تۆ بە کچێکی بەنرخ دەزانم بەڵام لە ڕاستیدا سەبارەت بە مێینە بۆ چوونێکی باشم نیە . ناتوانم باوەڕ بکەم کە لەلای ئێوەی مێینەوە هەقیقەتێك دەست بکەوێت وە ئەگەریش دەست بکەوێت دڵنیام زۆر دەگمەن و کەمە " چونکە ئەوەی ژیان فێری کردووم وە ئەوەی ئەزموون پێی سەلماندووم ، بە تەواوی بەڵگەی لەسەر ڕاستی و دروستی ئەم قسەیە هەیە. لەبەرئەوە تا ئەوکاتەی پێچەوانەی ئەم ڕاستییە دەسەلمێندریٚ. ئامادەنیم لە بیرو باوەڕی خۆم دەست هەڵبگرم . بۆ نموونە لە نێوان خۆشەویستییەکدا کە تۆ منی پیٚ دەدوێنی و من بە تۆی دەڵێم ، زۆر جیاوازی هەیە . یەکێکیان نزیك لە هەقیقەتەو ، ئەوی تریان دوور لە هەقیقەت . ئەوەیە ئایدیای من ولە مبارەیەوە پێویستە کە پێچەوانەی ئەوەم بە کردەوە پیٚ بسەلمێنی .

پەروێز شاپوور

شەوی دووشەممە ( 1950/6/1 )

شەو باش

## پەروێزی خۆشەویستم..........

من ئەم نامەیەت لە کاتێکدا بۆ دەنووسم کە دنیایەك خەم و ئازار فشار بۆ رۆحم دەهێنێ . من لە دوێنێ یەوە تاکو ئێستا فرمێسکم باراندووەو جگە لە گریان چارەیەکیشم نیە .

پەروێز.. ئەگەر بڵێم کەلە خێزانەکەی ئێمە خراپتر و بەد رەفتارتر, لە دنیادا نیە ، درۆم نەکردووە . ئەوانە تەنها لە کەمیندان تا هەل و مەرجێك بێتە پێش و، بتوانن نیازو مەرامی گلاوی خۆیان جێ بە جێبکەن ودووکەس لەیەك جیابکەنەوەو بکەونە نێوانیانەوە و بنەمای شادییەکان لێك هەڵوەشێنن من لەبەر ئەم رەفتارە ناشیرینانە هەمیشە بێزار و هەڵاتوو بووم وە دەمزانی کەسەرەنجام بەر گازی ژاراوی ئەوانە دەکەوین و ئەوانە دەبنە هۆی ئازاردانی من و تۆ .

پەروێز کە نەواب خان لەگەڵ منالەکانیا هاتن بۆ ماڵمان چەند شنێکیان دەربارەی تۆ و دایکت بە دایکم ووت. کە ئەویان بە تەواوی سەبارەت بە تۆ بەدبین کرد و منیان ناچارکرد کە تاکو ئێستا بگریم.

پەروێزەکەم.... من هەقم بە سەر راست و درۆ بوونی ئەو شتانەوە نیە ، تەنها بۆ ئەوە دەگریم کە ئەو قسانە بە جۆرێ کاریگەرییان لە دایکم کرد ، کە دوێنێ پێی وتم " " فروغ یان دەبێ دایکی پەروێز رازی بێ ، یان من تۆ نادەم بە ئەو" .





پەروێز ... ئەم قسەیە ئاگری تێ بەردام وە ویستم هاوار بکەم بەڵام تەنها گریام دەزانم کە زۆر بەدبەختم سەیرکە چ قسەیەکی سەیرم پێ دەڵێن ، پێم دەڵێن کە تۆ لە بیربەرمەوە ئەمە بۆ من نەگونجاوە.من تۆم بە دنیایەك ئومێد و ئارەزووەوە خۆشدەوێ . من تەنها بۆ ئەوە زیندووم کە لەگەڵ تۆ دا بژیم . تۆ بۆ من هاوتای گیان, ئازیز بوویت ، من تۆم لە ناخی دڵە وە خۆشدەوێ . کەواتە هەقمە بگریم . سەیرکە ئەوانە چ شتێکیان بە دایکم گوتووە کەدەرهەق بە تۆ هەیبوو یەکسەر بیروباوەڕی گۆڕی و ، ئەو قسانە دەکات .

پەروێزی خۆشەویستم . من تەنها توانیم بەشێك لەو داواکارییە بێژراوانە تێ بگەم وەئێستا ئەوەت بۆ دەنووسم " بە دایکمیان گوتووە کە دایکی تۆ لەگەڵ ئەم ژنهێنانەدا نیە. کاتێ کە زانیویەتی من و تۆ دەمانەوێ بۆ یەکتری ببین " بەوتەی " نەواب خان " لە سەر خۆی نەماوە و، نەفرەتی لێکردووی . گوایا تۆ کچێکت هەشت ساڵە خۆشدەوێ و ماوەیەك لەوەوبەر ئەویان بە شوو داوە وئێستا ئەو تەڵاقدراوە ولە چاوەڕوانی شووکردن بە تۆ دایە .

پەروێزەکەم . . . من ناتوانم رێ لە بارینی فرمێسکم بگرم ئەمانە جێی باوەڕنین یان ئەگەریش ڕاست بێ ، من پێم وانیە کەچیتر ئاسەوارێك لە عیشقی جاران لە دڵی تۆدا ، ما بێت . بەڵام پەروێز ئەگەر وانیە , تۆ دەتوانی لە پاڵ ئەودا خۆشبەخت بیت , من ئیدی قسەیەکم نیە و تۆ لە بیر دەبەمەوە بەڵام دڵنیابە کە ئەم لە بیر بردنەوەیە گیانی منی لە سەر دا دەنرێ . چونکە من کاتێ بمرم ئەوکاتە تۆ دەتوانی بە ڕاستی باوەڕبکەی کە ئیتر لە بیرم بردوویتەوە.

**من بیٚ تۆ تەنانەت ساتێکیش ناتوانم بژیم من ئێستا تۆم زیاتر لە هەمیشە خوشدەویٚ وە هەست دەکەم کە جگە لە تۆ ناتوانم هیچ کەسێکی ترم خۆشبویٚ .**

**پەروێزەکەم... من دەبیٚ تۆ ببینم و لەنزیکەوە لەهەموو شتیٚ ئاگاداربم، زووتر وەرە لای باوکم و, پیٚ داگرە لە سەر وەرگرتنی وەڵاٚم. من زۆر ئازار دەکێشم و دڵنیام ئەگەر دوو ڕۆژی تر یش ئاوا خەم بخۆم ئیتر جگە لە عیشقی تۆ هیچی تر لەبوونم نامێنێتەوە. من تەنها چاوەڕێی تۆم، هەوڵبدە هەر چۆنێك بووە ڕەزامەندی دایکت بەدەست بێنی. من متمانەی تەواوم بەباوکم هەیەو دەزانم کە بایەخ بەم مەسەلە بچووکانە نادات ، بەلاٚم تەنها دایکمە کە مەرجی زەواجی ئێمەی بەستۆتەوە  بەرەزامەندی دایکتەوە، وەتۆ دەتوانی بە مەنتیقی بە هێزی خۆت ئەویش ڕازی و بیٚ دەنگ بکەیت. پەروێز, من هەست دەکەم کە سەرەنجام دەبمە هاوسەری تۆ وە ئەم مشت ومڕو ڕووداوانە بچووکترین کۆسپێك ناخەنە نێوان عیشقی ئێمەوە. پەروێز, دایکی تۆ بۆچی منی خۆشناویٚ ؟ مەگەر من چ خراپییەکم لەگەڵی کردووە. من ناتوانم باوەڕ بکەم کە دایکی تۆ تا ئەو ڕادەیە ڕێگری خۆشبەختی تۆ بیٚ .**

**پەروێزی من ... بیری نەچیٚ کە من ناتوانم تۆ لە بیربەرمەوە. ئەمە وەکو فەرمانی مردنی منە. هێشتا بیرەوەری شیرینی دوابین شەویٚ کەپێکەوە چووبووین بۆ سینەما لە رۆحی مندا ماوەتەوە و من جار ناجاریٚ بەبیر هێنانەوەی تۆ  و قسەکانی تۆ ، هەموو ئازارو خەمەکانم لە بیر دەبەمەوە  وە بۆ ساتەوەخێکی کەم خۆم خۆشبەخت دەبینمەوە**





**خۆزیا ئەو شەوانە دووپات ببوایەتەوەو ئێمە بمان توانیایە لە پاڵ یەکتردا ژیانێکی شادمانانە پێك بهێنین .**

**پەروێزی من . . . تۆ دەبیٚ بە هەر وەسیلەیەك بووە لەگەڵ دایکما قسە بکەی . من بۆ ئەم کارە پێم باش بوو کە پێنج شەممە یان هەینی بلیتی سینەما ببڕم, بۆ تۆش ببڕم وە تۆ لەویٚ لەگەڵ دایکما بەو شێوەیەی کەمن دەمەویٚ قسە بکەیت و بە تەواوی هەستی بەدبینی لە دڵی دەربکەیت. ئەمڕۆ بە ڕا دەیەك ئازاری داوم کە ئامادەبووم بمرم وئەو هەموو ئازارە نەچێژم بەلاٚم پەروێز ەن لەبەر تۆ بەرگەی ئەم هەموو شتانە دەگرم. من خۆم بۆ رووبەروو بوونەوەی کارەساتی گەورەتر ئامادەکردووەو ئەم شتانە لە ناخی منا کەمترین کاریگەرییەکیان نابێت و تۆزقاڵێك لە عیشقی من سەبارەت بە تۆ کەم ناکاتەوە .**

**پەروێز . . . من ئەگەر لە جێگەی تۆ بوومایە بەر لەهەموو شتیٚ دایکمم رازی دەکرد . تۆ هەوڵ بدە زا ڵ ببی بەسەر بیرو باوەڕو بیرکردنەوەیدا و رازی بکەی . من لەگەڵ ئەوەی دایکتم زۆر نەبینیوە و لەگەڵیا نەکەوتوومەتە قسەوە, خۆشدەویٚ و سەرسامی من لێرەدایە کە چۆن ئەو ئامادەیە لەدژی شادمانی تۆ بجووڵیٚ .**

**پەروێز . . . من تۆم لەگەڵ دنیایەك هیوادا خۆشدەویٚ و تەنها خۆشبەختیم لە خوا دەویٚ ، وە بیستنی ئەم داواکارییانە ئازارم دەدا . من لە دوێنێوە تاکو ئێستا فرمێسکم رشتووە حالەٚتێکی سەیرم هەیە بەقسەی پوران هەستی خۆ بەختکردن تیاما بێداربۆتەوەو ئامادەم بۆ هەموو جۆرە ناڕەحەتییەك خۆم ڕابگرم لەرێی گەیشتن بە**

مەرام ونیازم و بەخۆشبەختی , کە لە پاڵ تۆدا بەدەستدێ .

پەروێز . . . تۆش سەرسەخت و خۆبەختکەربە ، تا دەتوانی پێ داگری بکە لەوەلاّم وەرگرتنەوە لە باوکم . ئەو ، کەسانی سەر سەخت و رق ئەستوری خوشدەوێ. و لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا وەلاّمی تۆی نەداوەتەوە. وانیە؟ من ئەم مەسەلەیە زیاتر کاری لیکردووم کە بۆچی دەبێ دایکی من کەئەوەندە بەرامبەر بە تۆ میهرەبان بووە ئەوەندە خۆبەسەر بێت و بکەوێتە ژێر کاریگەری هەموو قسەیەکەوە چ راست چ درۆ هەروا زوو رابگۆڕێ! بەلاّم من دڵنیام کە تۆ بەمەنتیقی بە هێزی خۆت دەتوانی بەسەریا زاڵ بی و باوەڕی لاوازی ئەو نەهێڵیت .

پەروێز . . . من تەنها یەك شتم لە تۆ دەوێ . ئەویش وەرگرتنی رەزامەندی دایکم و دایکتە . هەڵبەت کاتێ دایکت رازی بوو بێ‌گومان دایکیشم رازی دەبێ . وەلاّمی نامەکەم بدەرەوەو بیدە بە فەرەیدوون بیهێنێ ، من چاوەڕێی وەلاّمی تۆم. تاخواش لەگەڵماندایە . هیچ کەس ناتوانێ رێ لە خۆشبەختیمان بگرێ . من تەنها لە خوام دەوێ کەمن وتۆ لە پاڵ یەکدا خۆشبەخت بکات. تۆش بۆ یەکلایی کردنەوەی ئەم مەسەلەیە تەنها پەنا بۆ خوا بەرە. ئەو یارمەتیمان دەدا

خوا حافیز پەروێزم

فروغ

سێ شەممە



پەروێزم . . . تکایەکی بچووکم لێت هەبوو ، بیرم چوو بینوسم .دەبێ وێنەیەکتم بۆ بنێری لە پشتەکەشی بنووسی . بیخەرەلای کاغەزەکە ، بیدە بە فەرەیدوون بیهێنێ و دڵنیابە جگە لە من هیچ کەسێ چاوی پێ ناکەوێ .

داواکەم قبوڵ بکە

فروغ

## پەرویز ی خۆشەویستم

من ئەم نامەیەت تەنها بەمەبەستی رێنمایی کردن بۆ دەنووسم و لام وایە لە سەرکەوتنی تۆدا بێ کاریگەری نەبێ . بەرلەهەموو شتێ دەبێ بڵێم کە من دوچاری هەڵە یەکی گەورە بووم کەتا رادەیەك زیانی لە خۆشبەختیمان دا بەڵام ئێستا بێ ئەندازە پەشیمانم. لەدوای ئەوەی کەتۆ دووەمین کارتی خۆتت بۆ باوکم نارد وەمن ئەوم بەرامبەر بەو مەسەلەیە ساردو کەمتەر خەم بینی ، ئیترخۆمم پێ رانەگیرا و ، بێ راوێژکردن بەهیچ کەسێ, نامەیەکم بۆ نووسی و لەنامەکەدا راشکاوانە دانم پیانا کە تۆم خۆشدەوێ وداوام لێکرد کەخۆشبەختی ئێمە لە بەر چاو بگرێ. هێندە سەبارەت بەو مەسەلەیە کەمتەرخەم نەبێ نازانم ئەم نامەیەی من چۆن چۆنی کاری لەو کرد وەچ بڕیاریکی دا کە هەر لەو کاتەدا وەڵامی کارتەکەی تۆی نووسییەوە ، بەڵام دواتر من هەرچی چاوەڕوانیم کرد ئەوەی بۆ تۆ نەنارد ئەم گرنگی پێ نەدان و پشت گوێ خستنە لە سەر من زۆر بە گران تەواو دەبوو وە من وای بۆ دەچووم کە ئیتر دەبێ بۆ هەمیشە دەست لە تۆ هەڵبگرم . هەر دوێنی ٚ بەرلەوەی تۆ بێیت, خەم و ئازارێکی تیژ فشاری بۆ سەر رۆحم دەهێنا. کە من بڕیارم دابوو بڕۆمە لای باوکم و ئەوەندە بگریم کە ڕازی ببێ ، باوەڕ بکە ئەگەر تۆ نەهاتیتایە و ئەگەر باوکم زووتر لە





رادەی ئاسایی لە ماڵ نەچووبایەتە دەرەوە. من ئەم بڕیارەم بە کردەوە پیشان دەدا . بەڵام خوا نەیویست . من وای بۆ دەچم کە ئەم نامەیەی من هەندێ ئەوی خستبێتە گومانەوە .لەو رووەوە بە تەواوی پەشیمانم بە جۆرێك کە ئیتر پێویستم بە سەرزە نشت کردنیش نیە . نازانم تۆش من بە کەمتەر خەم دەزانی یان نە ، بەهەر حاڵ ئێستا ئیتر چارەنیە. بەڵام هاتنی ئەو شەوەی تۆ وایکرد کەئەو واز لە کەمتەرخەمیی پێشووی خۆی بێنێ و ، ئەمڕۆ بەیانییەکەی وەڵامە کەی تۆی نووسییەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەك ئەوەی کەمێ ناڕازی بێت وەلەوەی کەمن کەمێ زیاتر لەتۆ ئاشنایە تیم بە ئاکارو رەفتاری هەیە ، هەستم کرد کە ئەوانە تەنهاو تەنها بڕو بیانوو بە هانەیەو نامەکەی من بۆتە هۆی گۆڕانکاری لە ئاکارو بیردۆزەی ئەودا . بەیانی کاتێ دایکم مەسەلەکەی بۆ بەیان کرد ، لەوەڵامدا وتی " کە ئەگەر ئەو بتوانی ٚ خانوویەك ئامادە بکات. من رازیم . سەیرکە پەروێز من دەزانم کە باری دارایی تۆ لە بارنیە و تۆ ناتوانی وەڵامێکی ئیجابی ئەم پێشنیارە بدەیتە وە ، بەڵام تۆ هەوڵ بدە بەخۆگونجان ، ئەو رازی بکەی . کە دەست لەو بیرۆکەیە هەڵبگرێ و ئەوەشی پێ بڵێیکە دەتوانی ئێستا ، خانوویەك بە کرێ بگری و دواتر کە باری داراییت بواری دا هەوڵی کڕینی خانووش بدەی .

بەڵام پەروێز . . . دڵنیابە من هیچ کاتێ داواکارییەکی وام لە تۆنیە کە لەڕادەی توانینی تۆ زیاتر بێت . من ماڵ و ژیانی شکۆدارم لە تۆ ناوێ وە ئەو شتانەی کە دەینووسم بیرو بۆچوونی تاکەکەسی من نیە ، یانی من وەك شەخسی خۆم شتێکم لە تۆ ناوێ و ، مەبەستم

تەنها ئەوەیە کەتۆ بەر لەچوونت بۆلای باوکم، بە پێشنیارەکانیئاشنابکەم. وە تۆ لەبیری چارەسەردابیو وەلامەکە ئامادەبکەیت..... من دەزانم کە ئەمانە بە هانەیە و هیچی تر. ئەو مەبەستی ئازاردانی منە. بەلام منیش دەمەوێ تۆ بزانی کەئەو خەیاڵیەتی پێشینارێکی ئاوەهات بخاتە بەردەم و کۆسپێت بخاتە بەردەم ، بەلام تۆ ئازابە و لەو شتانە مەترسە و راشکاوانە بڵێ کە ئێستا ناتوانی خانوو بکڕی بەلام تا چەند ساڵێکی تر بەراستی دەیکڕیت.ئەمانە تەنها بۆ دڵنیابوونی ئەو بیڵێ . . . چونکە من بایەخ بەم شتانە نادەم وبوون ونەبوونی خانوو لە لای من وەك یەکە. مەسەلەیەکی تریش هەیە کە دەبێ بۆ تۆی روون بکەمەوەو ئەو مەسەلەیەش دەزگیرانیی ونیشانەکردنە .

پەروێز . . . دایکم ئەمڕۆ پێی گوتم کە وای بۆ ناچم باوکت رازی بێ لەسەر نیشانەکردن. من گوتم بەلام پەروێز ئێستا پارەی نیە تا بتوانی ` پێداویستی مارەبڕین ئامادەبکات بەلام ئەو لەوەلامی منا پێشنیاری دەکرد کەمن وەك خۆم لەرەتکردنەوە و قبوڵکردنی ئەوەدا هیچ ناڵێم . کت ومت ئەوەت بۆ شەرح دەکەم تۆش راست ودروست بیر بکەوەوە ، رەنگە تا ئەندازەیەك بە سوودبێ . ئەو گوتی کە تۆ بە ڕاستی بۆ ئامادەکردنی خەرجی مارەبڕین ناچاری لە مووچەی مانگانەکەت هەرمانگە بڕێك بخەیتە لاوەو دواتر کاتێ بڕی پاشەکەوتەکەت گەیشتە ئەو ئاستی پێویستە ، دەست بدەرە ئەو کارە ، بەلام تۆ ئەو بڕەی کە دەتوانی و دەتەوێ لە ماوەی دووساڵدا ئامادەی بکەی ، بە یەکجار لە " بانکی سپە " وەك قەرز وەری بگرە و، ئەو جا هەموو مانگی ` ئەو بڕە پارەیەی کەویستوتە بی



خەیتە لاوە ، بیدە بە بانك .

پەروێز . . . ئەمە دەقاو دەقی پێشنیارەکەی ئەوە وەمن هەر بەو شێوەیەی کە جاریکێیتریش گوتم ، ناتوانم بڵێم کە باشە یان خراپ

هەڵبەت تۆ لە من باشتر بەرژەوەندی خۆت دیاری دەکەیت و دەتوانی لەم بارەیەوە بیر بکەیتەوە و بڕیار بدەی . بەلام پەروێز _ دەبێ بڵێم کەئەمە چارەسەرێکی دانسقەیە لە حاڵەتی دژایە تیکردنی باوکم بە نیشانەکردن ، راستە کە ئەم بڕیارە بۆ منیش و بۆ تۆش ناخۆشە وە من هیچ کاتێ رازی نیم تۆ لە سەرەتای لاوێتی دا ناچار بکەم کە لەبەر خەرجی نازەروری پەنا بۆ قەرزکردن بەری بەلام لە لایەکەوەش دەبینم کە ئەم قەرزە لە حاڵەتی دژایەتیکردنی باوکم ، پێویستە . بەهەر حاڵ من ناتوانم بیرو باوەڕی خۆمت بۆ شی بکەمەوە ، یانیلەم بارەیەوە خاوەنی هیچ بیرو بۆ چونێك نیم . لەمبارەیەوە تۆ خۆت بیربکەرەوە ومەسەلەکە بەراستی ودروستی لە بەرچاوبگرە ئەکەر زیان بە خۆشبەختی تۆ ناگەیەنێ ، ئەوا ئەوە قبوڵ بکە وە ئەگەر نا منیش لەم مەسەلەیەدا پێ داگرییەکم نیە ، بەڵکو ڕێگەشت لێ دەگرم . زۆر قسەم هەیە کە دەبێ لەکات و شوێنی خۆیدا بۆتی باس بکەم .

پەروێز ی خۆشەویست . . من هیچ شتێکم لە تۆ ناوێ ئەوەندە نەبێ کە منت خۆش بوێ و ببمەخاوەنی ژیانێکی سادە و شیرین . بۆ من ئەوە بەسە، بەلام لەلایەکی ترەوە ناتوانم لە بەردەم باوك ودایکم داکۆکی لە تۆ بکەم ، چونکە دەزانم کە بەو ئاکارو رەفتارەی کە ئەوان هەیانە لە راستیدا ئەم مەسەلەیە بە زیانی من و تۆ تەواودەبێ . بەلام من تا ئەو شوێنەی کە هێزو توانام هەیە هەوڵ

دەدەم کەلەرووی خەرجییەوە یارمەتی تۆ بدەم و ئەوەندەی لە توانا دایە بەر لە خەرجی زیادەو ، رازا ندنەوەی رووکەشی بگرم چونکە دەزانم کە ئەگەر تۆ خەم بخۆی بۆمن زۆر ناخۆش دەبیّ وەمن لە تۆ زیاتر ئازار دەچێژم .

پەروێز . . . دوێنیّ شەو خۆت لەویّ بوویت و بیّ گومان بیستت کە دایکم چی گوت وە مەبەستی ئەو چی بوو لەو مەرجانەی کە تۆ دەبیّ قبوڵیان بکەی . من نازانم کە تۆ پەیت بە جۆری ئەو مەرجانەبردووە یان نە . بەلاّم وای بۆ ناچم کە هیچ کاتیّ ئەم مەرجانە بگاتە قۆناغیکردەوە . تەنانەت بیری ئەوەی کە رەنگە من وتۆ رۆژێك تاچار بین یەکتر جیّ بهێڵین ، بۆ من تالّ و ئازاراویە ، چ جای بگاتە ئەوەی کە بمانەویّ دەست بدەینە ئەو کارە من خۆم هیچ دڵم پێوەی نیە کە پێتی بڵێم ئەم مەرجانە چی یە .چونکە تا ئەو شوێنەی هەستم کردووە بە تەواوی منالأنەو دوورە لە ئەقڵەوە.دەبیّ ئاگاداری ئەو بەڵگە نامەیە بیت کە سیروس داویەتی بە دایکم. ئەم بەڵگە نامەیە دەلالەتی لەوە کردووە کە ئەگەر رۆژی سیروس بیەویّ جگە لە " پوران " ژنێکی تر هەڵبژێریّ ، ناچارە بری ( 10000 )تمەن بدات !

سەیرکە پەروێز منالأنە تر شت لەم پێشنیارە ، لە دونیادا چی یە؟ !

زۆر جێگای پێکە نینە . من کەلێی ناڕازیم ، بەلاّم لەوەی کە دایکم مەرجی بە هاوسەربوونی ئێمەی ، بەو بەڵگە نامەوە گریّداوە ، من مەسەلەکەم بە تۆ گوت وە تۆ پشت راستی بکەوە کەشتیکی لەو جۆرە ناکریّ و مەحالە. وە تۆ ئەگەر بە ڕاست منت خۆش بویّ ئەو بەڵگە نامەیە دەدەیت و من بەوپەڕی دڵنیاییەوە پێتی دەڵێم کە پێدانی ئەم بەڵگەنامەیە بۆ تۆ بچووکترین زیانێکی





نیە. مەخابن کە مافی هەڵبژاردن بە دەست خۆم نیە ، ئەگەر نا بە تۆم دەسەلماند کە بۆ من شتە ماددییەکان بچوکترین بەهایەکی نیە. من هیچ کاتیّ خۆشبەختیم ناکەمە قوربانی پارە. . تۆ بۆ من لە ملیۆ نان زیاتر بایەخت هەیە .

پەروێزی خۆشەویستم . . . من وای بۆ دەچم تا ئەو شوێنەی توانیوومە مەسەلەکەم بۆ تۆ روون کردەوە. من سەرکەوتنی تۆم لەم مەسەلەیە دا لە خوا دەویّ و دنیایەك سوپاسی تۆو دایکت دەکەم . دەمزانی کە ئەم قسانە هەمووی درۆیە وە دایکی تۆ لەوە بەرزترە کە کەسانی تر تەسەوری دەکەن . من دڵنیات دەکەمەوە کە هەموو ئەو قسانە م لە بیربردۆتەوەو هەرگیز ئەم شتە پووچانە ناتوانیّ کار م لیّ بکات.

پەروێز . . . تا ئەو شوێنەی کە دەتوانی لەگەلّ پێشنیارەکانی باوکم هاودەنگ بەو , ڕازی بکە . بیرت نەچیّ کە لە حالەتی دژایەتی ئەو دا ، من وتۆ ناچارین بۆ هەمیشە لە یەکتر جیا ببینەوە

پەروێزەکەم . . . ئیتر لەمە زیاتر ناتوانم بنووسم . بەختەوەریتم لە خوا گەرەکە .

**خوا حافیز**

**فروغ**

**هەینی** ( 1950/6/22 )

## پەروێزی خۆشەویستی من . . .

سەرەنجام بەو شێوەیەی کە پێشبینم کرد بوو, باوکم رازی نەبوو بە مەسەلەی نیشانەکردن و تەنانەت مارەبڕینیش بەو مەرجانەی کە دایکم بۆ یارمەتیدانی تۆ پێشنیاری کرد بوو. وە لەوەلاّمی هەموو ئەمانەدا تەنها وتی کە " " تۆ دەتوانی هەر کاتیَ خزمەتی سەربازییت تەواو کردو وە باری دارایت لەو ماوەیەدا رێك و پێك کرد بچیتەوە لای ، ئەو ئامادەیە بە بەڵێنی خۆیەوە پابەند بیَ . ئەمە بۆ من زۆر ناخۆشە و تەنانەت لە نووسینی ئەم شتانەش هەست بە جۆرێك ناڕەحەتی لە خۆمدا دەکەم .

پەروێز . . . بیر کردنەوە لەوەی کە گوایە دەتوانن بەختەوەری بەئاوێنەیەك و مۆمدانێك و ئەڵقەیەك کە هەرگیز لە ژیاندا بەکەڵکی من نایەن وەمن ناچارم تەنها بەمەبەستی رازاندنەوەو جوانکاری سوودیان لیَ وەربگرم بگۆڕنە وە ، زۆر ئازارم دەدات. من هەرگیز ناتوانم قبوڵی بکەم. کە پێناچیَ ئاوێنەیەك و مۆمدا نێکی گرانبەها ببێتە هۆی زیاد کردنی خۆشبەختی و شادمانی یان رێزو نرخی کچێك .دژایەتیت لەگەلَ دەکەن ,چونکە تۆ ناتوانی لەگەلَ بیروباوەڕی پووچ و داب و نەریّتی لە بیرکراوی کۆن کاریکەی و ناچاری ماوەیەك بە سەرگەردانی بمێنێتەوە .





مانای ئەم دژایەتیە دەزانی چی یە ؟ . . . یانی ئەگەر تۆ ئاوێنە و مۆمدان بهێتی دەتوانی من ببەی. ئاخ ئەگەر تۆ کەمیَ زیاتر بە شێوازی بیر کردنەوە و رۆحی من ئاشنا بیت هەبیَ ، دەتوانی دەرکی پیَ بکەی. کە ئەم مانایە بۆ من چەندە تالَ و چەندە ئازاراو بیەو وە هەر ئەو دژایەتیکردنە بچووکە چەندە منی سەبارەت بە دنیاو خەڵکە کانی بەدبین کردووە .

پەروێزی میهرەبانم...دڵنیام لە بیرتە کە مەبەستی من لەم خوازبێنی یە چی بووە، شەوێکیان بە تۆم گوت کە ناهێڵن لەگەلَ تۆ تیکەلَ و هاودەم بم، چونکە نازانن کە تۆ چ مەبە ستێکت لەم هاودەمی یە هەیە و، ئەم رووداوانەی دوایی هەمووی‌و هەمووی لە سەر قسەی ئەو شەوەی من هاتە گۆڕیَ و من داوام لە تۆ کرد, بچی بۆ لای باوکم تا من بتوانم ئازادانە تۆم خۆشبویَ . بەلاّم نەمدەزانی کە تۆ رووبەرووی دژایەتی ئەو دەبیتەوە . هەڵبەت ئەمە گوناهی منە کە ئۆقرەم نەگرت تا حالَ و وەزعیەتی تۆ چاك بیَ . بەلاّم پەروێز ئایا من دەمتوانی تۆ نەبینم وە گوێم لەدەنگت نەبیَ...؟ بۆ کەسی َ کە عاشقەو بە هەموو دڵیەوەش خۆشی دەویَ گەورەترین کارەسات ئەوەیە کە ئەو لە بینینی خۆشەویستەکەی بکەن. من دەزانم کە تۆ هەرگیز خۆت بۆ زەواج ئامادەنەکردبوو ,وەدەزانم کە تۆیان خستە بەردەم پێشنیارێکی چاوەڕواننەکراو ،

بەلاّم پەروێزەکەم . . . ئێستا جگە لەدان بە خۆداگرتن چارەیەکمان نیە. ئێستا مەسەلەکە حالۀ تێکی تازەی بە خۆوەگرتووە یانی بەو شێوەیەی کەمەبەستی سەرەتایی ئێمە بوو .

باوکم گفتی داوه که هەر کاتیٚ وەزعی تۆ باش و له بار بوو، وەلاٚمیٚکی رازی بوونانه به مەبەست و پیٚشنیارەکەت بداتەوه. وه ئەمەش هەر ئەوەیه که ئیٚمه دەمانویست. وەئیٚستا تۆ دەتوانی به خەیالٚی راحەت ئیش بکەیت و بۆ پیٚداویستی ژیانی دا هاتووت دەست به کار ببی . بەلاٚم مەسەلەیەك که هەروا بیٚ چارەسەر ماوەتەوه ئەوەیه که دیسانەوەش من ناتوانم تۆ ببینم وه لەگەلٚ تۆدا به ئازادی هاتوو چۆم هەبیٚت .

پەرویٚز ی خۆشەویستم . .من دان به خۆمدا دەگرم . . . به ئومیٚدی ئایندەیەك که خۆشبەختی و شادمانی ئیٚمه بگریٚته خۆ. .راسته کەمن ئازار دەچیٚژم, له بەهای ئەم ئازار چەشتنانه ، تەمەنیٚك له پالٚ تۆ دا خۆشبەختانه دەژیم. دایکم تەنها مۆلەٚتی ئەوەی داومەتیٚ که نامەت بۆ بنووسم ، رەنگه بەریٚکەوتیش له شویٚنیٚکدا چاوم پیٚت بکەویٚ . . . بەلاٚم دەزانم که هەرگیز ناتوانم بەو شیٚوەیەی که ئاواتمه قسەت لەگەلٚدا بکەم وەچیٚژ له قسەکانی تۆ وەربگرم. تۆش وەلاٚمی نامەکانم بدەرەوه . خویٚندنەوەی نامەکانی تۆ بۆ من گەورەترین شادمانی دەبیٚ . رەنگه باوەڕ نەکەی ئەگەر بلٚیٚم نامەیەك که له تۆوه دیٚ بۆم ، رۆژانه چەند جاریٚك دەیخویٚنمەوەو هەر ئەو نامه بچکۆلەیه کاتژمیٚریٚك دەبیٚته مایەی شادمانی دلٚ و دەروونم .

پەرویٚز . . . من ئومیٚدم به ئایندەیه ، تۆش تەنها له بەر ئەو ئایندەیەی که من و تۆ له پالٚ یەکتردا خۆشبەخت دەکات هەولبٚد ه . هەردووکمان ئارامدەگرین . ئەمه باشترین هۆیەکه که دەتوانیٚ شادمانی ئیٚمه له ئایندەدا دەستەبەر بکات . تیٚ بکۆشه دریٚژترو شیرینتر وەلاٚمی نامەکانم بدەیتەوه .





من ئیٚستا بەو هیوایه دلٚخۆشم که ئەگەر نەشتوانم بتبینم ، دەتوانم نامەکانی تۆم پیٚ بگات .تۆ نامەم بۆ بنوسه ، دەشیٚ ئەو نامانه کەمیٚ له باری خەم و ئازارم کەمبکەنەوه . ئەمه باشترین هۆیەکه که ئیٚمه دەتوانین بەهۆیەوه رازو نیازی دلٚمان ئاشکرا بکەین. لەگەلٚ مندا هەندیٚ دلٚسۆزتر به. ئەگەر تۆ له نامەکانت لەگەلٚ مندا به راستی و له ناخی دلٚەوه بدویٚی، هەزار جار زیاترم خۆش دەویٚی .

پەرویٚزی خۆشەویستم ...ئەوه هەر له بیر بەرەوه که مەسەلەیەکی ئاوا روویداوه، وا بیربکەوه که هیٚشتا نەهاتویتەته لای باوکم، ریٚك وەکو جاران ,هەردووکمان خۆڕادەگرین . تۆ ئیش دەکەی و منیش دەرس دەخویٚنم, هەر کاتیٚ خزمەتی سەربازیشت تەواو بوو ، دیسانەوه وەرەوه بۆ لای باوکم ...هەر کاتیٚ توانیت وەلاٚمی بیروباوەڕی پووچی ئەوانه بدەیتەوه ، ئەو کاته وەره ... ئەوه باشتره. دوو سالٚ هیچ نیه ، زوو به سەر دەچیٚ, بەلاٚم شادمانییەك که لەدوای دووسالٚ چاوەڕوانی ، ئیٚمه ئەکات ، زۆر گەورەو، زۆر شیرینه. هەردووکمان له بەر ئامانجیٚکی هاوبەش ، دان به خۆدا دەگرین . له و ماوەیەدا ، من نامەت بۆ دەنووسم و تۆش وەلاٚم دەدەیتەوه وبەم شیٚوەیه دەتوانین دیسانەوەش لەگەلٚ یەکتر میهرەبان وگیانی به گیانی بین .

پەرویٚزی خۆشەویستم . . . ئیتر هیچم نیه بۆ نووسین. کامەرانی تۆم له خوا دەویٚ

خوا حافیز

فروغ

( 1950/7/4 )

وەڵامی نامەکەم بە ناونیشانی ماڵی خۆمان مەنێرە چونکە کوڕ و کاڵ وەریدەگرن و دەیکەنەوە . لە سەر زەرفەکە بنوسە " شەقامی سلیمان خان/ کۆلانی ( مەزاهیری )/ نوسینگەی رۆژنامەی( سیروس ما) . لە گۆشەی زەرفەکەش نیشانەیەکی " * دابنێ . دڵنیابە کە راستەوخۆ بە دەستی خۆم دەگات, چونکە زەرفەکانی نوسینگەی گۆڤارەکە دەهێنن بۆ ماڵی ئێمە و کە سێکیش نایانکاتەوە, وەمن بە ئاسانی دەتوانم کاغەزی تۆم پێ بگات . ئەگەر بەوشێوەیە رازیت وەلام بدەرەوە





## یەکشەممە ) 5 ی تەمووز

پەروێز گیان ئەمشەو ئیتر لە دەست هات و هاوار و شەڕ و دەمە بۆڵەۛ پەنام بۆ ئەم ژوورە هێناوە ، من لەو کاتەوەی کە خۆمم ناسیووە لەگەڵ ئەم شتانەدا ناکۆك بووم وهەمیشە ئارەزووی ژیانێکی ئارام و بێ هەراو زەنام دەکرد . بەڵام هەندێ کات خواش لەگەڵ مرۆڤ رقەبەرایەتی دەکات ، دەتوانم چی بکەم. هەر ئێستا لە حەوشەکەدا سەرقاڵێ پیلان دارشتنن بۆ ئەوەی چراکەم لێ بسێنن . دەزانی ئەو ژوورە یکە دولابەکەی منی تێدایە گڵۆپی کارەبایی تیا نیە. گڵۆپەکەی ماوەیەکی زۆرە سووتاوە... منیش هەموو شەوێ نزیکەی سەعاتێ چرا ی نەوتی بە کار دەهێنم . خاوەن ماڵەکان تووڕە بوون . مەگەر دەکرێ هەم نەوت بسوتێنی و هەم کارەباش . ئەمە مەنتیقی ئەوانەیە. لە کاتێکدا کە رۆژی تەنە کەیەك نەوت تەنها بۆ داگیرساندنی ئو توو و تەباخ سەرف دەبێ لە بەیانیەوە تاکو ئێستا سەرقاڵێ مشتو مڕو رووبەروو بوونەوەم لەگەڵ خەڵکی ناو ماڵەکە. ئەوەندە گریاوم کە هێشتا چاوم دەسوتێتەوە. پەروێز, رەخنەم لێ دەگرن کە بۆچی هەموو رۆژێ نامە بۆ تۆ دەنووسم ، تێ ناگەم ئاخر مەگەرئەم کارە گوناحە ، مەگەر منی بەدبەخت مرۆڤ نیم و هەقم نیە کەسێکم خۆشبوێ





ونامەی بۆ بنوسم. من هەقم نیە بچم بۆ ماڵی ئێوە ، هەقم نیە پێم بنێمە دەرەوەی ماڵ ، من شێت دەبم ئاخر مەگەر من زیندانییم، مەگەر من جگە لە ماڵی ئێوە بۆ جێگەیەکی تر چووم. مەگەر من گەنج نیم و پێویستم بە پیاسە و گەڕان و رابواردن نیە، دەڵێم بە تەنها ناڕۆم دوام کەون ، هەر کەسێ دەیەوێ بێت. مەگەر دەبیستن. دەگریم هاوار دەکەم . هیچ یەکێ لەم ماڵەدا قسەیەکی حسابی ناچێ بە مێشکیا ، یان ئەگەر شعورێکی هەیە لە ترسا ناتوانێ دەری بخات . هەمووان خۆپەرست هەموو ملهوڕ و چەنەبازن. منیش لە دواجاردا هەڵدێم. جگە لەمە چارەیەکم نیە کاتێ بە ئاگادێن کەمن ئیتر لێرە نیم . چەند رۆژێك بوو قسەم لەگەڵ هیچ کەسێ نەدەکرد ، پێم وابوو ئاو ها باشترە. چونکە ئەگەر من بمەوێ یەك ووشە بڵێم هەر زوو کەسانی تر ئەو هە لە دەقۆزنەوە و دوو جارانی ئەوە ئەو دیمەنانەی کە من رقم لە بینینیانە تازە دەبێتەوە . ئەمڕۆ بەیانی مقەست بزر ببوو ، ئاخرمەگەر من دزم !مەگەر من مقەستم قایم کردووە تاکو بیفرۆشم ، من خۆم مقەستم هەیە . دوای کاتژمێرێ لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوە هەر کە دەرگای دۆلابەکەم کردەوە هێرشیان کردە سەردۆلابەکەم . من لەم ماڵەدا تەنها دۆلابێکم هەیە بەڵام بەرپرسیارێتی ئەوەش لە دەستی مندا نیە . هەرکاتێ یەکێ شتێکی بوێ خێرا سوود لەنەبوونی من وەردەگرێ و بزمارەکان دەردەهێنرێن ونیازیان سەردەگرێ. دواجار قفلەکە وەکو جارانی لێ دێتەوە. لە دوای رۆیشتنی تۆ من هەوڵم دەدا هەمیشە ئەو ئامۆژگارییەی تۆ کە دەتگوت هۆشیار بم. پیادە بکەم .

هەموو رۆژێ جلەکانم قەد دەکرد کە لوپەلەکانم رێکدەخست ، دۆلابەکەم پاکدە کردەوە . بەلام بەداخەوە لە هەلمەتی مێژوویی ئەمڕۆدا ! هەموو شتومەکەکانی دران بەسەر یەکدا و وونبوون . هەلبەت من شتێکی گرنگم نەبوو بەلام ئەمە کارێکی شایستە نەبوو . منیش تا دەمتوانی بەرگریم دەکرد.

پەروێز گیان, بە خوا فڕۆکە توپ هاوێژە ئەمریکاییەکان لە کۆریا ئەوەندە وێرانکارییان نەکردووە. کە خاوەن مالەکان ئەمڕۆ لە دۆلابەکەی مندا کردیان . سەرەنجام مقەست نەدۆزرایەوەو من ئاسوودە بووم . دوای سەعاتێ لە بەدبەختی من, قەلەمیئارایشت بزر بوو ، من کە هیچ کاتێ ئەو سوراوە به کار ناهێنم،دیسان دەمەقالێ ودیسان شەڕ فرۆشتن, بە تۆمەتی دزینی ئەو سوراوە.دەبێ من چەندە گەلحۆبم کە ئامادەبم لە بەر قەلەمێکی ئارایشت گوێ شل بکەم بۆ ئەو هەموو شەڕ ودەمە بۆ لەیە ؟ !

"چراکە یان بردم ، ئێستا چ بکەم . " " لە دوای شەڕێکی دوو و درێژ پاشماوەی نامەکەمت بۆ دەنووسم، ئەویش لە تاریکیدا" سەرەنجام قەلەمی ئارایشتەکە دۆزرایەوەو خۆشبەختانە ئەمجارە دۆلابی بەدبەخت لە مەترسی هەلمەتی تازە ,بەبێ قڕە دەرچوو . عەسرێك لەبەرئەوەی کە زوو دەستم بە چا خواردنەوە کردبوو. بۆ کسێکی قورس بەر کەللە سەرم کەوت. ئەمجا چونکە نیازی چوون بۆ مالی ئێوەم هەبوو ، کاتژمێرێ شەڕم کرد و گریام و سەرەنجام شەوم بە سەرداهات. دۆڕاوو ، سەرشکاو تاربکیم پەسەند کرد لە جێیرۆشنایی پڕ لە قەرە بالغی و ، هەرا هەرا. ئەمەیە ژیانی رۆژانەی من .





پەروێز گیان من هەندێ کات لەو باوەڕەدام کە نابێ ئەم شتانە بۆ تۆ بنوسم وەببمە مایەی ناڕەحەتی بیرو خەیالی تۆ ، بەلام تۆ خۆت بلێ ئەگەر بۆ تۆی ئەنوسم چ کەسێ ئامادەیە گوێ لەم هەموو سکالایەی من بگرێ وە چ کەسێ بەبێ تاوان و زولملێکراوم لە قەلەم دەدا . ژیانی من زۆر سەیرە ! ئەمشەو ئیتر ئەوەندە بەسە .

خوا حافیزی تۆ تاسبەی شەو

ماچت دەکەم فروغی تۆ

## چوارشەمە 8 ی تەمموز

پەروێز گیان نامەکەت , هەر ئێستا بە دەستم گەیشت ، تۆ خۆت دەتوانی بیهێنیتە بەرچاوی خۆت کە لەم جۆرە حاڵەتانەدا من چەند خۆشحاڵ و خۆشبەخت دەبم و چەند لە دڵمەوە سوپاست دەکەم من ئەم نامەیەم بە شەوقەوە خوێندەوە .

پەروێزی خۆشەویستم, سوپاسی هەستی گیانی بە گیانیت دەکەم نا , من دەبێ لێرە بمێنمەوە ، من دەبێ تۆ لە لەو کەسانە بکەمەوە کە ئازارم دەدەن . ئێستا بڕیارم داوە.دەشێ خراپ بێ، بەڵام بیرت دێ کە هەمیشە دەتووت دەبێ پاداشتی خراپە بەخراپە بدەیتەوە و چاکەش بەچاکە. .ڕەنگە بڵێی ڕێزگرتنی دایك لەهەر حاڵەتێکدا ئەرکی سەرشان وپێویستە. بەڵام من نازانم دایك چییە. لەبەرئەوەی سوودێکم لە میهرو موحیبەتی دایکایەتی وەرنەگرتووە. من ئێستا لە بەرامبەری خۆمدا دوژمنێ دەبینمەوە کە بە هەموو هێزو توانایەوە لە ئازاردانی مندایە و شتێکی سروشتی یەکە بەرگری لە خۆم دەکەم. مەبەستی من لە نووسینی ئەو نامەیەئەوە نەبوو کە گرفێتکی تر بخەمە سەر گرفتەکانت . نە, پەروێز من تەنها بەم جۆرە دڵخۆشی خۆم دەدەمەوە وچونکە تۆ بە دۆستی خۆم دەزانم, بۆت دەنووسم وە تۆ نابێ لە بەر من خەم بخۆی ونیگەران بیت .





پێت وانەبێ کە مرۆڤێکی بێچارەم ، نە منیش دەتوانم ئازارییان بدەم. قسەیەکی من بەسە بۆ ئەوەی هات وهاوارییان بگەیەنێتە ئاسمان . من هەرگیز ناتوانم قبوڵی کەم کە دایك هەقیەتی قوڕگی مرۆڤ بگرێ و بیتاسێنێ . من دەتوانم بێ دەنگ دانیشم . بەڵام تا ئەو شوێنەی کە جوێنەکان تەنها من دەگرنەوەو ، تا ئەو کاتەی هەر لە خۆوە بە پەرستگای من یانی تۆ سوکایەتی بکەن ئەوکاتە کارێك دەکەم کە شێت بم و هات و هاواریان لێ هەڵبسێ. من بەوپەڕی حەزو ئارەزووەوە لێرە دەمێنمەوە ، هێندە ئازاریان دەدەم تا لە ماڵ وەدەرم نێن ، ئەوسا پێکەوەدەست بە ژیانی خۆشبە ختیمان دەکەین . ئەم دوو مانگەش بەخێرایی تێ دەپەڕێ . من بە بەردەوامی بە هیوای ئایندە دەژیم . دڵنیابە نەبوونی سەرمایە ناتوانێ کاریگەرییەکی لە سەر ژیانمان هەبێ . من تەنانەت بۆ سوتاندنی دڵی ئەوانەش ئامادەم لە خراپترین بارورەوشێکدا لەگەڵتۆدا بژیم. بوونی تۆ بە تەنهایی بۆ من لە هەموو دنیا زیاتر بەهاو, نرخی هەیە. من خەندەیەکی تۆ بەهەموو زێڕ و زیوی دنیا نافرۆشم. نیگایەکی میهراوی تۆ، دەستگوشینێکی تۆ ، ماچێکی تۆ بەسە تاکو من لە هەموو شتێ بێ نیاز بکات. من بە وانەی کەلە نێوان پول و پارەو ئەسکەناسو ژیانی ئەفسانەیی و شکۆ دار دا بە دوای شادمانی دا دەگەڕێن و دەیانەوێ سەر و سامان و دارا ییان بکەن بە مایەی فەخرو شانازی, پێ دەکەنم . بە بیر کورتی و گە مژەیی بێ پایایی ئەوانە گاڵتە دەکەم . من تەنها حەز دەکەم کە تۆ هەمیشە دۆستم بیت ,وەخێراتر ئەم دوو مانگە بە سەر بچێ ومن پەنا بۆ باوەشی پاك و میهرە بانی تۆ بێنم وە پێکەوە

بچین بۆ جێگەیەك كە لە موحیبەت و سەفا بەولاوە هیچی تری لیٚ نەبیٚ و هەمووان یەكتریان خۆشبویٚ . پەرویٚز زۆر روویداوە كەمن لەم مالەٚدا گوناهی كە سانی ترم خستۆتە ئەستۆم وە لە جێی كە سانی تر سزادراوم . لیٚ یانم خواردوووە تەنها بەو هیوایەی كە ئەوانە لەگەڵما دڵسۆزتر بن,باوەڕ كەبە ڕاستمە,بەڵام دوای یەك دوو سەعات , هەر ئەو كەسەی كە من گوناهەكەیم لە ئەستۆگرتووە لە سەر مەسەلەیەكی لاوەكی بەوپەڕی پڕ روویی و بیٚ شەرمییەوە بەرووما هەڵشاخاوەو هەزار قسەی ناشیرین وتۆمەتی نارەوای داوە تە پاڵم . ئەم شتانە بە سەر دەچیٚ ، من هەرگیز لەم خەڵكە پەستە چاوەڕێی موحیبەت و یارمەتی ناكەم ، باوكم هەرگیز لە بیری مندا نیە, دایكم دوژمنە لەگەڵما.وە ئەوانی تر كە جێگەی خۆیان هەیە. پەرویٚز لات وانەبیٚ كە من خۆم بە مرۆڤێكی سەرووی هەموان دەزانم و بەدەرم لە هەموو جۆرە كەم و كورتی و خەونێك . نە, من قەت لافی ئەوە لیٚنادەم ، بەڵام باوەڕم وایە كە ئەوانە لە خوار بنیادەمی ئاسایی شەوەن. من لەم مالەٚدا شتگەلیٚكم بینیوە كە هیٚشتاش كاتیٚ بیریان لیٚدەكەمەوە دڵم لەڕق و قین دا دەلەرزیٚ . پەرویٚز, من كاتیٚ بیری منالٚیی خۆم دەكەمەوە ، بیری ئەوكاتەی كە هیچ كەسیٚ چاودیٚری نەدەكردم. من لە منالٚیٚكی بیٚ ئاگاو سادە زیاتر نەبووم . حەز دەكەم هەموویان بە چنگەكانی خۆم بتاسیٚنم . بیٚ گومان ئەگەر دایكم ئاگای لیٚم دەبوو ,ئیٚستا ئەو پەردەی رەمزو ئەو شاراوەبیە لە ناو دەچوو كە دەورو بەرمی تەنیوە . وە من دەمزانی . هەموو شتیٚكم دەزانی و كەمیٚ ئارامم دەگرت . ئەم شتانە تیٚمانی گەیاند كە كاتیٚ بوومە دایك





چۆن چۆنی منالەٚكەم پەروەردە بكەم .تۆ ئەوسا دەتبینی كەمن ئەوم ( منالەٚكەم ) تەناتەت لە تۆش زیاتر خۆش دەویٚ . ئەویش لە وپەڕی خۆشبەختی دا ، من دەپەرستیٚ . من حەزمدەكرد دایكیٚكم هەبیٚ كە باوەشی پەناگای من بیٚ و هەوڵدەدەم بۆ منالەٚكەم وابم.لە راستیدا ئەم مالەٚ بۆ من قوتابخانەیەكە وە من وانەی پەروەردە كردنی منالٚی تیا فیٚر دەبم .

پەرویٚز گیان, هەر ئائیٚستا كە منالٚم بیركەوتەوە فرمیٚسك زایە نیٚو چاومكانم ، ئەی خوای من, ئەو رۆژە كەی دیٚ كەمن وتۆ منالٚیٚكمان هەبیٚ و لەگەڵیا لە بەیانیەوە تا شەو یاری بكەین ؟ تەناتەت ئەو خەیالەٚ دڵم دەگوشیٚ تۆ نازانی من چەندە حەزدەكەم كچیٚكی قەلەٚوو تەندروستم هەبیٚ ، جلوبەرگی بۆ بدورم ، بوكۆكەی بۆ بدورم, بیبەم بۆ پیاسەو گەڕان وە توند بینوسیٚنم بە سنگمەوە ، ئای من ئەوم هیٚندەی تۆ خۆش دەویست .

پەرویٚزی ئازیزم, كەواتە بۆچی ویٚنەكەتت نە نارد بۆم, ئەمجارە دەبینیٚرە ، منیش ویٚنەیەك دەگرم, هەفتەی داهاتوو دەینیٚرم بۆت نازانی چەندە حەز دەكەم تۆ ببینم ، بریا یەك دوو رۆژیٚ دەهاتیتەلام, ئەوەندەم ماچ دەكردی كە ماندووبیت. ئەوەندەم دەنووسانی بەسنگمەوە كە هاوارت لیٚ هەڵبسیٚ .پەرویٚز, نازانی چەندە خۆشم دەویٚی، چەندە خۆشم دەویٚی .پەرویٚز ئەو رۆژەی كە دووجار تۆ لە باوەش بگرم كەی دیٚ ، پیٚم بلٚیٚ كەی دیٚ. رۆژی بەختەوەری من كەی دیٚ. پەرویٚزی ئازیزم .

خوا حافیزی

تۆفروغی تۆ

**پەرویز** ، ئەمە دوایین نامەیە کە بۆ تۆی دەنووسم وە تەنها حەزو ئارەزوومە ئەم دوایین نامەیەی من کەمێك ئێوە لە هەڵە بگەڕێنێتەوە .دەبێ بەوپەڕی داخەوە بە ئێوە بڵێم کە ئەگەر لەلایەنی منەوە دەرهەق بە ئێوە سوکایەتییەك کراوە هەروا لەخۆوە وبێ بەڵگەو هۆ نەبووەو ئەگەر تادوێنێ شەو متمانەو دڵنیاییەکم پێتان هەبووبێ ئەمڕۆ ئیتر ناتوانم بایەخێ بەقسەکانی ئێوە بدەم وە دەرهەق بە ئێوە هەمان متمانە و دڵنیایی پێشووم هەبێ. بێ گومان دەپرسیت بۆچی و بە چ بەڵگەیەك ؟ بەڵام من تەنها بۆ سەلماندنی قسەکانی خۆم بە شێك لە قسەکانی ئەمڕۆ بەیانی ئێوە لەگەڵ بەشێك لە قسەکانی دوێنێ شەو تان بەراورد دەکەم تا خۆشتان بزانن کە تەواو بە هەڵە داچوون . ئێوە دوێنێ شەو لەوەڵامی پرسیاری مندا کە بە چ بەڵگەیەك ئەم مەرجە قبوڵ ناکەیت ،گوتووتە“" چونکە من متمانەم بە خۆم هەیە و دەزانم کە ژنێکم هێنا هیچ کاتێ تەڵاقی نادەم و ، لەوەش بترازێ ئەو مەرجە بێ متمانەیی دەگەیەتێ ."ئەمڕۆ بەیانی لەوەڵامی باوکما کە بۆچی ئامادەنیت بڕی مارەییەکە سەربخەیت دەڵێیت " بەو بەڵگەیەی کە ئەگەر رۆژێ ویستم ژنەکەم تەڵاق بدەم بتوانم ، یانی قورسایی مارەییەکە نەبێتە رێگری ئەوە. وە لە شوێنێکی تردا





دەفەرموویت مارەیی هەقێکە کە یاسای ئیسلام لە بەرامبەر هەقی تەڵاقدا داویەتی بەژن. " یانی بەرگرێکی مەحکەمە کە پیاو تارادەیەك سنوردار دەکات " زۆرباشە, بەڵام ئێوە دەتانەوێ ئەم کۆسپە زۆر بەرگر نەبێ تا هەرکاتێ کە دڵتان ویستی بتوانی ئەوە پارچە پارچە بکەیت وە بەدەر لە دژایەتییەکان وئەو جیاوازییانەی کە لە نێوان قسەکانی ئێوەدا هەیە من چۆن چۆنی دەتوانم ئەو متمانەیەی پێشووم دەرهەق بە ئێوە هەبێ ؟ باوەڕکە ئەگەر تا دوێنێ شەو بە منیان دەووت کە باوکم رازی بووە بێ هیچ قەیدو مەرجێك ببمە ژنی ئێوە بە دڵ وگیان قبوڵم دەکرد ، بەڵام ئەمڕۆ ئەگەر بە من بڵێین پەروێز ئامادەیە سەدملیۆنیش بکاتە مارەیی ئێوەو هەموو شتێکیش بهێنێ ,قەت ئامادە نابم ، لەبەرئەوە تا دوێنێ بە بڕوای پتەو وە خۆڕاگری تۆ دڵنیابووم . بەڵام ئەمڕۆ نیمە وە هەقیشمە نەم بێ . هەقم بەم کارانەوە نیە بڕیارم داوە تۆ لەبیر بکەم وە دڵنیابە لە بیرت دەکەم ، بێ ئەندازە بایەخم بە بیرو باوەڕی ئێوە دەدا ،بەڵام پێم سەلماکە بڕوای پتەو ،و سەقامگیرت نی یە . دنیا زۆر گەورە یە .من ئەگەر ئێوە م لە دەست داوە کە وێنە ی ئارەزوو و حەزو خولیای ناوەوەم بوویت ، بێ گومان لەم دنیا گەورەیەدا کەسێ دەدۆزمەوە کە هاوسۆز و هاوهەستم بێ و قەدرم بزانێ و جگە لەوەی ئەگەر من ئێوەم لە دەستداوە ئێوەش لە بریدا دڵێکتان لە دەستداوە کە ترپە عاشقانەییە کانی لە هیچ جێگە یە کی تر نادۆزیتەوە . لەمە زیاتر قسەیەکم نیە . بەختەوەری ئێوەم لە خوا دەوێ لە ژیاندا و، ئاواتمە لە بیرم بکەیت ، نامەکانم بسوتێنە ئەم دوا تکایەم قبوڵ بکە. من لە رادەبەدەر رێزم لە دایکت دەگرت ،

بەلاّم ئەو تەناتەت لە ئابڕو بردن و شەرەفی منیش خۆی نابوێریٚ . باوابیٚ گللەییم لەو نیە . بۆ هەمیشە خوا حافیز

**فروغ**

وەلاّمی **پەروێزی شاپور لە پەراوێزی نامەکەدا** ، لە بیرمە یەکەمین نامەی تۆم کە پێگەیشت چەند دیڕێکم لە پەراوێزەکەیدا نووسی . ئێستاش سوورم چەندە رستەیەك لە دوایین نامەی تۆ بخەمە ڕوو .تۆم بە کچێکی زۆر چاك دەزانی لە نێو سەرجەم کچاندا . زانیومە و دەشزانم کە دۆستایەتی من لەسەر کۆلەٚکەیەکی تر دانرا بوو کە موحیبەتی تۆ لە سەر ئەو بنەمایانە هەڵنەچنرابوو ، هەر لەو رووەوە , سار دییەکی ئاوهام لە پەنای گەرمای ئەو ئاگرەدا هەست پێدە کرد .



**پەروێز** وەلاّمدانەوە بە نامەی تۆ بەتایبەتی ئەو شتانەی کە تیایدا نوسیووتە بۆ من تا ئەندازەیەك سەخت و بە گرفتە .تۆ لەبەرئەوەی کە وانەی یاسات خوێندووە وەك وەکیلێکی بەرگریکەر, بەرگری لەخۆت دەکەیت و ، لە هەوڵدایت خالی لاواز لە نامەکانی منا بدۆزیتەوە و ئەوانە بکەیتە هۆکار و ئەشکەنجەم بدەی و هاوکات خۆت بیٚ هەلەٚو بیٚ کەموکوڕیی بناسێنی . سەرەتا دەبیٚ ئەوە بڵێم کە ئێرە دادگانیە و تۆش ئەو تاوانبارە نیت کە بۆ بیٚتاوانی خۆت پێویستت بەم هەموو بەڵگەوتاقیکردنەوە بێت و ، منیش نیازی دادگا یکردنی تۆم نیە . تەنها شتێك کە هەیە تۆ نەتتوانیوە مەبەستی من لەبەکارهێنانی دەستەوازەی شیرینی تێرو تەسەل لە ناخی دلەٚوە درك پیٚ بکەی. تۆ باوەڕت وایە کە منیش وەك سەرجەم کچان تینووی ووشەگەلێکم کەلە گومڕاکردنی رۆحم بەولاوە بەرهەم و ئەنجامێکی نیە .

پەروێز .. . باشە ، من بۆچی تۆم خۆشدەویٚ؟ ئایا کچێك کە بە دوای عیشقدا دەچیٚ کە لەگەلٚ خرۆشان و نەوازشێکی ڕوالەٚتی دا ، جووت بیٚ ، وەئایا کچێك لە عیشقدا تەنها وشەی بیٚ ماناو پێناسەی خالّی لە هەقیقەت بکاتە ئامانج هەرگیز دەرهەق بەتۆ موحیبەتێك پەیدا دەکات ، وەئایا ئەگەر من خاوەنی ئەو جۆرە سیفاتانە بوومایە

ئەوەم لە تۆ رادەبینی دەمتوانی تاکو ئێستا لەگەڵ تۆدا ئەوەندە گیانی بە گیانی و وەفادار یمایەتەوە وەئەوەندە لە دڵما دەرهەق بەتۆ موحیببەتم هەبێ . لە حالەتێکدا کە تۆ لە تاقمی ئەو پیاوانە نیت کە جێگە پەسەندی ئەو جۆرە کچانە بن. نە . من هیچ کاتێ مەبەستم لە نووسینی ئەم ووشانە ئەوە نەبوو کە وا لەتۆ بکەم باسی من بکەی و ، بە سەرما هەڵبدەی ، چونکە بوونەوەرێکی لە ڕادە بەدەر نیم .وە هەرگیز لە تۆم نەویستووە کەبە ووشەی درۆو ساختە هەستی بێزاری و لە خۆبایی بوونی سروشتیم بکوژێنیتەوە .

پەروێز . . . تۆ لە هەموو جێ یەك و تەناتەت لە قۆناغی عیشقیشدادەتەوێ کەڵك لەو وانانە وەرگری کە خوێندووتە . چ پەیوەندییەکی بە منەوەیە کە تۆ مافناسێکی لێ هاتوویت . من کاتێ هەموو دڵ و رۆح و هەستم پێشکەشی تۆ کرد بێ گومان چاوەڕوانی موحیببەت و دڵسۆزییەکی زیاترم لە تۆ هەیە وەکاتێ نەمتوانی تۆ ببینم و لە هەڵسوکەوتی تۆدا ئەو موحیببەتە بە دەست بێنم ، تکات لێ دەکەم کە ئەوەم لە نامەکانتا بۆ رەنگ پێ بدەیتەوە ، وە تۆ لێرەدا زۆر بە هەڵەدا چوویت . من هەرگیز نەمویستووە کەتۆ لە نامەکانتا بەسەر سەرو قژو رووی مندا هەڵبدەی ، یان ئەگەر مەودای هزرت فراوانتربێ بەژنو باڵای من بەسەرو یان بە کۆشکی هەوربڕ بشۆ بهێنی . لە راستیدا ئەگەر تۆ خاوەنی سیفەتێکی لەو جۆرە بوویتایە ، مەحاڵ بوو بتوانی بەو دەستەڵات و هێزەوە فەرمانڕەوایی لە دڵی منا بکەیت . من ڕقم لەو پیاوە دەبێتەوە کە بەووشەی فر یودەرانە و سەر لێشواندنەی خۆی لە هەوڵی گومڕاکردنی ڕۆحی سادەی کچێکی پاکژدایە .من تۆم بۆ ئەوە خۆشدەوێ کە ماستاوچی و زۆر بڵێ نیت.





من تۆم بۆ ئەوە خۆشدەوێ کە هەرگیز تاکو ئێستا وەسفی منت نەکردووەو بەم وەسف کردن و پیاهەڵدانە نەبوویتە هۆکاری لادانی هزرو بیروباوەڕی من . ئەوکاتە پەروێز . . . ئایا تۆ باوەڕ دەکەی من کە تەنها هەڵوەدای پاکی و نەجابەتی خۆیی و راستگۆیی تۆ بووم ، دەتوانم پەیڕەوی ئەو جۆرە رەوشتە ناشیرینانەی عیشقەکانی ئەمڕۆ بکەم ، یانی ئەو عیشقانەی کە بە ووشەی فریودەرانە دێنەکایەوەو بە جوولە ناشیرین و دوور لە هەموو پاکژی و نەجابەت کۆتاییان پێ دێ ؟ ئەویش من کە شەرەف و ئابڕوی خۆمم لە هەمووشتێ زیاتر خۆشدەوێ . . .

پەروێز . . . تۆ هێشتا نەتتوانیوە درك بە مەبەستی من لە نووسینی ئەم ووشانە بکەی . تۆ ناتوانی وای بۆ بچی کە من چەندە و تا چ رادەیەك پێویستم بە موحیببەت هەیە . من لە ژیانی خێزانیمدا هیچ کاتێ خۆشبەخت نەبووم . هیچ کاتێ نیعمەتی موحیببەتێکی هەقیقیم پێ نەبڕاوە . دەشێ ئەم قسەیەی من تا ڕادەیەك بەلای تۆوە سەیربێ . بەڵام ئەگەر دەتزانی باوەڕت دەکرد . کچێکی لاو ئەویش ئەوکچەی کە هیچ کاتێ پابەندی خۆ جوانکردن و رابواردن و ئاڵو والا نیە . کاتێ لە لایەنی خێزانەوە ، لە لایەنی بلوك ، دایك، خوشك و برای خۆی موحیببەتێکی نەدی ، کاتێ لە نێو ئەوانەدا کەسێك نەبوو تابتوانی گۆڕانکارییەك لە هزرو هەست و ئاواتەکانی رۆح و دڵی ئەودا بەدی بێنێ ، بێ گومان کاتێ کەسێکی دۆزییەوە کە هەموو ئارەزووەکانی خۆی لە بوونی ئەودا بەرجەستە بکا و کۆ بکاتەوە ، بەیەکجاری هەموو موحیببەت و هەموو پەیوەندییەکی خۆی دەڕژێنێ بەسەر پێ ی داو لە نێوان موحیببەت و عیشقی ئەوەو ە وە دووی

موحیبەتەکانی تر دەکەوێ. ئەو موحیبەتانەی کە لێ یان بێ بەش بووە ، یانی موحیبەتی دایك ، میهری باوك ,عیشقی براو پەیوەندیی خوشك . . .

پەروێز . . . من بەو شێوەیەی کە بۆتم شەرح کرد ، لە ژیانی خێزانیمدا زۆر خۆشبەخت نەبووم ونیم . من دایکم خۆشدەوێ بەلاَم دایکی من قەت نەیتوانیوە و نەیویستووە بەراستی بۆ من دایك بێت .

پەروێز . . . من ئەمڕۆ بۆچی دەبێ بە دزی ئەوەوە نامەکانی تۆم پێ بگات ؟ بۆچی ؟ مەگەر دایك نابێ تەنها نهێن هەڵگر و مەحرەمی نهێنیەکانی کچەکەی بێت ، مەگەر من نابێ هەموو خەم و ئازارەکانی دەروونم لەلای دایکم هەڵبرێژم ؟بەلاَم دایکی من هەرگیز بەو مەحیبەت و دڵسۆزییەی کەمن ئارەزووی دەکەم لەگەڵما رووبەروونەبۆتەوەوە هەوڵی نەداوە بەنهێنییەکانی دڵم ئاشنابێ . من باوکمم خۆشدەوێ . بەلاَم باوکی من لەکوێ دەتوانێ و بواری بۆ دەڕەخسێ ئاگای لەکچە گەنجەکەی بێ‌وە لەچ کاتێکدا ئەرکی سەرشانی باوکایەتی خۆی دەرهەق بەمن بەجێ هێناوە ؟ مەگەر باوك نابێ رێنماییکەری منالەکەی بێ ؟ من پەیوەندیم لەگەڵ براکانما هەیە بەلاَم ئەوان جگە لە ئازاردانی من وەجگە لە فەراهەم کردنی هوکاری نارەحەتی من کارێکی تر ناتوانن ئەنجام بدەن . ئەوان هیچ کاتێ لەگەڵ منا گیانی بە گیانی و یەکدڵ نەبوون و نین من تەنها لە نێو ئەندامانی خێزانەکەی خۆماندا خوشکەکەم دەپەرستم چونکە ئەو هەمیشە و لەهەموو حاڵێکدا بۆ من پارەێزە ر و پشتیوانی خۆبەختکەر بوو . جگە لە خوشکم هیچ کام لەوان ئاشنانین بە ئەرکی سەرشانی خۆیان . وە ئەو گیانی دڵسۆزییەی کە دەبێ





لە نێو تاکەکانی خێزانێکدا فەرمانڕەوا بێ ، لە نێوان ئێمە و من دا نی یە . بێگومان من لەم حاڵەتەدا ناتوانم بەختەوەر بم و ببمە خاوەنی بەهرەی موحیبەتی پاکو بێ خەوش .دەزانی چیم لە تۆ دەوێ ؟ . . . موحیبەتێکی گەورە ,عیشقێکی لێوان لێو ، موحیبەتێك کە هەر پارچەیەکی موحیبەتێکی تری پێك هێنابێ. .من لە تۆم دەوێ کە بە موحیبەتی خۆت وەلاَمی بەشخوراوییەکانی من لە ژیاندا بدەیتەوە .من لە موحیبەتی تۆدا بۆ موحیبەتی دایك و میهری باوك و پەیوەندی خوشك و برا دەگەڕێم .من لە تۆم گەرەکە لەگەڵ ئەوەی کە خۆشەویستی منی وەکو باوکرێنمای من و وەکو دایك نهێنگیرو وەکو خوشك دڵدەرەوەی من بیت .

پەروێز . . . من هەرگیز لە تۆم نەویستووە کە لە قاڵبی ووشەی فڕیودەرانەدا ئەم موحیبەتە بەدەربخەی, مەبەستی من لەبەکارهێنانی ووشەی " شیرین " ئەمە نەبووە کە تۆ سەراسەری نامەکەت بەرستەی " من تۆم خۆشدەوێ و هی تر " پڕ بکەیتەوە .

نە . . . پەروێز . . . تۆ بەهەڵە دا چوویت . . . رۆحی من تینووی موحیبەتە . ئایا نامەیەکی کورت نامەیەکی پڕ لە بەڵگە و مەنتیق دەتوانێ رۆحی تینووی من تێراو بکات ؟ وە ئایا ئەگەر تۆ لە جێگەی من بوو تیایە و بەو گوڕوتینەوە خۆشت بویستایە ،پێت خۆش بوو تکایەکی ئالەو جۆرەت لە لا بکەی ؟نامەی تۆ هەر جۆرێ بێ بۆ من جێی خوێندنەوەیە . بەلاَم ئەگەر وەلاَمێکی ئازارە رۆحیەکانی منت دا بێتەوە ، باوەڕبکە کە هەر زۆر جێی خوێندنەوە دەبێ . وە من لەکاتی خوێندنەوەیدا هەستدەکەم کە تۆ دەتوانی هەموو شتێکی من بیت و تۆ دەتوانی سەبوری رۆحی سەرکێش وبە شخوراوی من بدەیتەوە .

پەروێز . . .  تۆ هەڵە یت تۆ وای بۆ چوویت من لە خوێندنەوەی نامەیەك کە سەرا پای ئاموژگاری و رێنمیایی یە هەڵد ێیم و دەمەوێ تۆ تەنها نامەکەت تایبەت بکەی بۆ پیاهەڵدان بەقژ و روخساری مندا _ چ بیرێکی بەتاڵە _ نەهەرگیز وانیە تۆ درکت بە مەبەستی من نەکردووە .وەمن ناچارم لەمە بەدوا هەر ووشەیەك کە دەینوسم لاپەڕەیەك تایبەت کەم تەنها بۆ ماناکردنی ئەو وشەیە .تۆ هێشتا من بە " ئێوە "بانگ دەکەی .منقسەیەکم نیە . . . وەئەوە دەسپێرمە پاڵ پەروەردەی تۆ !!

پەروێز, ئیتر پاشماوەی شتەکانی تری نامەکەی تۆ وەڵامێکیان نیە وە من جگە لەوەی کە رەزامەندی بێ پایانم لە شێوازی نوسینی نامەی ئەم دواییەت دەربڕم ، قسەیەکی ترم نیە . خامەکەشم شکاوە . دەبینی کە بە چ دەست وخەتێکی خراپ نامەت بۆ دەنووسم . . . خەتای قەڵەمەکەیە نەك من . ئەو کارتە جوانەی کە بۆت ناردبووم بەدەستم گەیشت ، دنیایەك سوپاسی سەلیقەی تۆ ،زەوقی تۆ و ، ئەو پیرۆزباییەی کە لێت کردبووم ،د ەکەم .

پەروێز . . . بۆچی نوسیوتە کە بە بارودۆخی ئێستامان زۆر هیوادار نیت . مەگەر متمانەت بەمن و عیشقی من نیە و ناتوانی باوەڕبکەی کە من لەبەر تۆ ئامادەم چاو لە هەموو شتێ بپۆشم و بەختەوەری ژیان لە پاڵ تۆدا ناگۆڕمەوە بە دنیایەك وە ئەستەمە جگە لە تۆ ژیانم بە یەکێکیتر ببەستمەوە . بە ئایندە  هیوا داربە وهەمیشە لەبەر خۆشبەختی یەك کە لە چاوەڕوانی ماندایە ، چالاکی بنوێنە,, دڵنیابە ئێمە لە پاڵ یەکتردا ژیانێکی زۆر باش ،زۆر سادە ، زۆر جوان ، زۆر رێك و پێك ، زۆر سەردەمانە و زۆر هەرزان و جۆراوجۆر مان





دەبێ.

پەروێز بە داخەوە کە مامۆستای بیرکاری نیم دەنا هەڵەم لە هاوکێشەی کۆتایی نامەکەت دەگرت، بە باوەڕی من باشتربوو نامەکەت بە " بسم ا للە الرحمن الرحیم " یێك دەست پێبکردایە تا لە نێوان سەرەتاو کۆتایی یەکە یدا گونجانێك هەبێ .

پەروێز . . .  من ئەو شەوە سەعاتێك رامسپاردی کە ناوت لەسەر زەرفی نامەکە نەنووسی . ئەوکاتە تۆ بەو فیسار ناوە و ئەو دەست و خەتەی کە تەواو دیار بوو کە خەتی تۆیە و هەمووانیش پێ یان زانی خەریك بوو ئابڕوم ببەی . ئەمجارە بۆ نامەکەی تۆ زەرفێکی خۆمم نووسی و ناردم و ناوی تۆ " جەواد شەریعەتی " ە و بەڵام بیرت نەچێ کە ئەم نامە خوازراوە تەنها پەیوەندی بەزەرفەکە و ە یە نەك بەکاغەزەکەی ناوییەوە وتۆ ئێتر پێویست ناکات تەناتەت لە ژێر نامەکەتدا ، ناوی خوازراو دابنێی. ناوی خۆت بنوسە و من ناوی خۆتم زیاتر خۆشدەوێ ، زەرفەکەت دەبێ بە شێوەی تابیەت بێ چونکە ئەگەر ئەمە نەکەی, دڵنیام کە ئەمجارە دایکم زەرفەکە دەکاتەوەو و ە ئەوکاتە خۆت ئەنجامەکەی پێش بینی بکە .

پەروێز . . . سیروس بە منی گووت کە بە تۆ بڵێم کەئەگەر حەزت لێ بێ دەتوانی نامەکانت خۆت, بۆ نووسینگەی تەرەقی ببەیت و بیدەیتە دەست ئەو . نامەکانی من لەوەوە وەربگریت . بە باوەڕی من ئەم رێگایە زۆر باشە, چونکە لەوە بترازێ کە مەترسییەکی نیە ، لە نێوان تۆ و سیروسیشدا دڵسۆزییەك و هاورێ یا یەتیەك دروست دەبێ کە بێ سوود نیە . بیرو رای تۆ نازانم بەڵام ئەگەر ئەم شێوازە پەسەندناکەی ئەوا هەر دەبێ نامەکانت لە شێوەی تایبەتی دابێ .

بیرت نەچیٚ ناویشت " جەواد شەریعەتی " یە .

پەروێز . . . زۆرم نووسی ئیتر ماندوو بووم ، بەلاٚم مەسەلەیەکی بچووك ماوە وە ئەوەش ئەمەیە کە دەمەوی ٚ سوود لە هاوکێشەی بیرکاری تۆ وەربگرم و نامەکانم بەوە کۆتایی پیٚ بێنم .( پیٚت ناخۆش نەبیٚ زۆریش لە خۆت بایی نەبی و نەڵێیت کە من چەند بیرکاریٚکی لیٚ هاتووم ) من لە کاتی خۆیدا لە تۆ زیاتر کاراتر دەبم و دەتوانم بڵێم کە تۆ لەو کاتەدا ناتوانی من و خانمی مامۆستام لە یەکتر جیا بکەیتەوە.

پەروێز ، من تۆم . . .1 بئەوەندەی دنیا خۆشدەویٚ وە . . .1 ئەوەندەی گۆ ئاسمانیەکان دەتپەرستم و ستایشت دەکەم .

**خوا حافیزی تۆ**

**فروغ**

( 1950/7/10 )





## چوار شەممە 15ی تەمووز

پەروێز گیان . . . هەر ئێستا پۆستەچییەکە کاغەزی تۆی هێنا ،خۆشبەختی لە دوای خۆشبەختی . من ئەو کاتانە هەمیشە سکالأم لە کەمی نامەی تۆ دەکرد ، بەلأم ئێستا خەریکە لە زۆری نامەکانت گێژ دەبم . من هەر لە بەیانییەوە لێرە دا دەنیشم و وەلأمی نامەکانی تۆ دەدەمەوە .هیشتا کە ئەم یەکەیانم نەخستۆتە پۆستەوە یەکێکیتر دەگات. دیسانەوە قەلەم وکاغەز هەلدەگرمەوەو دەست پێدەکەمەوە . یەکسەر پۆستەچی لە دەرگا دەداو کاغەزێکی تر ، بە خوا هێندە خۆشحالم کە هەست بە دووری تۆ ناکەم .

پەروێزی ئازیزم تۆ لە نامەکانتا هەولت داوە ئاوێنەم بۆ رووناك بکەیتەوە ، بەلأم من لە هەندێ حالەتدا لەگەلتا ناکۆکم . سەرەتا لە شێوازی بەرێوە چوونی زەماوەند . پەروێز تۆ دەزانی کە هۆی راستە قینە و بنەڕەتی من بۆ چوون بۆ ئەهواز ،چی بوو ؟چونکە من هیچ شتێکم نیە . هیچ شتێ . وە بەو شێوەیە شەرمم دەکرد بێم بۆ مالی ئێوە وببمە سەرباری ئێوە .وەلەم رووەوە وای بۆ دەچووم ئەگەر بچین بۆ جێگەیەك کە ئاشنایەکمان نەبێ باشترە . جگە لەوەش خۆمان تەنها بین وە پێویستمان بەکەلوپەلی ناومالی کەسێ نەبێ ، هەر چاکترە . هەلبەت من پێشتر روونکردنەوەیەکم دەربارەی هەمان ئەو





سەفەرە داوە بەلأم هەموو ئەوانە شتی لاوەکیان پێك دەهێناو هۆی سەرەکی من لە سەرەوە بۆ تۆی شەرح دەکەم . پەروێز کاتێ من بیر دەکەمەوە کە تەناتەت جێگە نوستنێك کە شەو دەبێ لە نێویدا پشووبدەم هی من نیە، وەتەناتەت من ئەرکێکم نەکێشا .لە ئامادەکردنیدا لە شەرمما دەمرم .تۆ ئاگات لەوەزعی من هەیە تۆ دەزانی کە باوك ودایکی من هەر هیچ لە بیری منا نین و، تاکو ئێستا بچوکترین شتێکیان بە ناوی منەوە نەکڕیوە ومن دلنیام کە ئەگەر سەدسالی تریش لێرە بمێنمەوە ئەوان قەت بە خشندەیی یان لێ چاوەروان ناکرێ .بۆ من زۆر قورسە کە بەبێ هیچ شتێ تەنها خۆم بێم بۆ مالی ئێوە، لە سفرەکەی ئێوە خواردن بخۆم. لە جێگە نوستنی ئێوەدا بنووم وەببمە هۆکاری ناڕەحەتی ئێوە . هەلبەت مەبەستم لە ناوبردنی وشەی " ئێوە " تۆ نیت .من دایکی تۆو باوکی تۆ و خوشك وبراکانی تۆ دەلێم . ئەگەر تۆ تەنها بوویتایە وە لە تاقە ژوورێکدا ،بێ بوونی هیچ شتێك بژیایتایە ، بە خوا و بە مەرگی تۆ کە ئازیزترین کەسی منی هەر ئەوشەوە کە زۆرت لێ دەکردم بمێنمەوە وە چیتر نەچمەوە مالەوە ، دەمامەوە .لەمەولاش قەت نایەم .بۆ ئەوێ.من تەنانەت بۆ شەوێکیش ئامادەنیم ببمە سەربار یان وە هەر لەبەرئەو هۆیە من ناڕازیم لە هاتنی دایکت و کەسانی تر بۆ بردنم . من هیچ شتێکم نیە و شەرم دەکەم . پەروێز بەخوا ئەگەر بمکوژی نایەم .من تاقەتی وتی وتی وتانەو تەشەری کەسانی ترم نیە .من دایکی تۆ نالێم چونکە ئەو شەریفترین بوونەوە رێکە کەمن تاکو ئێستا دیوومە بەلأم بێگومان لە مالی ئێوەدا کەسانێکی تر یش دەژین وەمن نامەوێ لە بەر چاوی ئەوان خوارو خێچ وسووك دەربکەوم . پلانی من ئەوەیە

تۆ بلیتی شەمەندەفەر دەبڕی وبەیانی دێ ی بۆ ماڵی ئێمە. هەڵبەت تۆ پێشتر لەگەڵ باوکو دایکی من لە مبارەیەوە قسە دەکەیت. بەڵام ئەگەر ناڕازی بوون. بۆ من هیچ هاوسەنگێکی نیە من خۆم وەڵامیهەموو ئەوانە دەدەمەوە .ئەوجا من و تۆ پێکەوە دەچین بۆ وێستگەی شەمەندەفەر وە لە تاران دەچینە دەرەوە . ئائەوە بەرنامەی زەماوە ندوشایی ئێمەیەو لەمە بترازێ هەرگیز نایەم بۆ لای تۆ . ئیتر سەبارەت بە قەرزکردنی کەلوپەلی ناوماڵ دیسانەوەش لەم مەسەلەیە ناڕازیم لە بەرئەوەی ئێمە بە هیچ جۆرێ پێویستمان بە کەلوپەلی ناوماڵیکەسانی تر نیە . تەنانەت ئەگەر خۆشیان ئامادەبن پێمانی بدەن !

پەروێز تۆ دەتەوێ فەرش لەدایکت وەربگری, بەڵام ئێمە فەرشمان ناوێ ، من ئێستا باسی باری ژوو رو پێداویستیمان لەکەلوپەل و شمەك بۆ تۆ دەکەم . سەرەتا ئەوەی کە ئێمە لە یەك ژوور زیاتر مان ناوێ و ئەو ژوورە بە جۆرێ رێك دەخەین کە لە هەموو حالەتێکدا بۆ بەکارهێنان بشێت. ئێمە لە ئەهواز ناسیاویمان نیە وە ئەگەر هەشمان بێ بێگومان ژوورەکەمان بۆ پێشواز یکردنیان شیاو دەبێ. دەزانی بۆچی بە قەرزکردنی قاڵی ناڕازیم ؟ چونکە ئەوان هەرچەندیش قاڵی زیادەشیان هەبێ ئەوەندە نابێ کە ژوورێکی ئێمە بە تەواوەتی دابپۆشێ . چ جای ژوورێ کە بۆ نموونە (5 )دانە قاڵیچەی رەنگاو رەنگ و جیالەیەکی تیا داخراو پێت جوانیی خۆی لە دەست دەداو لە لایەکیترەوە ئێمە دەبێ هەمیشە لەو پەشۆکاوییەدا بین کە " ئای قاڵی خراپ نەبێ " ! بە دڵنیاییەوە تۆ لەو ماوەی سێ مانگەدا کە لەو ێیت هێندەی نرخی موشەممایێکی چاك پلرە کۆ دەکەیتەوە .





من باوەڕم ئەوەیە کە ناو ژوورەکە بکەین بە مووشەمما لەبەر ئەوەیژوورەکە جوانتر دەکات و پاککردنەوەشی ئاسانەو هەرزانیشە .تۆش بەم بیرۆکەیە ڕازی بە .پەردەکانی ژوورەکەمان چونکە کاتی یە لە پارچە قوماشی رەنگ جوان و هەرزان ئامادەدەبێ کە بێ گومان توانای کڕینمان دەبێت . بۆ نووستن پێویستمان بە قەرەویڵەیەکی تەختەیە .ئێمە بەرۆژ ئەو قەرەوێلە تەختەیە لە جێی قەنەفە بە کار دەهێنین. بەم شێوەیە دۆشە کەکان لە ژێرەوە دادەنێین و بەپارچە قوماشی سادە و رەنگ جوان پەردەیەکی شیاوی بۆ دروست دەکەین. من ئەم پەردەیە بە شێوازێکی جوان دەدوروم و ئەمجا رووی ئەو قەرەویڵەیە یان قەنەفەیە بە کوشن و پشتی ، جوان جوان دەڕازێنمەوە و قەنەفەکە لە سوچێکی ژوورەکە دا نزێك پەنجەرەکە دا دەنێین " ئەوەش ژووری نووستن " تاقمی کورسیمان هەیە . پێویستمان بە مێزیکیش هەیە. ئێمە دەتوانین مێزێکی کۆنە لە دوکانی کۆنە فرۆشی بکڕین و دواتر بۆیەی بکەین و رووەکەی بە سەر مێزێکی جوان کە بەکاری دەستی نەخشێنراو بێ و گوڵدانێك دابپۆشین.کورسیەکانیش لە ژوورەکەدا بە پەرش وبڵاوی ریز دەکەین وە ئەوە خۆی جوانییەکی زیاتر بە ژوورەکە دەبەخشێ . ئەمجا تەپڵەکێکی بچووکمان دەوێ کە دەتوانین بە کەمترین نرخێك بیدەین بە دارتاشێك بۆ نموونە( 5 )دانە ئەم تەپلەکانە تەختەن تەنانەت بۆ یەشیان ناوێت . من لە قوتابخانە شتگەڵێك فێر بووم کە ئێستا "بە کەڵکم دێ " .من بۆ ئەو تەپڵەکانە پشتی دروست دەکەم کە قەراخە کانی چرچ و لۆچی درێژی تێ ئەدەم ئەم پشتی یانە بە تیپی رەنگاورەنگ و بەدەمبووس بەتەپڵەکەکانەوە دەنوسێنین و

پەڕپەڕەکان تا سەر زەوی شۆڕدەبنەوە و تەپڵەکە تەختەکە بەتەواوی لە ژێریدا دیار نامێنێ و دادەپۆشێ . پەروێز نازانی ئەمانە جوان و کەمخەرجن دەتوانرێ ئەم تەپڵەکانە بەکاربهێنرێ بۆ بەردەم مێزی ئارایشتکردن لە پاڵ دەرگای هاتنە ناوەوە و لەپاڵ قەرەوێڵەی نوستن و لە پاڵ سۆپادا . ئەمجا ئێمە کەلوپەلی ئارایشت و وابێتەوە مێزی ئارایشتمان دەوێ. لێرەدا دەبێ ئێتر تۆ هونەر بنوێنی. مێزە بچکۆلەکەی خۆت بۆ یە بکەیت ، سەری مێزەکە بە قوماشێك لە هەمان ئەو قوماشەی کە داومانە بەسەر تەپڵەکەکەدا دادەپۆشین و لە بەردەم یەکێ لەو تەپڵەکانە تۆزێ دوورتر دای دەنێین بەمە بەشی سەرەکی مێزی ئارایشت دروست دەبێ . تۆ کەرەستەی باش و چاکت بەمن داوە کەپڕبەپێستی ئەم سەرمێزەیە . ئاوێنە چوارچێوە ئاڵتونیەکەش لە سەروومێزەکە وە بەدیوارەکەدا هەڵدە واسین و چەپکە گوڵێك یان گوڵدا نێکی جوان بەکاردەهێنین بۆ رازاندنەوەی مێزی ئارایشتەکە. چوارچێوەی وێنەمان هەیە و شێوازی داکوتانی دەبێ رەچاوی سەلیقەی من وتۆ پیشان بدات . من پارە کۆدەکەمەوەوتابلۆیەکی شێوەکاری لەگەڵ دووسێ دانە پەیکەر دەکڕم و تۆ خۆت دەزانی کە بەبەکارهێنانی ئەمانە سەدجار ژوورەکەمان جوانترو بە دەما ختر دەبێ . ئێمە دەبێ هەمیشە گوڵمان هەبێ و ئامادەکرد نی گوڵ ئیتر بەشێکی ئەرك و فەرمانەکانی تۆیە . کەواتە ئەو کەرەستانەی کە ئێمە دەبێ بیانکڕین وەهەڵبەت دواتر رێك و پێك تردەبێ ، بەم شێوەیەی خوارەوەیە " 1_ موشەممایەك 2 _ مێزێك 3 _ پەردەو قوماش بۆ قەرەوێڵەی نوستن و تەپڵەکەکان 4_ تەپڵەکی تەختە, قەرەوێڵەیەکی دارین ( هەڵبەت بێ ' رەنگ و زۆر هەرزان ) 5 _ شت وەکی





چێشتخانە( دەوری و کەوچك وچنگاڵ و قابلەمەی چێشت, قۆرییەکی کارەبایی لەبری سەماوەرو تەباخ یامقەڵی. ئەگەر پێویست بێ کەرەستەی چایی خواردنەوە ،)ئوتوو وشتگەلی تر کەمن نایێ یە بەخەیاڵما بەڵام بێ گومان پێویستە لەو شت و مەکانە دەوری وکەرەستەی چایی خواردنەوە دەکرێ ئاڵوگۆڕیان پێ بکرێ لەگەڵ جلوبەرگی کۆنەدا .

**پێنج شەممە 25 ی تەمووز**

**پەروێزی خۆشەویستی من ،**

ئەو شتانەی کە دەمەوێ لەم نامەیەدا بۆتی بنوسم شتگەلێکی تازە نین وە هۆی دووپاتکردنەوە یان تەنها ساتە حاڵێکی گونجاوەکە هەرئێستا بۆ ئێمە هاتۆتە پێش ، یانی ڕازیبوونی باوکم بێ هیچ قەیدو مەرجێك. رەنگە بپرسی‌چۆنچۆنی بوو کەیەکسەر باوکم بیروباوەڕی گۆڕی ؟ ئەمە خۆی بەشێکی‌جیاوازە کەدواجار ئەگەر هەلم بۆ رەخسا بۆتی شەرح دەکەم .

پەروێز . . . من بەش بە حاڵی خۆم زۆر خۆشحاڵم . گەورەترین ئاواتی من تەنها ئەوەبوو کە لە پاڵ تۆدا ژیانێکی بە ختەوەرانەم هەبێ و، هاوسەرێکی بەوەفابم بۆ تۆ. هۆکاری ئارامی و خۆشبەختی تۆ فەراهەم بکەم . تۆ ئەگەر لەلای من بوویتایە لەهەموو بیرو بۆ چوونێکی من بە ئاگا دەبووی وە ئەگەر ئەو پلانانەی کە بۆ ژیانی دا هاتووم دامناوە بۆ تۆم شەرح دەکرد ، ئەو کاتە دەتتوانی باوەڕ بکەی کە تا چ رادەیەك هاتوویتەتە ژیانمەوە و چەندە بە سەرگیان و تێڕوانینی مندا زاڵ بوویت .لەگەڵ ئەوەدا چۆن دەتەوێ خۆشحاڵ نەبم ، بیری ئەوەی کە بەم زووانە بە ئاواتە گەورەکانی خۆم دەگەم ، بیری ئەوەی کە لە پاڵ تۆدا دەژیم ،





بیری ئەوەی کەلەگەڵ تۆ داو بە کۆمەکی تۆ ئەو پلان و بەر نامانەی کەبۆ ژیانمانم داڕشتووە جێ بەجێ دەکەین ، خۆی بە تەنیایی بۆ من شیرین و خۆشی و شادی بە خشە .

پەروێز . . . . بەلاّم تۆ زۆر کەمتر لە من لە مبارەوە بیر دەکەیتەوە.

یەقینم هەیە ئەوەندەی کە من تۆم خۆشدەوێ, تۆ منت خۆشناوێ.دەزانم کە ئێستا دەپرسی " بۆچی ؟ " بەهۆی ئەوەی کە مرۆۋ کاتێ کەسێکی بەراستی خۆشویست لە رێگەی گەیشتن بەودا درێغی لە هیچ شتێ ناکات وە بە هەموو هێزو توانایەکی خۆی بەرێی مەبەستدا دەچێتە پێشەوە . بێ گومان دیسانەوەش دەپرسی “ " مەگەر من چیم کردووە ؟ "

زۆر باشە . . . تۆ بێ هیچ بەڵگەو لایەنێك و تووتە کە ناڕازیت بە پێشنیارەکانی دایکم لە حالەّتێکدا کە ئەم پێشنیارە نە زیانێکی بۆ تۆ هەیە و نە سوودێکی بۆ من . راستە کە ئەم پێشنیارە تاڕادەیەك جێ ی پێکەنینەو بێ سەرەنجامە . منیش هاو بیروڕام لەگەڵ تۆدا. منیش چەندین جار دایکم ئاگادار کردۆتەوە کە لە جێ ی ئەم مەرجە بێ سوودانە بەختەوەریی من لەبەرچاو بگرن وە دڵنیابن کە هەرگیز ئەم پێشنیارە ناتوانێ دەستەبەری شادمانی و خۆشبەختی کەسێ بێ . بەلاّم دایکی من بە هیچ نرخێ ئامادەنیە دەست لە بیروباوەڕی خۆی هەڵبگرێ . هۆی ئەم پێ داگرییەش زیاتر ئەو شکستەیە کە ئەو لەژیانی ژن و مێردایەتی خواردوویەتی . وە هەمان شکست ئەوی بەرامبەر بە هەموو پیاوان بەدبین کردووەو ناچار دەیەوێ داهاتووی کچەکەی مسۆگەر بکا .

چارە چی یە ؟ بەڵام لەلایەکی ترەوە وەك چۆن کە ئەم پێشنیارە ناتوانێ بۆ ئایندەی من بەسوودبێ . قبوڵکردنیشی بۆ تۆ زیانێکی نیە . یانی تۆ ئەگەر لە عیشق و موحیبەتی خۆت دڵنیابیت هەزاران هەزار پێشنیاری تریش لە مبارەوە قبوڵ دەکەی و هەرگیز ترس و وەهمێك لە قبوڵکردنیدا ناچێتە دڵتەوە . کەسانی تر ئەم رازی نەبوونەی تۆ بە جۆرێك لێکدەدەنەوە کە بەباوەڕی من زۆر لە هەقیقەتەوە نزیك نیە . ئەوان دەڵێن کە تۆ بەم رازی نەبوونەت دەیسەڵمێنی کە متمانەو دڵنیایت بە عیشقی خۆت نیە . دەترسی ، دەترسی. رۆژێ رابردووەکانت لە بیربچێو شێوازێ بگریتەبەر کە ئەمرۆ باوکی من پەیڕەوی لێ دەکات ، وە ئەوکاتە ناچاربیت کار بەو مەرجەبکەیت .

( سیاسەت قەدەغەیە )

بەڵام لە بۆ چوونی خودی منەوە ، خودی منیش بەو شێوەیەی کەگوتم ، وەکو تۆ ناڕازیم بەوپێشنیارە هۆی نارەزایی منیش ئەوەیە کە باوەڕم وایە خۆشەویستی راستەقینە یانی خۆشەویستی‌یەك کە لە هەوەسی گڵاووپیس بە دوور و جیاکراوە بێ، قەت لەناو ناچێ بەتایبەتی‌ئەگەردووهاوسەر لەپاراستنی ئەوعیشقەدا لەتێکۆشاندابن. کە واتە بەم وەسفکردنە ئەم پێشنیارە نەك تەنها سوودێکی نیە بەڵکو بە ڵگە یەکی ئیجابیە بۆ ئەوەی دایکم متمانەی بە تۆ نیەو لە ئایندە دەترسێ .لەم رووەوە منیش وەکو تۆ ناڕازیم بەو پێشنیارە .

بەڵام پەروێز . . . تۆ نابێ ترسێکت لەم شتانە هەبێ . ئەوەندە لە بیروباوەڕی خۆت زیانبەخش و چەسپیو مەبە ئەویش لەساتەوە خێتکی ئاوهادا ، کە ئێمە تەنانەت ئەگەر نەتوانین ، تۆ دەبێ ئێستا



ئەوپەڕی سوودی لێ وەربگریت لەلایەکی ترەوە من دەبێ متمانەم بە تۆ هەبێ . من دەمەوێ تەمەنێك لەگەڵ تۆدا بەسەربەرم.ئەگەر ئەو پێشنیارە لەلایەنی منەوە بووایە ئەو کاتە تۆ هەقت بوو ناڕەزایی دەربڕی ،بەڵام کاتێ من لە رادەبەدەر متمانە و دڵنییایم پێتە ، وەکاتێ من بەختەوەری ژیان لە پاڵ تۆدا بە هیچ شتێ ناگۆڕمەوە ، ئیتر ناڕازیبوون بەم پێشنیارە لەجێ ی خۆی نیە و ،بێ بەڵگە یە . تۆ ئەگەر بەڕاستی منت خۆش بوێ لەبەر منیش بووە ئەو پێشنیارە قبوڵ دەکەی .

پەروێزی خۆشەویستم

ئێستا ئێتر بەو حاڵ و رەوشەی کە هاتۆتە پێش ساتەوەختێکە کە تۆ دەبێ چالاکی بنوێنی .بێ گومان( بەدیعە خان )هەموو شتێکی بۆ تۆ باسکردوەو چیتر پێویست بەدووپاتکردنەوە یان ناکات . تەنها من دەمەوێ بە تۆ بڵێم کە ئەگەر ئەم هەلە لە دەست بدەین ئێتر قەت ناتوانین رەزامەندی باوکم بە دەست بهێنین .چونکە ئەو وتوویەتی یائەوەی کە ئێستا ئەو مەسەلەیە تەواو بکرێ یان من وتۆ دەبێ چاو لە یەکتری بپۆشین .باوەڕبکە کە بەشی دووەم تەحەممول ناکرێ .من هەرگیز ناتوانم بەشی دووەمم قبوڵ بکەم .زۆر حەز دەکەم تۆ ببینم و ، رووبەروو قسەت لەگەڵ بکەم . ئەگەر رۆژی شەممە کاتم بۆ رەخسا تەلەفونت بۆ دەکەم. بەراست پەروێز تۆ بۆچی ئەوەندە لەپشت تەلەفونەوە بە هێواشی قسەدەکەی . دەنگت هەرهیچ ناگاتە گوێم ، وەمن ناچارم لە بەرامبەر هەموو قسەکانی تۆدا بێدەنگ بم و ئەمەش زۆر خراپە . ئیتر قسەیەکم نیە،جگە لەوەی کە جارێکی تر بنوسم تۆم لە هەموو دنیا زیاتر خۆش دەوێ و دەت پەرستم .

خوا حافیزی تۆ /

فروغ

**پێنج شەممە** 1950/7/25





**دووشەممە** 29/7/1950

**پەروێز . . . هاوسەری خۆشەویستم**

پێم وابێ ئێستا ئیتر ئەو روخسەتەم هەیە کە تۆ بەهاوسەرم بدوێنم لەبەر ئەوەی تۆ ئەگەر بتەوێ دەتوانی لەمەبەدواوەو بۆ هەمیشە هاوسەری خۆشەویستی من بیت .نامەکانی تۆم دوێنێ بە دەست گەیشت و ، باوەڕکە لەدوای خوێندنەوە یان بەتایبەتی ئەوشتانەی کە لەپشتەوەی ئەو کارتی جەژنانە جوانە نووسیبووت ، بەجورێك نائومێدی و خەم باڵیان کێشابوو بەسەر رۆحما کە بڕیارمدا بوو ، لەدوای ئەو هەموو بێ وەفایی یەی تۆ و دڵڕەقی دایکم ، خۆم لە ناوبەرم بەلاّم دیسانیش خەیاڵیتۆ ، خەیاڵی ژیان لەگەڵ تۆ ، خەیاڵی شادییەك کە لە باوەشی تۆدا دەتوانم بە دەستی بێنم ، وای لێکردم کە بچمە لای باوکم و هەموو شتێکی بۆ باس بکەم .

پەروێز ...من لەو کاتەدا لە تاو لێشاوی خرۆشان وپێ کاریگەربوون لە تینوتاوی بێ ئومێدی و نائومێدی هەڵدەهاتم و باوەڕکە هەر ئەو گریانەی من بوو کە ژیانی منی تا ئەندازەیەك رزگار کرد .بە خواو بەوەی کە لەلای تۆ ئازیز و پیرۆزە سوێند دەخۆم کە شێتانە خۆشم دەوێی وەبەرلەوەی کە تۆ بتەوێ جێم بهێلێ ، منیش خۆم لە کۆت وبەندی .

ئەم ژیانە سەرانسەر ئازارو ناکامی یە. ئازاد دەکەم. چونکە ژیان بەبیٚ تۆ بە هایەکی بۆ من نیە .

پەروێز . . . دوای ئەوەی کە هەموو شتێکم بۆ باوکم باسکرد و هۆی نارەزایی تۆم بەو مەرجانەی بەو شێوەیەی کە خۆت نووسیبووت شەرح کرد ، باوکم وتی کە " " لە مرووەوە خەیاڵت بە تەواوەتی ئاسوودەبیٚ .من خۆم دەمەویٚ تۆ بەشوو بدەم وە هیچ کەس ناتوانیٚ دەست وەربداتە ئیش و کارەکانی من . من خۆم ناڕازیم بەو مەرجانە .بە پەروێز بڵیٚ بێت بۆ لام تا قسەی لەگەڵ بکەم . "

پەروێز . . . ئەمە دەقاو دەقی قسەکانی ئەوە ، بەلاٚم لە جیاتیدا قسەیەکی بەمن وت کە ناچارم بۆ تۆی بنوسم . سەیرکە پەروێز باوکم وتی " " راستەکە ئەم مەرجانە بیٚ ماناو نابەجیٚ یە بەلاٚم مرۆڤ بە هۆیەوە بەباشی دەتوانیٚ ریٚژەی موحیبەتی بەرامبەرەکەی بزانیٚ . " یانی ئەگەر کەسیٚ بەراستی یەکێکی خۆش بویٚ ، لەریٚ ی گەیشتن بە خۆشەویستەکەی نەك تەنها ماڵ و ئایین و مەرام و باوەڕو ئیمان و خێزان تیٚ دەپەڕێنیٚ ، بەڵکو ئەگەر داوایگیانیشی بکەن بە خۆڕایی دەیدا . کارێکم بەم قسانەوە نیە . دواجار کە بەشەرعی بووینە ژن ومێرد ، ئەوەندە کاتم دەبێت کە تۆڵەی ئەو هەموو بیٚ میهری و ئازارو خەمانەی کە پێت داوم لیٚ بکەمەوە . لە لایەنی مەرجەکانەوە خەیاڵت راحەت بیٚ ، بەلاٚم لە جیاتیدا باوکم مەرجێکی زۆر بچوکت لەگەڵدا دەکات کە تەنها مەبەستی لە پێشنیار کردنیدا ئەوەیە کە " چارەسەری کارەسات بەر لە روودانی دەبیٚ بکریٚ . " وە من دەقی ئەوەت لێرەدا بۆ دەنووسم تا زۆر بیٚ ئاگا نەبی .ئەگەر تۆ رۆژیٚ رۆژگاریٚ ، رابووردوەکانت لە بیر کرد ، وەویستت چێژ بگۆڕیت ، ئاڵ





وگۆڕێکی تازە لە ژیانتابێنیتە گۆڕیٚ، یانی هاوسەرێکی تر هەڵبژێری لەو کاتەدا من هەقم هەبیٚ کە تەلاٚقت لیٚوەربگرم. (وەلسەلام) وە نامەکە تەواو ) وە دڵنیام کە من وتۆ هە رگیز دواتر پێویستمان بەوە نابیٚ کە لە سوودو قازانج و زیانی ئەم مەرجەمان بەر بکەویٚ ، لەبەر ئەوەی من تۆم خۆشدەویٚ و بە تەواوەتی خۆشبین و هۆگری ژیانی داهاتوومم و باوەڕم وایە ژن دەبیٚ مێردەکەی بپارێزیٚ و چاودێری لیٚ بکات بۆ خۆی . ژن ئەگەر بە تەدبیر ، نەجیب ، بەوەفا, میهرەبان و خانەداربیٚ ، هەرگیز مێردەکەی جێی ناهێلیٚ. بەلاٚم بە پێچەوانەوە ئەگەر شان وشکۆی نەبوو و، نەیتوانی حەزو ئارەزوووەکانی مێردەکەی بێنێتە دی ، ناچار پیاو یش لە ژن و ماڵ هەڵدیٚ و لێرەدا هەموو کەم و کوڕییەکان لە ئەستۆی ژنە . ( بەلاٚم سەبارەت بە مارەیی)

یەکەم ـــ

دەبیٚ بە تۆ بڵێم کەمارەیی بڕێك نیە کە تۆ بتەویٚ بەنەختی بیدەی ،یانی پەیوەندی بە توانای دارایی تۆ وە نیە .

دووەم ـــ

لە بەرامبەر ئەم هەموو میهرەبانی و لوتفیٚ کە باوکی من بەرامبەر بە تۆ دەینوێنیٚ .ئەگەر تۆ بتەویٚ بڵێی نە و ، بڕی مارەییەکەش دابەزێنە ئەوا ئەوپەڕی بیٚ ویژدانیت کردووە . وەدەبیٚ پێتی بڵێم سیروس ئاغا بە پلەوپایە باری ژیانی لە تۆ خراپترو کیسەکەشی بە تاڵترە تەنها شتیٚ کە هەیە " " تۆ قژ دەبینی و، من پێچی قژ . " یانی تۆ روخسار دەبینی و ، هیچ ئاگات لە ناوەوە نیە . بەلاٚم ئەو باوەکو توانای دارایی نەبوو ،

لەبەرخاتری ( پوران) هەموو ئەو شتانەی قبولّ کرد کە لێیان داوا کرد بوو .جیا لەوانە کاتیّ باوکم دەلّیّ من هیچم ناویّ وە لەجیاتیدا هیچ شتێکیش نادەم بە کچەکەم ، پێویست ناکات ئێوەنرخی ئاوێنە و جیّ مۆم و ئەلّقە لە پشت بەلّگەنامەکە, تۆمار بکەن .بەلاّم لە جیاتی هەموو ئەوانە، ئەوان هەمان ئەو بڕە مارەییەیان داناوە کە بۆ پورانیان دانابوو. وە من لێرەدا دەبیّ بلّێم باوك ودا یکی من لە دیار یکردنی ئەم بڕەدا لەمن زیاتر دەسەلاّتیان هەیە. تۆ دەتوانی لە مبارەوە ئەگەر ناڕازیت لەگەلّ باوکم قسە بکەی .شتێکی تر کە دەمێنێتەوە مەسەلەی شێوازی سازدانی مارەبڕینە کە بەو شێوەیەی کە ئێوە حەزتان لێیە , دەبیّ زۆر بیّ دەنگە دەنگ و ، لە نێوەندێکی ئاسایی وەك دانیشتنێکی ئەلّقە گۆڕینەوەو نیشانە کردن بە ڕێوەچیّ و ئەمە بە تەواوەتی وەك حەزی ئێوەیە . " ئێوە " لە رووی خەرجیەوە زۆر ناڕەحەت نەبن ، من هەمیشە بە قەد داهاتیّ کە هەمە خەرجدەکەم وەهەرگیز ئامادە نیم لەوە زیاتر خەرج بکەم کە ئێوە پێتان هەلّدەسوڕیّ. بەم شێوەیە هەموو رازین ئەوسا ئیتر لە هیچ لایەکەوە جیّ ی نیگەرانی نامێنیّ . ئێستا " ئێوە " ئەگەر بەراستی منتان خۆشدەویّ, دەتوانی ئیشی بۆ بکەیت و شادمانیم بۆ بگەڕێنیتەوە .

پەروێز . . . نازانم بۆچی هەرلە خۆوە تۆم بە "ئێوە " دواند, رەنگە لە رووی رێزێکەوە بێت کەدەمەویّ بە مێردی ئایندەمت دابنێم!!

بەلاّم دەبیّ بلّێم کە " تۆ " لە دلّی منەوە نزیکترە .

پەروێز . . . من چیتر قسەیەکم نیە . هەموو شتێکم بۆ تۆ نووسی وەتا ئەوشوێنەی کە دەمتوانی و توانام بوو لە هەلّگرتنی کۆسپ و





گرفتەکاندا تێکۆشام . چونکە خۆشم ویستی ، چونکە دەمپەرستیت بەلاّم تۆ . . . ئێستا بە تەواوی سەربەستی و منیش وەکو تۆ هیچ کاتیّ ئازادی لە کەسێك زەوت ناکەم. دەتوانم هەرکیّیەکت دەویّ خۆشت بویّ و حەزت لەکیّیە بیهێنی .تۆ دەتوانی لەم تارانە گەورەیە دا هەزاران هەزار کچی باشتر و جوانتر لەمن, بدۆزیتەوە و لەئامێزی ئەوانەدا نەك تەنها من بەلّکو هەموو ئەو ئازارو خەمانەی کە لەماوەی چوار مانگدا بەمنت داوە لە بیربەریتەوە . بەلاّم دلّنیابە ، دلّنیابە هیچ کامیّ لەوانە تۆ یان هێندەی من خۆش ناوێت و بەختەوەرییەك کەمن دەتوانم بە تۆی ببەخشم ، تۆ لە یەك هیچ یەکیّ لەوانە هەستی پیّ ناکەی . من لەرێگەی گەیشتنم بەتۆ کە ئامانج و مەبەستی بەرزی ژیانم بووی ،تائەو ڕادەیە هەولّ و کۆشش و خەباتم کرد . ئێستا تۆش ئەگەر بەراستی منت خۆشدەویّ ، لەمە زیاتر مەسەلەکە بە سەرزارەکی ناگری و بیّ بەزەییانە پاش قول نادەی لە هیواو ئارەزووەکاتی من و ، هۆکاری نابووت بوون و مەرگم فەراهەم ناکەی . من تۆم خۆشدەویّ ، زۆریش خۆشم دەوێی ، ناتوانم لە بیرت بکەم .ناتوانم بیّ تۆ درێژە بەژیانم بدەم ، بەلاّم تۆ دەتوانی تەمەن و شادمانیم پیّ ببەخشی ، تۆ دەتوانی ژیانم پڕ لەشادی و بەختەوەری بکەی . تۆ دەتوانی هاوسەری من بی و تۆ دەتوانی من و ژیانی سەراپا پڕ لە بیّ بەشی و ناکامی من کە لەلێواری لە ناوچوون دایە ، رزگار بکەی .تۆ دەتوانی منت خۆش بویّ ،

بەلاّم ناتەویّ . بۆچی ؟. . . . نازانم بۆ ________________

ئەگەر دەتوویست دەهاتی و ________________

من ئەوەی کە دەمویست بۆ تۆم نووسی وەئێستا تۆ دەدەمە دەست عیشقێك کە بەرامبەر بەمن نیشانی دەدەی تا ئەو عیشقە تاچ رادەو تا چ ئەندازەیەك هاتبێتە نێو بوونی تۆوە . . . ئەوەش نازانم .

پەروێز . . . نوسیبووت "" ئامادەم لەرێی پاراستنی تۆدا هەموو جۆرە فیداکارییەك بکەم . نە, پەروێز من پێویستم بە فیداکاریی تۆ نیە .تۆ زیندووبەو بژی لەبەر خاتری کەسانێك کە خۆشیان دەوێی . بژی بەڵام . .. گوڵی خۆت بپارێزەو مەیەڵە ئەو گوڵە بەخونچەیی بژاکیٚ . دڵنیابە کاتیٚ ژاکا تۆ پەشیمان دەبیتەوە .

پەروێز ئەمە دوایین قسەی منە ،ناچارت ناکەم . تۆ سەربەستی ، زۆریش سەربەستی . ئەگەر منت خۆشناویٚ ، ئەگەر ناتەویٚ لەگەڵ مندا بژیت منیش زۆرم لەسەرت نیە ، پەندێکی دیار هەیە کە دەڵێن " " بۆ کەسیٚ بمرە ،کە بەتەنگتەوە بێت "من تا ئەو رادەیەی کە دەمتوانی یارمەتی تۆ بدەم ، دام . من تا ئەو شوێنەی کە لە توانامابوو بە تەنها و ، لەرێی گەیشتن بە ئامانج و مەبەستم یانی" تۆ "هەوڵمدا. ئێستا کاتیٚ تۆ دەرهەق بە خۆم کە متەرخەم و دەرهەق بەو زەحمەتانەی کە .کێشام هەقنەناس دەبینم . لە مەزیاتر ناتوانم لەبەرامبەر تۆدا خۆڕاگربم . منیش کە سایەتیەکم هەیە . لەرادەبەدەر ، بە کەسێتی خۆم پەیوەستم و هەرگیز ئامادەنیم ئەوە لەدەست بدەم . من تائەو رادەیە ئامادەبووم خۆشم لەبەرامبەر تۆدا بچووك و بێچارە نیشانە بدەم . یانی ئەوە عیشقی تۆ بوو کەوای لە من دەکرد لەهەموو شتیٚ تەنانەت لەکەسێتی خۆشم دەربچم وتیٚ بپەڕێنم. بەڵام لەمەزیاتر ناتوانم و شان و شکۆ و ئابڕوی خێزانیی من رێم پیٚ نادا دیسانەوەش لەتۆ پیٚ داگربم. نە . تۆ ئەگەر منت خۆشبویٚ دێیت و





هەردووکمان لە پاڵ یەکدا دەست بە ژیانێکی نویٚ دەکەین . بەڵام ئەگەر نە و ناتەویٚ و ئارەزووت نیە ، دەتوانی راشکاوانە بڵێی ومن جگە لەوەی بەدنیایەك حەسرەت و ناکامی یەوە چاو لەتۆ بپۆشم و دواتر تەمەنێکی سەراپا پڕ ئازارو بەدبەختی, بەڕێزگرتن لەعیشقی تۆ بەتەنیایی بەسەر ببەم و وەلە هەموو ئەوماوەیەدا بەختەوەری تۆ و هاوسەری ئایندەتم لەخوا بویٚ و داواکەم ، کارێکی دیکەم نیە . پەروێز ئەگەر دەتوانی لەبیرم کەی ، ئەگەرتوانات هەیە بیٚ بەزەییانە لە ئاوات و ئارەزووەکانی من هەڵدەی ، لە بیرم کە . ئەگەر ناتوانی و ئامادەنیت لەبەرامبەر ئەم هەموو هەوڵ و تێکۆشانەی من پاداشتێك بدەیتەوە ، دیسانەوەش جێم بیڵە ٚ. من نەك تەنها لەتۆ نارەزایی دەرنابڕم. بەڵکو ئەو هەقە بەخۆم نادەم کە بشڵێم بۆچی ؟بۆچی ؟ چونکە منت خۆشناویٚ .

پەروێز ئیتر ناتوانم شتێکت بۆ بنووسم ، لەوەش بترازیٚ کە دەستم ئێشی دیٚ ،پەردەیەکی فرمێسکیش بەری دیدەکانمی داپۆشیوە . ئەفسوس کە ئەگەر تۆ نەتەویٚ ئیتر ئەم دەستە ناتوانیٚ لە نێودەستی تۆدا جێگەیەك بگریٚ و هەموو ئازارەکانی خۆشی فەرامۆش کا .وەئەم دیدەیە هەرگیز بەو هەموو هیواو ئارەزووەوە ناڕوانێتە دیدەکانی تۆ ,وە لە نیگای تۆدا ، مەستی تەمەنێك _تەمەنێکی پڕلەخۆشی و شادمانی بەدی ناکات دەزانم کە زۆر بەدبەختم ئەگەر نەمتوانی لەدوای تۆ بژیم و مەرگم هەڵبژارد, تۆ هەرگیز لۆمەم نەکەی . چونکە کاتیٚ مرۆۋ مایەی ژیانی لەدەستدا . ناچارە بمریٚ . ژیان بیٚ بوونی تۆ بۆ من بەهایەکی نیە .کاتیٚ مردم ئاسوودە دەبم .زۆر ئاسوودە . نە لەبیٚ وەفایی تۆ ئازار دەکێشم و نە لە دڵڕەقی دایکم . وەتۆ لەو

حالەتەدا هەرگیز ناتوانی بە نامە خەماوییەکانی خۆت ، بێ بەزەییانە ئازاری مشتێ گۆشت و ئێسکی بێ گیان بدەی . بەڵێ پەروێز کاتێ تۆش منت جێهێلا ٚمن دەمرم قوڕ لەوە خەستتر ئیتر چی !

خوا حافیزی تۆ, یاتەنها بۆ ئەمڕ ۆ یا بۆ هەمیشە ئەمەش پەیوەستی تەواوی بە بڕیاری تۆوە هەیە .

**فروغ**

من بەهۆی تەلەفونەوە لە بڕیاری تۆ بە ئاگادێم رۆژی پێنج شەممە تەلەفونت بۆ دەکەم .

**فروغ**

1950/7/29





**دووشەممە** ( 1950/8/7 )

**پەروێز ی من** . . .

ئەگەر وشە د ە تیوانی بەڕاستی پێناسی واتای خۆی بێ ئەوکاتە منیش بەئاسانی دەمتوانی پلە و رادەی خۆشبەختی و شادمانی بۆ تۆ دیاری بکەم . چ شادمانییەك لەمە بەرزترە ؟ئایا بوونی تۆ خۆی بەتەنها بۆ من شادمانیەکی گەورە نییە ؟ وە ئایا ژیان لەپاڵ تۆدا نابێتە ترۆپکی ئاواتی من ؟من داوات لێ دەکەم, لەتۆ ، کە ئەوەندە باش و میهرەبانی ، کە رابوردوو لەبیر بەریتەوە . مەگەر ئەو رابوردووانە جگە لە دەردو ئازار بەولاوە بەرهەمێکی بۆ ئێمە هەبوو ؟کەواتە بۆچی دەبێ دیسانەوەش بیر لەرابوردوو بکەینەوە و ئەمجاش لەبەرئەو هەڵەو کەموکوڕییانەی کە کردوومانە ئازار بچێژین . من ئێستا لەوهەموو بەسەرهاتە تەنها شتێکم لەبیرە و شتێك لەبیرم دەرنەچووە .وەئەوەش عیشقی تۆیە .عیشقێ کە بۆ من لە هەواو تیشکی خۆر زەروری و پێویسترە .

پەروێز . . . من دانی پیادەنێم کە هەڵەم بەسەر دا رۆیشتووەو بێهوودە تۆمەتی بێ وەفاییم داوەتە پاڵت بەلاٌم تۆ خۆت باش دەتوانی دەربارەی من بڕیاریدەی کاتێ بارودۆخی منت خستە بەرچاوت درك پێکردنی ئەم مەسەلەیەش بۆ تۆ ئاسان دەبێ ودەزانی

کەمن گوناهێکم نەبوووە ونیە . من هەمیشە تۆم خۆش ویستووە تەنانەت لەدوای نووسینی ئەو نامەیەش ، تۆ بەهەمان هێزو تواناو دەستەلاًتەوە لە دڵی منا مابوویتەوە .من و تۆ هەردووکمان چەند هەڵەیەکمان کردووە . هەردووکمانیش دەبێ لێبووردوییمان هەبێ و ، رابووردووە کان لەبیر بکەین . تۆ چیت لە من دەوێ _ ئایا موحیببەتی بێ پایانی من لە ئایندەدا هۆکاری ئاسوودەیی و هێمنیی بیری تۆ.دەستە بەر ناکات. من هەمیشە حەزمکردووە کەبۆ مێردەکەم هاوسەرێکی وەفادار و میهرەبان بم وەدیسانەوەش ئاواتم بووە کە هاوسەرەکەشم بەرامبەر بەمن دڵسۆزو میهرەبان بێ. لە نامەکانی داهاتوومدا هەوڵدەدەم ئەو چاوەڕوانکردنانەی کەدەتوانم لەهاوسەرەکەمەوە هەم بێ، بۆ تۆی باس بکەم و" تۆ ئاشنا کەم بەئەرکی سەرشانت ئەگەر ئاشنانیت " وە هەمان داواکاریم لە تۆش هەیە .پەروێز ئێمە لە پاڵ یەکدا ژیانێکی شیرینمان دەبێ و تۆ دەبێ لەبەر خاتری منیش بووە چالاکی و هەولەکانی خۆت زۆر بکەیت .دڵنیابە ماندوو بوونەکانت هەموویان جێ ی قەرەبوو کردنەوەیە و من کاتێ توانیم و توانام هەبوو پاداشتی ئەرك و ماندوو بوونەکانی تۆ دەدەمەوە .

پەروێز تۆ دەبێ باوەڕ بەو راستی یە بهێنی کە یەکەمین و دوایەمین عیشقی منی و زیاد لە هەمیشە خۆشم دەوێ ی و بەختەوەری تۆ ئەوپەڕی ئاواتی منە .؟ دەتەوێ باوەڕکە وە دەشتەوێ باوەڕمەکە . سەربەستیت

خوا حافیزی تۆ فروغ





وەلاًمی نامەکەم لەگەڵ خۆت ببە بۆ فەرمانگەی رۆژنامەی" تەرەقی "و بیدە بە سیروس یان بە پۆستدا بۆ ئەویبنێرە . لەسەر زەرفەکە بنوسە نوسینگەی رۆژنامەی "تەرەقی"رۆژنامەی " ئا سیای جوان" کاك سیروس بەهمەن وەریدەگرن . ناوی خۆتیش لەخواری زەرفەکەوە بنوسە ئەگەر پێویستت بەناوی خوازراو نیە. بەلاًم من پێم وایە رێگەی یەکەم باشتربێ و زووتر بەدەستی من بگات .

فروغ

**پەرویز . . .**

بەخوا ئەگەر ئەمڕۆ نامەکەی تۆم بەدەست نەدەگەیشت ، لێت دەتۆرام . دووهەفتە چا وەڕوانیی گاڵتە نیە ، ئەوەش بۆ من کە گەورەترین دڵخۆشیم خوێندنەوەی نامەکانی تۆیە . بەڵام سەرەنجام خوا رەحمی کردو نامەیەکی زۆر شیرین و کەمێك تاڵی تۆ ئەمڕۆ بەدەستم گەیشت. پەروێز بەخوا تۆ زۆر ئەشکەنجەم دەدەی, دەزانی من بڕیارم دابوو ئیتر هەرهیچ بیر لە رابوردوو نەکەمەوە دەنا منیش دەزانم کە گللەیی لە تۆ بکەم و منیش دەتوانم باسی ئەو هەلە وکەموکوڕییانەی کە تۆ کردووتن بکەم و کەمێك قەناعەتت پێ بکەم بەڵام تۆ _نازانم چی بڵێم. لەپێش هەموویانەوە دەبێ مەسەلەی نامەکەت بۆ روون بکەمەوە . پەروێز قسەکەی تۆ راست و دروستە .منیش مەبەستم هەر ئەوە بوو. راستە من بەتۆم وتووە ناچاریانکردم، بەڵام تۆ نازانی بە چ شێوەیەك. ئاخر پەروێزی ئازیز خۆ ناچارکردن تەنها ئەوە نیە کەکێردێك بەدەستەوە بگرن و، سەرم بەرنە ناوباخچەکە و بڵێن یا بنوسە، یا سەرت دەبڕین . نا ،هەندێ جار بەبزواندنی هەست و پەروەردەکردنی هەستی لەخۆبایی بوونێك ، زیان بەرکەوتوو و، تێکشاو ، وا لەمرۆڤ دەکەن کە کارو کردەیەك ئەنجام بدا کەنەك تەنها رازی نیە، بەڵکو لەکاتی ئەنجامدانیشدا،





ناتوانێ بزانێ کە چی دەکات .منیش گیرۆدەی رەوشێکی ئاوهابوو بووم . ئەوان لەدوای ئەوەی کە بەسەرزە نشتکردن و تانە لێدان بە من ، هەستی منیان تارا دەی پێویست بزواند ، ئەوکاتە. منیش لە ژێرکاریگەری ئەو هەست و نەستانەی کە ئەوان هەڵیانخراند بوو ، دەستم دایە نوسینی ئەو نامەیە . لە راستیدا ناچاریانکردم. من لەدەست هەست و نەست ولە ژێر فشاری هەڵچوونی رۆحی‌دا ئابەم هۆیەوە هەڵاتم .لەکاتێکدا کە هەرگیز رازی نەبووم و ئەمە کارێك نەبوو بە مەیلی خۆم بێ . یانی لەو ساتەدا ئەقڵ فەرمان رەوایی کارەکانی منی نە دەکرد .وەکارێکیش کە لەرووی بێ ئەقڵیەوە ئەنجام بدرێ ، ناتوانرێ بە بەڵگەی درۆزنی و خۆنواندن بۆ کەسێ لە پێنوس بدرێ .جارێکی تریش بە تۆم وت پەروێز بە خوا درۆناکەم من یەکسەر لە دوای نووسینی ئەو نامەیە و ناردنی ئەو نامەیە بەرادەیەك پەشیمان ببوومەوە کە دەمویست بچم بۆ فەرمانگەی پۆست و نامەکە وەربگرمەوە بەڵام کە بینیم ئەو کارە مەحالە بڕیارم دا تەلەفونت بۆ بکەم و تکا بکەم ئەو نامەیە نەخوێنیتەوە و بۆ منی بنێریتەوە. تەنانەت دووسێ جاریش بە نیازی تەلەفون کردن لەماڵ هاتمەدەرەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی کاتەکە کەمبوو، وەلەهەر جارێکیشدا بۆ تەلەفونکردن بۆ تۆ دەبێ سەعاتێك دوا بکەوم کە نەکرا و ئەنجامەکەشی خۆت دەیزانی . ئەم مەسەلەی نامەیە ، بەو جۆرەی کەخۆت نووسیووتە منیان ناچارنەکردووە یانی راستەوخۆ ناچار یان نەکردووم بەڵکو بە بزواندنی هەستی من وایان لێکردم کە بکەومە هەڵەوە.

جارێکیش تکام لێکردی ئەم مەسەلەیە فەرامۆش بکەی وە تۆ وەك ئەوەی کە بیرت چووە دیسانەوەش قسە لەم نامە جەهەنمییەی من دەکەی.من لەمەبەدوا ئامادەنیم تەنانەت یەك خولەك لەکاتم بەبیستنی هەرچی پەیوەندی بەم نامەیەوە بێت, تەرخان بکەم .هەر ئەوەو بەس.
( بەڵام سەبارەت بە وادەو بەڵێنی سەر خەرمانیی. سەرەتا ئەوناز ناوەی کە تۆ بەخشیوتەبەو ، زۆر شیاونیە. نزیك نیە لە هەقیقەتەوە .چونکەئەو وادەیە راست ودروست وجێگیرە .تا ئەو کاتەی کە تۆ باری ئابووریت کەمێ رێك بخەیت و ، بتوانی پارە و پولێك کۆ کەیتەوە ..پەروێز لەگەڵ ئەوەی کە دەزانم زۆرحساب بۆ قسەکانی من ناکەی دیسانەوەش دەیڵێمەوە کەدایکم چیتر دژایەتێکی نیە مەسەلەی مەرجەکانی خستۆتە ئەولاوە (ئەویش لەبەر خاتری من).کەواتە تۆ لەو بارەوە نیگەران مەبە. تاڕادەیەك هەموو را زین . ئەمەش راپۆ رتی من. دەتەوێ باوەڕکە, دەشتەوێ باوەڕمەکە. من تەنها ئەوە دەڵێم کەدوا جلر نەڵێی بۆچی پێت نەوتم.

پەروێزی ئازیزم, جارێك بەتۆم گوت کەبۆ سەرکەوتن پێویستت بە پارەیە ئەگەر من خۆم کەمێ گەورەتر بوومایە و گەیشتبمایەتە تەمەنی یاسایی ، ئەم گرفتەشم لە قازانجی تۆ چارەسەر دەکرد ، بەڵام بە داخەوە کە ئیتر لێرەدا من شتێکم بە دەستەوە نەماوە. وەلەراستیدا ئەم بەندو کۆتە خێزانییانە بۆ من گرفتێکی گەورە و کۆسپی بەردەم بەرەو پێشەوە چوونی کارەکانی منن. من لەبەر خاتری ئەوەی کە تۆ دەرفەتێکی زیاترت هەبێت وەباشتر بتوانی ئیش بکەیت و چالاکی بنوێنی ماوەی چوارمانگەکە درێژ دەکەمەوە بۆ شەش مانگ یانی تابە هاری ساڵی ئایندە. ئەم مەسەلەیەم لەگەڵ





باوکمدا خستۆتەروو ، ئەو یش رازییە . پەروێز تۆ ئەگەر مانگی 150 تمەنیش پاشەکەوت بکەیت ، لەدوای تێپەڕ بوونی شەش مانگ 900 تمەن پارەت دەبێت. من باوەڕ ناکەم تۆ جگە لە خەرجی جلوبەرگ و وردە خەرجیەکانی تر. خەرجی زیاترت هەبێت . کەواتە بە ئاسانی دەتوانی مانگی 150 تمەن لەمووچەکەت بخەیتە لاوەو جگە لەوەش کاتێ مرۆۋ ئیرادەو ورەی هەبێ نەك بە "9" مانگ بە مانگیکیش دەتوانێ ئەوەی کە ئیرادەی لە سەربووە بەدەست بێنێ . من بەتۆم گوتبوو کە پێویست بە زیاترو لە 500 تومەن ناکات ، بەڵام تۆ لە نێوان ئەم دوو بڕەدا هەر بڕێك کە دەتەوێ پاشکەوت بکە ، چونکە پێویستە . منیش وەکو تۆ دژی تەشریفات و ئاهەنگ و جوانکردن و ئالە و بابەتانەم . وە ئەوانە لە حالەتێکدا بە شایستە دەزانم کەمێردەکەم پارەدار و دەولەمەند بێ بەڵام کاتێ دەبینم تۆ هێشتا ئەوەندە توانای دارابیت نیە کە بتوانی بۆ نموونە ئاهەنگێکی گەورە بگێڕی ، نەك تەنها رلزی نابم بەڵکو تا پێم بکرێ هەوڵدەدەم بارێك لە سەرشانت دابگرم و بە رلە خەرجکردنی زیادە و بێهودە بگرم . کە واتە تۆ هیچ کاتێ نابێ لە مڕووەوە نارەحت بی وە بەو بڕەی کە من دیاریم کردووە ناڕازی بی . چونکە من هەموو حسابێکم کردووە . تا ئەو شوێنەی توانیوومە مەسەلەکەم لە قازانجی تۆ کۆتایی پێ هێناوە . خراپیشی لەو ێدایە کە باوك و دایکی من بایەخێکی زۆر بەم شتانە دەدەن و بۆ نموونە کاتێ باوکی من بە تۆ دەڵێ من بە تەشریفات ناڕازیم مەبەستی ئەوەنیەکە هیچ ئاهەنگێك ساز نەدرێ . من لەتۆ باشتر ئەو دەناسم. ئەو تەشریفات بەوە دەزانێ کە بۆ نموونە لە فیسارە کافتریا ئاهەنگێ بگێڕن و هەزاران

تمەن خەرج بکەن .دژی ئەوەیە ، نەك ئاهەنگیٚ کە لە مالەٚوە دەگیٚڕدریٚ . وە نەبوونیی بە سوکایەتی کردن بە ئابڕوو نامووس و شان و شەوکەتی خیٚزانیی خۆی دەزانیٚ . وە ئەوەی کە پیٚشنیاری بە تۆ کرد لە سەری بوەستی ، مەبەستی سەرەکی ئەوە بووە کە تۆ بتوانی پارە و پولیٚ کۆ بکەیتەوە و ئاهەنگیٚکی بچووك بگیٚڕی .سەیرکە پەرویٚز بەباوەڕی من مرۆڤ بە کەمترین بڕە پارە دەتوانی باشترین کار ئەنجام بدات وە باشترین شت فەراهەم بکات .بە مەرجیٚ کە کەمیٚ سەلیقەو هەندیٚك هەستی حەز لیٚکردن و داهیٚنانی هەبیٚ . من بەلیٚنت پیٚ دەدەم بە 200 تمەن پارە دانیشتنیٚك ریٚك بخەم کە هەموو باسی بکەن وە بە دلیهەموو ان بیٚ تا تۆ چ بیرو باوەڕیٚکت هەبیٚ . بەلاٚم من بە وشیٚوەیەی کە وتم زۆر پابەند نیم بەو شتانەوە وەتەنها دەمەویٚ دایك و باوکمم رازی کردبیٚ . من هەولٚدەدەم هیٚندە خەرج کەم کە لە توانای تۆ دابیٚت وە تۆ نابیٚ هەرگیز لەم مەسەلەیە نارەحەت بی . تۆ پیٚم بلیٚ چەند دەتوانی بۆ ئەو مەبەستە خەرج بکەی , تامنیش کەمیٚك بیرکەمەوە و ریٚگە چارەیەك بدۆزمەوە بەلاٚم ئیٚستا بابچینە سەر گللەیی و سکالاٚکان . . .

پەرویٚز تۆ هەمیشە هەولٚدەدەی گللەیی لە من بکەی تا ئەندازەیەکیش هەقتەو من هەم دانی پیٚدا دەنیٚم کە هەندیٚ کات دوچاری هەلەٚ دیٚم بەلاٚم دەبیٚ ئەوەشت لە بیربیٚ کە فروغ پیٚغەمبەر نیە و مرۆڤیٚکی سادە و ئاسایی و مەحالە لە ژیاندا تووشی هەلەٚ و کەموکوڕیی نەیەت .بەلاٚم باوەڕکە پەرویٚز, من هیچ کات نەمویستووە درۆت لەگەلٚ بکەم وە بە بیٚچەوانەی ئەوەی کە وتم هەلٚس و کەوت کەم بەتابیەتی بەرامبەر بە تۆ . لەراستیدا ئەگەر بمەویٚ درۆ لەگەلٚ تۆ.





بکەم نارەحەت دەبم چونکە تۆم خوشدەویٚ وە تۆ بە هاوسەری داهاتوو و هاوبەشی ژیانم دەزانم و لەبەر ئەوە ئەگەر درۆت لەگەلٚ بکەم وەك ئەوە وایە کە خۆمم هەلٚخەلٚە تاندووە . لەبەرئەوەی تۆ هاوبەشی ژیانی منیت لە نیٚوانی من و تۆ دا نابیٚ

بچوکترین پەردەو دیواریٚك هەبیٚت . وەئیٚمە دەبیٚ دەرهەق بەیەکتر لە رادەبەدەر دلٚسۆز و میهرەبان بین .کەوا تە ئەگەر من درۆ لەگەلٚ تۆ بکەم ئەوە بەگوناهو خیانەتیٚکی گەورە لە قەلٚەم دەدریٚ . وەیان مەسەلەیەك لە تۆ بشارمەوە .راستە من قسەگەلیٚکم کردووە کە دوا تر بە پیٚچەوانەی ئەوەوە کارم کردووە بەلاٚم بە خوا پەرویٚز, خەتای من نیە . مرۆڤ هەندیٚ کات لە حالەٚوەختیٚکدا یە کە ناچار دەبیٚ بەپیٚچەوانەی حەزوو رازیبوونی دلیقسە گەلیٚك بکات وە یان تووشی هەلەٚیەك بیٚ . بەلاٚم تۆ وەك ئەوەی کە تەنها چووبیتە لای قازی کارو قسەکانی خۆتت فەرامۆش کردووە.من گللەیەکی گەورە و زۆریش گەورەم لە تۆ هەیە . بڕیارم دابوو ئەوە قەت بە تۆ نەلیٚم بەلاٚم تۆ وام لیٚ دەکەی ئیٚستا بەو جۆرەیە. لە رقی تۆ منیش دەیلیٚم بەلاٚم زۆر توڕە مەبە .باش بیر بکەوە وئەمجاوەلاٚمم بدەرەوە . دوایین جاریٚك کە بۆ مالی ئیٚمە هاتی لەبیرتە ، تۆ لەو شەوەدا زۆر قسەت کرد کە زۆر بە دلی من نەبوو . بەلاٚم کاتیٚ کە دەتویست بڕۆی قسەیەکی سەیرت دەرپەڕاند کە بەخوا ئەگەر تۆم خۆشنەویستبا وە ئەگەر تۆ بەهاو ، گرنگییەکت لام نەدەبوو. هەر لەویٚدا تۆلەٚم دەکردەوە . بەلٚگە و هۆی ئەوەم لە تۆ نەویست .بەلاٚم من هیچم نەوت تەنها لەبەر تۆ وە دواتریش هەولٚمدا ئەم مەسەلەیە فەرامۆش کەم وەکەمتر بیری لیٚ بکەمەوە .بیٚ گومان ئیٚستا لە خۆت دەپرسی " بۆ چی,. مەگەر من

چ قسەیەکم کردووە ؟ بیرت چووە ، هەقیشتە لە بیری بکەیت لەبەر ئەوەی کە قسەی خراپ کەمتر لە بیری مرۆڤدا دەمێنێتەوە . خۆت ئامادەکە ئێستا دەڵێم " یەك ، دوو، سێ"بە ئاگابە" "تۆ وتت فروغ من چیتر (ئامادەنیم ) نرخی ئاوێنە و مۆمدا ن لە پشتی قەوالەی مارەیی بنووسم و وەمارەیی کەیشم تەنها "لەبەر خاتری تۆ زیاد کردووە . "بەخوا من تێ ناگەم مەبەستی تۆ لەگوتنی ئەم قسانە چی یە! تۆ ئەگەر منت خۆشدەوێ بۆچی بەو پەڕی حەزورازی بوونەوە قبوڵی ناکەی و ، ئەگەر پێت خۆش نیە چی پێویست دەکات لەدوای ئەو هەموو گفت و گۆیانە تەنها لە بەرخاتری من قبوڵی بکەیت . لە حاڵەتێکدا کە ئەگەر تۆ منت خۆشنەوێت ، منیش لەلای تۆ خاترێکم نابێت کە واتە چی ! ئایا تۆ ویستوتە بەزەبیت پێمابێتەوە وە بەڕێز گرتن لە عیشقی من دەستت داوەتە ئەو کارە؟وە ئایا ئەو ووشەیە "لەبەر خاتری تۆ " ، زیاتر مانای بەزەیی پیا هاتنەوە نادات تا عیشق ؟ بەخوا کاتێ بیر لەم شتانە دەکەمەوە کاتێ ئەم قسە سەیرانەی تۆ بەبیردێنمەوە نەك تەنها لە ژیان بەڵکو رقم لە خۆم ، لە خۆم دەبێتەوە کە ئەوەندە زەبوون و بێچارە بووم . تۆ خەیاڵ دەکەی کە من پێویستیەکم بە بەزەیی هەیە ؟ ئەو هەرگیز ، هەرگیز .من ئەم عیشقە شێت و سەرکێشەم لە دڵما دەتاسێنم .من چاو لە وهەموو ئاوات و ئارەزووە دەپۆشم .من هەوڵدەدەم تەنانەت ئەگەر ژیانمیشی لە سەر د ا بنێم ، تۆو عیشقی تۆ فەرامۆش کەم . بەڵام قەت رازی نابم کەسێ لە رێگەی بە زەیی پیاهاتنەوە زەواج لەگەڵ من بکات .بۆچی ؟ بۆچی ؟ مەگەر من چ گوناهێکم کردووە ؟چ داوێن پیسی یە کم بەدواوەیە ؟ ئەگەر من باش و میهرەبانم ، ئەگەر





دەتوانم تۆ بەختەوەرکەم ، ئەگەر دەتوانم بۆ تۆ هاوسەرێکی گوێڕاگر و بەوەفابم ، ئەگەر تۆ منت خۆشدەوێ وە ئەگەر من خاوەنی سیفاتێکم کەکچێکی نەجیب و گەورە و ناودار دەتوانێ هەی بێ ، ئیتر بۆچی ، بۆچی ئامادەنیت بۆ نموونە مارەیی من بە ئەوپەری ویستەوە بکەیتە 10000 تمەن . بۆ نابەدڵ ئەمە قبوڵ دەکەی ؟بۆچی ؟ مەگەر لەم مامەڵەیەدا زەرەر دەکەیت ؟ وە مەگەر لە نرخی ئەوەی کە دەیدەیت هاوسەرێك بەدەست ناهێنی کەتەمەنێك مایەی خۆشبەختی و شادیت دەبێت وەتەمەنێك لەبەر خاتری ئاسایشی تۆ زەحمەت دەکێشێ ، ئایا ئەگەر تۆ هەموودنیاش بڕێژی بەسەر پێ ی دا زیانت لێ کەتووە ؟ بەڵام ئەگەر من خراپم ، شان و شکۆی هاوسەری کەسێکی وەك تۆم نیە ، من ناتوانم تۆ بەختەوەرکەم ، تۆمنت خۆشناوێ ، ئیتر بۆچی ئامادە دەبیت و دەشڵێی لە بەر خاتری تۆ ! نا ، مەڵێ . ئەگەر وایە نامەوێ . ئیتر ئەم وتە یە دووپات بکەیتەوە .ئەگەر من خاترێکم هەبوو لەدوای ئەو هەموو و تووێژو چەناکە دانە ، تازە نرخی من دیاری بکەیت و قبوڵیبکەیت . مرۆڤ " بەلا "بۆ گیان ناکڕێ .کەواتە چ کەسێ وای لە تۆ کردووە کە دەست بدەیتە ئەم ئیشە و پێ ی رازی بیت ؟ مەگەر ئەمە نابێتە ئەوەی کە تۆ ویستوتە بە زەییت پێما بێتەوە ؟ لە حاڵەتێکدا کە ئەگەر ئاوابێت من هەرگیز پێ ی رازی و خۆشحاڵ نابم . بە خوا ئەم شتانە مرۆڤ شێت دەکات . ئەگەر تۆ دڵنیانیت لەمن و ئەگەر دەزانی کە من دەتوانم تەمەنێك لەگەڵ تۆ دا بژیم. ئیتر گرێبەست و مارەیی و ، هەزارشتی تر ، یانی چی . ئایا ئەم شتانە دەتوانێ کاریگەریی هەبێ لەسەر ژیانی ئێمە . وە ئایا ئەگەر مارەیی من 112000000

تمەن نەك سەد هەزار تمەن بێ ، من قەت ئەوە لە تۆ داوا دەكەم تۆ لات وایە من ئەوەندە كە چاوم لەو پارە وپوولە.0بێ كەتۆ لە هەقی مندا دەیدەی و بمەوێ رۆژێ قەوالەێ لە دژی تۆ وبەقازانجی خۆم بەكاربێنم . نا ،من ئاوانیم وە ئەوە كۆت و بەندی خێزانییە كەوای لە من كردووە ،بایەخ بەو شتانە بدەم. گەورەترین دیارییەك كەهاوسەر دەتوانێ پیشكەشی منی بكات ، گیانی ئەوە،رەوشتی ئەوە ،نەجابەت و شەرافەتی ئەوە ،خۆبەرزی و،سەربەخۆیی فیكری ئەوە . من دەمەوێ چی بكەم وە دەتوانێ ! چی سوودێكی بۆ حاڵی من هەبێ ؟ قەوالەێیەكی من ! من خۆم بە بەرزترو گەورەتر لەوەدەزانم كەخۆم بەو شتانە دڵخوش كەم .وەپابەندبم بەو كۆتەوە ! نە .تۆمەڵی بەخاتری من! ئەو قسەیە گرٍم تێ بەردەدا . من هێندەی دنیایەك مانا و واتا لەم ووشە بچكولەیەدا دەبینم .وەك ئەوە وایە كە تۆ بتەوێ ئاژەڵێكی بێ نرخ بكرٍی و نرخێكی زۆر یان بۆ ئەو ئاژەلەێ دیاری كرد بێ و ، تۆ رازی نەبی و سەرەنجام پیێداگرتن وپاڕانەوەی ئەو تۆ رازی بكات و ئەو ﴿ئاژەلەێ﴾ بە هەمان نرخ و بەهای گران بكڕی .دواتریش بڵێی " من ئەم پارەیەم تەنها لە بەرخاتری تۆ داوە .یانی بەزەییم پیاهاتۆتەوە یانی تۆ ئەوەندەت نەهێناوە .یانی تۆ شایستەی ئەوە نەبووی ،بەڵام من دڵم سووتا بەزەییم پیاتا هاتەوە .دڵنیابە ئەگەر نرخێكت هەبو وایە بەبەهایەكی زیاتر و بەتەواوی حەزمەوە دەمكڕیت. بەڵێ پەروێز تۆ دەتەوێ لەگەڵ مندا هەمان مامەلەێ بكەیت .تۆ بەو ووشەیە دەتەوێ بەمن بڵێی " فروغ من بەزەییم بە تۆدا هاتۆتەوە. دلمێ سووتا، تۆ نرخێكت نەبوو ! ئەگینا من رازی دەبووم وە بە هەمووحەزو رزایەت وە هەر لە سەرەتاوە قبولم دەكرد . بە خوا





ئەوەندە دڵم پڕە دەمەوێ بگریم .ئاخر بۆچی دەبێ بەو جورە بێت .من چاوەڕیێ ی بیستنی قسە گەلێكی ئالەوجۆرەم لە تۆ نیە .من ئەوەندەی خوو بەرزی و تێڕوانینی پیاوێك بایەخ پێ دەدەم ، گوێ نادەم بە سامان و كارو پیشەو پلە و پایەو كەسێتی كۆمەڵایەتی ئەو . بۆچی تۆ دەبێ ئاوهابیت ؟ نازانم خوا بكات من بە هەلەێدا چووبم . لە شوێنیكی تردا تۆ دەڵێی""من ئیتر ئامادەنیم نرخی ئاوێنەومۆمدان بنێمە پشتی قەواالەێ وە" ئەمەش دیسان هەمان مانا دەدا. تۆ دیسانیش بەم قسەیە منت سووككردوە. منت بچووك و زەبوون كردووە و، باوەڕكە ئەم قسانەی تۆ كاریگەرییەكی خراپم لێ دەكات ، بەرامبەر بە تۆ بەدبین دەبم ، متمانەم لە تۆ وەردەگیرێتەوە . ئاخر چ بەڵگەیەكی هەیە و، تۆ بۆچی ئەو قسەیە دەكەی ؟ ئەم شتانە زۆر كارم لێ دەكەن وە من لە رادەبەدەر ئاگام لەم شتە لاوەكیانە یە .هەرچی بیردەكەمەو ە هۆی ئەم دژایەتیەی تۆ تێ ناگەم .تۆدئەپرسی بەڵگەنامەی زەواج زۆر قورس بێ وتۆ دەتوانی لە كاتی خۆیدا لەژێری دەربچی ئەمە بیرێكی منالاێنەیە . چۆن تۆ لە سەرەتای ژیاندا لە بیری رۆژانی جیابوونەوە دای و ، دەتەوێ جادە ساف كەیت ! بەخوا زۆر خراپە من زۆر ئازار دەچێژم تۆ وای بۆ دەچی كە دوورنیە رۆژی من و تۆش جیاببینەوە . نا، ئەمە ناكرێ ، ئەمە جێ ی باوەڕنیە و ، تازە تۆ وای بۆ دەچی ئەگەر ئێمە لە ژیانی ژن و مێردایەشیدا ناچاربووین لەیەك جیاببینەوە من بایەخ بە بەڵگەنامەی زەواج و مارەیی دەدەم .نە ، بەخوا من تەنها بۆ ئەوەی كە بە تۆی بسەڵمێنم خەیالێكی ئالەو جۆرەم نیەو لە نامەیەكدا هەموو شتێكم دەبەخشم بە تۆ . لە بەرئەوە دەمەوێ خەیاڵی تۆ ئاسوودەبێ

من زەبوون و پیس نیم ، من تەنانەت بیری ئەوەی کە بمەویٚ رۆژێك بەڵگەنامەی زەواجی  خۆم بکەمە سەر چاوەی داهات ، بەنەنگی دەزانم . من لە ئاڵوودە بوون بەو شتە ماددیاتانە هەڵدێم .ئامانجی من لە ژیانی ژن و مێردایەتی ئەو شتانە نیە . من کاتیٚ مێردەکەم خۆش بویٚ تا دواپین ساتی ژیان و تادواپین دڵۆپی خوێنم لەبەرخاتری ئەو وە لەبەر خاتری خۆشبەختی ئەو تیٚ دەکۆشم . من ئەمڕۆ تەنها دەمەویٚ شوو بە تۆ بکەم لەبەر ئەوە هەست دەکەم کەبەباشی دەتوانم هۆکاری خۆشبەختی تۆ دەستە بەرکەم .من لەو تاقمە کچانە نیم کە مەبەستم لە زەواج تەنها بەدەستهێنانی سەربەستی زیاتر ، وەیان بۆ نموونە لەبەرکردنی جلوبەرگی جوانترو ئارایشتکردن بیٚ . من ئەم شتانە بە نەنگ دەزانم بەزەبوونی و ریسوایی دەزانم ." ئایا پیێت وایە کەمن ئاوا  بە تۆ ناسێنراوم ، وانەبم و دوا تر ئاکارم  بگۆڕم و ، ببمە مایەی زەحمە تدانی تۆ . نا ، ئەمەش جیٚ ی قبولٚ  نیە ،لە بەرئەوە مرۆڤ  تا لە کەسیٚ دڵنیا نەبیٚ ئەو بەهاوسەری خۆی هەڵنابژێریٚ . ئایا دەتەویٚ هاوترازییەك لە نێوان باری ماددی تۆ ،لەگەڵ ئەم شتانەدا دروست بیٚ ، ئەوەش کە کردەیی نیە . ئەم شتانە نەبەستراوە  بەباری دارایی کەسێکەوە . بەستراوە بەکەسێتی و پلەوپایەی کۆمەلایەتی خێزانەکان و لەسەرووی ئەوەشەوە ،ئەمە داب و نەریتە وە دەبیٚ پەیڕەوی لیٚ بکریٚ. من بۆ خۆم باوەڕم بەم شتانە نیە. بەلای منەوە مەرجی زەواج و بەختەوەری عیشق بریتی نیە لە سەد هەزار تمەن مارەیی و نووسینی نرخی ئاوێنە و مۆمدان بەپشتی قەوالەٚی بەڵگەنامەی زەواج . نازانم ،من لەوکەسانە نیم . چاوم لە مارەیی و ئەم جۆرە شتانەبێت ، وە وەکو وتم تەنها





لەبەرخاتری ئەوەی کە بەتۆی بسەلمێنم کە زەبوون و ،بیرکۆڵ تیم .ئامادەم هەموو ئەوەی کە تۆ لە بەڵگەنامەی زەواجی  مندا  مەبەستە. ببەخشم  بەخۆت .من ئەم شتانە تەنها لەبەرخاتری باوکم ودایکم و رازی بوونی ئەوان دەڵێم . ئەوان بە شێوازی بیروباوەڕی تۆ ئاشنانین و ، ئەم دژایەتیەی تۆ دەدەنە پاڵ پیسکەیی ونینۆك وشکیی. بۆ نموونە ئەگەر تۆ پیێت وایە ئەو سەرکەوتنەی ئەمدووایییەت زۆر ئاسایی بووە ، نا . راستە کە سەرەنجام  بەقازانجی تۆ تەواو بوو ، بەلاٚم  بیرو بۆچوونی  باوکم دەبارەی تۆ گۆڕڕا . ئەگەر باسکردنەکانی من و بەڵگەکانی من نەبووا یە هێشتاش لەو باوەڕەدا بوو کەتۆ مرۆڤیکی پیسکەیت سەیرکە  پەروێز ئەو سەرکەوتنە بەچ نرخێك بۆ تۆ تەواو بوو . وە ئێستا ئەگەر لە سەرەتادا رازی دەبووی ، ئەوان خۆشبینتر دەبوون لەتۆ .دەزانی من پیێم وایە نارەزایی تۆ لەبڕی مارەیی راست بووە و بەتەواوی لەگەڵ تۆودا بووم . چونکەدەمزانی کەئەمە لەگەڵ باوەڕی تۆدایە وەمرۆڤیش دەبیٚ بەرگری لە بیروباوەڕی خۆی بکات . بەلاٚم ئەو نارەزاییەی دووەمت زۆر منی نارەحەت کرد . راستە کە من خۆم پیشنیارم بۆ تۆ کرد “ لە حالەٚتێکدا کە باوکم هیچی بە من نەدا تۆش نرخی ئاوێنە و جیٚ مۆم لەپشتی بەڵگەنامەی زەواج مەنووسە ،بەلاٚم تۆ بۆچی قبوڵت کرد ؟ تۆ بۆچی دەبیٚ قبوڵی کەی ؟

**پەرویْزی خۆشەویستم**. ئەم بیرۆکانەیە کەمن شێت دەکات . ئەم شتانەیە کە ئازارم دەدا . کاتێ بیردەکەمەوە و دەمەوێ هۆی نارەزایی تۆ بەدەست بێنم و هیچ بەڵگەیەك بۆ ئەوە نابینمەوە ، ئەوکاتە ناچار دەبم پشت بەو بەڵگەیە ببەستم کەرەنگە من ئەوەندە بەهایەکم نیە ، کە تۆ لە بەرخاتری من بەو شتانە رازی بی . پێ دەچێ نەتوانم تۆ بەختەوەر بکەم ، هەزاران پێ دەچێ ی تر. ئەو کاتە دیسانەوەش بیردەکەمەوە ،نا ، وانیە ئەگەر من و بوونی من لەلای تۆ بەهایەکی نەبوو ، تۆ هەرگیز منت بۆ هاوسەری هەڵنە دەبژارد .برێ جاریش بیر دەکەمەوە کە ئەم عیشقە زۆر جێ ی خۆی لە ﴿دڵێ ﴾ تۆدا نەکردۆتەوە ، دەنا ، بەهەر هۆکارێك بوایە ، سەردەکەوتیت و ،ئەوشتانەت نە دەکرد بە بەهانەو کۆسپ و رێگرت بۆ خۆت دانە دەتاشی و ، ئەمجا ... ئیتر خۆت حاڵەتی من لێك بدەرەوە.. .حاڵەتی مرۆڤێ کەگیرۆدەی بیرتەسکی بووەو دەیەوێ خۆشەویستەکەی بێ تاوان پیشان بدات و ، ناتوانێ. وەبە ناچاری هەموو گوناهەکان دەخاتە گەردنی خۆی.

پەروێز ئیتر گللەیی من تەواو بوو پێم وایە سەری تۆش ئازاری تێ چووبێت بەلاٚم من ئێستا کە دڵی پڕم بە تاڵ کرد ، ئیتر بیر لەو مەسەلەیە ناکەمەوە ، بەلاٚم تۆ دەبێ وەلاٚمی من بدەیتەوە. بۆچی ؟





پەروێزەکەم ئەگەر وتت لە بەهاری ساڵی ئایندەدا چی روودەدا . لە هەمان ئەو رۆژەی کە من و تۆ بۆ یەکەمین جار لەدوای ماوەیەك یەکتریمان بینی ، من دەمەوێ ئەو رۆژەی کە شوو بەتۆ دەکەم هەمان رۆژبێ .تۆش دەبێ رازی بیت . بی ّگومان پەروێز زستان هیچ لوتفێکی نیە لە سەرماو بەفرو باراندا کە نابێ خوش بێ و شادی بکەی من بە تابیەتی ماوەکەم بۆ شەش مانگ درێژکردەوە کە تۆش دەرفەتێکی زیاترت بۆ چالاکی هەبێ و بەهاریش بێ چونکە بەهار وەرزی عیشقە. (چەندە بێ تەربیەت بووم چ قسانێك دەکەم ) سەیرکە. ئاب، ئەیلول ، تشرینی یەکەم ، تشرینی دووەم ، کانونی یەکەم ، کانونی دووەم ، شوبات .

فروغ + پەروێز = خۆشبەختی .

ئیتر ئەمە مسوٚگەرە. دەتەوێ باوەڕبکە.دەتەوێ باوەڕمەکە. سەربەستی .خوا بیکات زووتر مانگی مارس بێت تا من تۆڵەٚی هەموو ئەم گللەیی و سکالاٚیانە ت لێ بکەمەوە .بڵێ ئینشاا للە .نامەکەم زۆر درێژ بوو بەلاٚم هێشتا زۆر شت ماوە کە بە تۆم نەگوتووە و ، وەلاٚمی نیوەی داواکارییەکانی نامەکەی تۆم نەداوەتەوە . ئیتر ئەمە بۆ بەیانی بێ, بەیانی نامەیەکی تر دەنووسم و، وەلاٚمی پاشماوەی گللەییەکانی تۆ دەدەمەوە .پەروێز بەمنیان وت تۆ پلەت وەرگرتووە ئێستا راست بێ یان درۆ ، من پیرۆزبایم کردووە ئەگەر راستە ئەوە هیچ ، ئەگەر درۆیە پیرۆزبایی من هی ئەو رۆژەیە کە ئەو مەسەلەیە هەقیقەتی دەبێ. پەروێزم لە کۆتایی نامەکەتدا وێنەیەکت کێشابوو کەمن هەرچی بیرمکردەوە ، سەرم لێ دەرنەچوو.پێم ناڵێیت ئەمە چی یە ق _ ت ، بە خوا من لەم شتانە تێناگەم. وەکو هاوکێشەیەك وایە

بەلامەوە بەڵام شیکارکردنی کاری حەزرەتی ..... ه .پ . ش . کە دەزانم یانی پەروێزی شاپور بەڵام سەرم لەو دوانەی سەرەوە دەر نەکرد .

راستیەکەی بلیٚ ق ت یانی چی و مەبەستت چی‌یە .ئیتر نیشانەیەکی * یش لە نێوان یەکیٚ لەلاپەڕەکان دا کێشابوو لە وەشت هیچ شتیٚ تیٚ نەگەیشتم لەوە دەچیٚ خەت و نیشانەت بۆم کێشابێت ، وانیە ؟ ئەمەشم بۆ بنوسە بیرت نەچیٚ .

ئیتر لەمەبەدوا زووتر وەڵامی نامەکانم بدەرەوە . من شەممەی رابوردوو کاغەزم بۆ تۆ ناردوە و تۆ لە هەفتەی دواتر دا وەڵامت داوەتەوە . زۆر باشە زۆر تەمبەڵ بوویت .

پەروێز م حەز دەکەم هەمیشە پێم بڵیٚ ی" فروغم " یا " فروغی من " چونکە ئەم ووشەیە گوڕ و تین و دڵنیایی دەدا بەدڵ . وەمن لە هەرجارێکدا کە ئەمە ببیستم ، بەبیرم دێنمەوە کە هی تۆم ،هی تۆ ، کە زۆر خۆشم دەویٚ ی .ئیتر گللەیی لە من مەکە کە بۆچی نامەی کورت دەنووسم ئاخر پەروێز لەو پلەیەدا من بابەتیکم نەبوو بۆ نووسین بەو هۆیەوە نامەکەم کورتکراوە بوو . بەڵام تۆ وەکو ئەوەی دەرمانخانەت کردبێتەوە یەك لە دوای یەك باس لە دەرمانی داهێنراوی خۆت دەکەی و ، بەڵێنی چارەسەر بە من دەدەی ئەگەر نەخۆشەکانی تریشت بە هەمان خێرایی و هەمان رەوش بتەویٚ چارەسەربکەیت ، رۆژێك دەرگای دەرمانخانەکەت کڵۆم دەدەم و ، رەوانەی زیندانت دەکەم ئەمە لەمنەوە بۆ تۆ ئامۆژگاری بیٚ کە زۆر ریکلام بۆ دەرمانەکانی خۆت نەکەی . بەڵام ئەگەر لە ئازاری دەستی من بپرسی هەروا وەك خۆیەتی و ماوە ئەمجارە دەبیٚ





وەڵامی نامەکەم زوو بدەیتەوە .نامەکەم بووە کتێبك . من ئیتر ژمارەی پێوانەیی قسە زۆریم شکاند . خێرا ، زوو ئەمڕۆ هەینی یە ، من بەیانی ئەم نامەیە بە پۆستا دەنێرم .شە ممە یەکشەممە ، بیٚ گومان دوو شەممە بەدەستی تۆ دەگات . تا چوارشەممە عەسرێك هەر دەبیٚ وەڵامی نامەکەمت دابێتەوە وە بەپێچەوانەوە بە تاوانی کەمتەرخەمی لە ئەنجامدانی کاردا تەسلیم بە بەرپرسانی دادگات دەکەم .خواحافیزی تۆ فروغی تۆ

پەروێز وێنەیەکتم بۆ بنێرە جارێکی تریش تکام لێکردی ، بەڵام وەك ئەوەی بیرت چووە . ئەگەر بیانووت ئەوە یە کە وێنەی جوانت نیە ، من هەمان وێنەی ناشیرینی تۆم خۆشدەویٚ . تۆ لە چاوی منا لە هەموو خەڵکی دنیا باشترو چاکتری . ئیتر بیانوو مەهێنەرەوە .

**پەروێزم نامەکەی تۆ گەیشت** . بارەکە ڵلاٚ ئێستا بوویتەتە کوڕی باش . زۆر مەمنتونتم کە هەم زوو وەڵامی نامەکەمت دایەوە و نەتهێڵا چاوەڕێ بکەم و وێنە کەشت بۆ ناردم بەخوا زۆر خۆشحاڵ بووم . هیچ شتێکی تر نەیدەتوانی وەکو بینینی وێنەکەی تۆ من بخاتە ئەو شادمانی و خۆشیەوە . ئێستا وەك ئەوەی کە ئیتر تەنها نیم خەیاڵی تۆ و وێنەی تۆ هەردووکیان لەگەڵمان .بەڵام تۆ خۆت زۆرلەمن دووری راستە کەجێ ی تۆ لە دڵی مندایە ، بەڵام نابێ ئەوەش فەرامۆش کەی کە دڵی0 منیش لەلای تۆیە . باشتر بڵێم تۆ لە دڵی مندای و من ئەوەندە لە تۆ دوورم . خوایە ماوەی نێوانی من ودڵ چەندە زۆرە. پەروێزی ئازیزم دەزانی بۆچی ئەوەندە تۆم خۆشدەوێ؟ بۆ ئەوەی کەتۆ هیچ کاتێ لەبەرامبەر پرسیارەکانی مندا دانامێنی و، من هەرچیەك بڵێم تۆ ئەو توانایەت هەیە کە یەکسەر بەوەڵامێکی پەسەند و مەنتیقی لە شوێنی خۆمم دامرکێنی. باوەڕکە لەبەرامبەر تۆ و زۆر دەستەوسان بووم,. تۆ زۆر شەیتانی و، دەمەوێ بڵێم کە لە حازر وەڵامیدا دەستی هەمووانت لە پشتەوە گرێداوە. پەروێز شتێکی تر یش هەیە و، ئەویش ئەوەیە کە تۆ هەموو بیرو بۆ چوونەکانی من وەکو خۆت دەخوێنیتەوە و درك پێ دەکەی . هەموو ئەوانەی کە نووسیووتە قبوڵمە. مرۆڤ لە بەرامبەر مەنتیق و شێوازی





لێکدانەوەی تۆ دا ، بیچارە دەبێ. وەکو من کە ئێستا هیچ چارەیەکم نیە جگە لەوەی کە هەموو قسەکانی تۆ قبوڵ بکەم و هەق بە تۆ بدەم کە راست دەڵێی و، منیش جگە لەوە نیازو مەبەستێکم نەبووە. من ئینشاوا للە لەگەڵ دەرفەتدا ئەم نامەیەی تۆ لەبەردەمتا دەکەمەوەو وەڵامی یەك بەیەکی ئەوانە دەدەمەوە. (هەڵبەت وەڵامەکانم لە هەمان ئەو قوماشەیە کە خۆت دەیزانی ) وا دەردەکەوێ تۆ لە فەرمانگە زۆر گیرۆدەی بێکاری و وڕوکاسی بوویت کە وەڵامی نامەکانی منیش لەوێ دەدەیتەوە ئیتر ئیشەکە بە شوێنێ گەیشتووە کە لەزەرفەکانی ئیدارەش بەکاردەهێنی.

پەروێزی خۆشەویستم ، ئێستا کە زانیم مەبەستی تۆ لە بەکارهێنانی وشەی " لەبەرخاتری ..." بەزەیی هاتنەوە نەبووە ، بۆ چەندهەمین جار بڵێم کە لە بەرخاتری من ، لە بەرخاتری فروغ کە تۆی زۆر خۆشدەوێ. وەرەوەو لەکەری شەیتان دابەزە خوارەوە. ئاخر تۆ بەم سووربوونە سەیرەت کە هاوکات زۆریش بەجێ و راستە ، دەترسم من و خۆت بەدبەخت کەی . ئاخر پەروێز م. من قبوڵمە کەتۆ راست دەکەی و هەقتە ، بەڵام ئەوان قبوڵی ناکەن و تۆش کەئامادە نیت دەست لە بیرو بۆ چوونت هەڵگری . ئەوکاتە دەزانی چۆن دەبێ ؟ من و تۆ بۆ هەتا هەتایە لەیەکتر جیا دەبینەوە . ئەوەش کە ئێستا ئیتر بۆتە راستی کە تۆ خۆشت دەوێم ئیتر لە دوای تۆ ژیان بە هایەکی نابێ. خەیاڵ نەکەی کە درۆ دەکەم. ئەو جارەش وای بۆ چوو بوویت کە من درۆم کردووە . بەڵام خوا نەیویست من بمرم و تۆم نەبێ . خوا دادوەرە و هیوادارم کە من بە تۆ و تۆ بە من و من و تۆ بە شادمانیی هەمیشەیی بگەیەنێ . منیش وەکو تۆ بەدەست ئەم

رەوشە وەدەناڵێنم و ناڕەحەتم . بەخوا حەیران و سەر گەردان مابووم ، نە مدەزانیچیی بکەم. بەڵام نامەی تۆ گەیشت وریگە چارەیەکی لە بەرپێماکردەوە .بەڵام قبوڵی بکە باوکم ئێستا لە تاران نیە. نزیکە ی هەفتەیەکە کە گوایە بۆ هەوا گۆڕین و لە ڕاستیدا بەمەبەستی تازەکردنەوەی دیدار چووە بۆ ( زەنجان) ئالەم چەند رۆژە دا دەگەرێتەوەو ئێمە دەبێ بەر لەگەڕانەوەی ئەو. ریکخستنی کار دیاری کەین . تۆ سەرەتا بۆم بنوسە بزانم چەند پارەت هەیە . ئاخرمن کە پێغەمبەر نیم تا مەزەندەی بکەم. تۆ دەنووسی بڕێکی کەم .زۆر باشە ئەو بڕە کەمە بەژمارە دیاری کە. تۆ نابێ هیچ لە من بشاریتەوە .بنوسە دەتوانی چەند خەرج بکەی. خودا تۆوی هەرچی ئەسکەناسە لەسەر زەوی هەلگرێ . تا من و تۆ ئاسودە بین . پەروێز من کە بۆ تۆم نووسی بۆچی باوکم وتی چوار مانگی تر و ئەو بڕەش کە تۆ دەبێ پاشەکەوتی کەی دیاریم کردووە ، ئێستا ئایا تۆ ئەوەندە پلرەت هەیە ؟ ئەگەرنیتە چەندت هەیە . من دەمەوێ بەرلە کات و وادە ئیش و کارەکان بە جۆرێ رێك بخەم کە لەگەڵ باری دارایی تۆ گونجاوبێ و لەبەر ئەوە دەبێ و ئەو بڕەپارەیەی کە تۆ دەتوانی لەو رێگە یەدا خەرجی کەیت بە ئاگابم . کەواتە تۆ راشکاوانە ئەم مەسەلەیەم بۆ بنووسە دواتر تا باوکم دێتەوە من لەگەڵ دایکما قسە دەکەم. هەرچەندە ئێستا ش لەگەڵ دایکما قسەم کردووە, دایکم رازییە و ئامادەیە یارمەتیمان بدات ." درۆناکەم " تۆ پەروێز کاتێ بۆ منت نووسی کە لەرووی داراییەوە ئامادەی یان نا ئەوکاتە من دەزانم کە دەبێ چی بکەم ئەگەر ئامادە بوویت کاتێ باوکم هاتەوە ، دایکم ئەم مەسەلەیەی لەگەڵ تاوتوێ دەکاو تۆش لە رێگەی نامەیەکەوە ،





هەڵبەت نەك بەو ناوەرۆکەی کە بۆ منت نووسیبوو ، لە بڕیاری خۆت ئاگاداری دەکەیتەوە . منیش ئەرکی سەرشانی خۆم یانی سووربوون و،پێ داگریی بە ئەنجام دەگەیەنم ، بەوشێوەیە دڵنیام کە کارکردن بۆ وەستاندنی موورادی ئێمە کۆتایی پێ دێ . پەروێز تۆ دەبێ نامەکەت بە جۆرێك رێك بخەی کەچیتر جیٚی بچوکترین رەخنەیەك نەمێنێتەوە. من دواتر بۆتی دەنووسم کەچی بکەی. بەڵام پەروێز ئەوە فەرامۆش نەکەی کە دەبێ نرخی ئەوە لە بەڵگەنامەی زەواج بنووسی تا ئەوان رازی بن " هەڵبەت لە بەر خاتری من." ئەوجا رۆژێك دەچین بۆ شت کڕین و شەوێك من دەبمە بووك و تۆ زاوا و دواتر یش... ئیتر ئەوی تریشی خۆت بیهێنە بەرچاوت .بەراستی زۆر خۆشبەختین. بەڵام پەروێز تۆ بۆچی بێ ئومیدی نیشان دەدەی. منی بەدبەخت تادێم کەمێك بە ئایندە هیواداربم و ، وانەکانم بخوێنم بە جارێك نامەی تۆ دەگات و مژدەی بەد بەختی و جودایی دەدات و لە ترسا زراوم دەتەقێ .ئاخر ئێمەچۆن دەتوانین لەیەکتر جیا ببینەوە. ئایا ئەمە ویژدانە کەمرۆڤ بێت و لەبەر شتەلاوەکی و ناکۆکی بچووك شەق لەبەختەوەری خۆی هەڵبدا ! پەروێز توخوا ئەوەندە بە قورس مەیگرە . تۆ زۆر ئەشکەنجەم دەدەی ، بەڵام لە تۆ لەٚی منیش بترسە .بریا ئەوەندە دەستەڵاتم دەبوو کەهەموو ئەو کۆسپ وگرفتانەی کەلەرێگەی زەواجما ندا هەیە لە چرکە ساتێکدا لا بەرم و لە پاڵ تۆدا بە شادمانییەکی هەقیقی و خۆشبەختییەکی تا هە تایی بگەم. من بەتەواوی لەرووی هزروبیرەوە لە ژێردەستی تۆ دام و ، هەر چی یەك بڵێی بەدڵ و بەگیان جێ بەجیٚی دەکەم. تۆ وتووتە کەدەبێ " هاوکاریت بکەم, زۆر باشە ، من ئامادەم بەڵام بەمەرجێ کە تۆسەر

بکەوی .گفتم پیٚ بدە تامن هەموو هەو لٚ و کۆششێکم لەوریٚ یەدا بخەمەگەڕ . ئیٚستا پەروێزم ، چاوەڕیٚ ی وەلاٚمی تۆم تابزانم چ بیرو بۆ چوونیٚك هەیە . ئایا قبولٚی دەکەی وە یا نەو ، دیسانەوەش دەتەویٚ ئەشکەنجەم بدەی خوا بکات من و تۆ زووتر بەیەك بگەین تا من تۆلەٚی کارەکانت (هەلٚبەت ئەو کارانەی کە نەتکردوون ) ! لیٚ بکەمەوە . بەلاٚم پەروێز هیچ باسی ویٚنەکانم نەکرد زۆر قیافەت گرتبوو هەروەکو خۆت . ئای ئەو یەکەی ...

ئەی ناقۆلاٚ ! چاوت مەست کردووە ، برۆکانت بەرزکردۆتەوە ,قژت ریٚك خستووە ،خەتی سەر, خوار و خیٚچ ! چوزانم ،چاوم روون تۆش لەم شتانە دەزانی ؟ پەروێزی میهرەبانم پرسیاریٚك لە تۆ دەکەم دەبیٚ هەر وەلاٚمیشی بدە یتەوە. ئایا مولەٚتم دەدەیتیٚ بە ئارەزووی خۆم ویٚنەکەت ماچ بکەم ؟ فیزمەکە ! شتیٚکم لە بیر چوو . پەروێز ئیٚستا دوو سیٚ رۆژی تر تاقیکردنەوەی ئیٚمە دەست پیٚ دەکات و تۆش کە دەزانی من کەوتووم ﴿ لەوانەی کیمیا ﴾ کەواتە دوعا بکە قبولٚ بکریٚم . دلٚنیام ئەگەر تۆ دوعا بکەی ئەوە قبولٚ دەکریٚم . سەیرکە هەموو شەویٚ کاتیٚ دەتەویٚ بخەوی بلٚیٚ ئەی خوای گەورە فروغ بە من و فروغ بە من و دیسانیش فروغ بە نومرەی30 (29یا 127و سەرەنجام بە حەوتیش رازیم ) لە تاقیکردنەوەی کیمیادا بگەیەنە . بیرت نەچیٚ پەروێز من باوەڕم وایە ئەم مەسەلەیە لیٚگەڕیٚین بۆ دوای تاقیکردنەوە. من هەر چەندە تا نامەی من بە تۆ دەگات و تۆ وەلاٚمی من دەدەیتەوە, هەفتەیەکی پیٚ دەچیٚ و ، تا باوکم بیٚت و ئەم مەسەلەیە بخریٚتە ڕوو. منیش تاقیکردنەوەم داوە . بەلاٚم ئەگەر نەمدابوو ، تۆش ئارام بگرە . پەروێز من لەهەموو ئیش و کاریٚك و





هەمیشە داوای یارمەتی لە خوا دەکەم و دەلٚیٚی خواش ڕووی لوتفی کردۆتە من و ، وەلاٚمی حەز و ئاواتەکانم دەداتەوە . تۆش داوای یارمەتی لەخوا بکە . دلٚنیام سەردەکەویت . پەروێز من سەرم لەو نهیٚنی یە دەرهیٚناو تیٚ گەیشتم مانای ق _ ت چی یە . ئیٚستا کە تۆ نەنگوت منیش لەداخی تۆ بەکاری دەهیٚنم “ هەقی ناڕەز ا یبیشت نیە . خوا حافیزی تۆ پەروێزی خۆشەویستم

ق _ ت

ف

ف

رۆژی چوارشەممە هەفتەیەکی تر چاوەڕوانی وەلاٚمی نامەکەمم

(1950/8/22)

## یەکشەممە 22 مایس

پەروێزی خۆشەویستم ئەمە یەکەمین نامەیەکە یەکسەر دوای چوونە ناو تارانەوە بۆتی دەنووسم . سەفەرەکەم بەهەموو تاڵی و ناڕەحتبیەکیەوە کەهەیبوو سەرەنجام رابوردو ئێستا کەلەم ژوورە بێ دەنگەدا سەرقاڵی نووسینی ئەم نامەیەم. شتێ جگە لەماندووبوونێکی زۆر وئازاردەر لەو هەموو ناڕەحەتیانە لەبوونما نەماوەتەوە .هەر ئێستا لەماڵی ئێوە هاتوومەوە .پەروێز لە بەرخاتری تۆو لەبەر خاتری ئەوەی کە تۆ دایکتت خۆشدەوی ٚ بەپێویستم زانی کە هەر ئەمشەو بچم بۆ ئەوێ. هەموو ساغ وسەلامەت بوون وەمنیش تا ئەو شوێنەی کە توانیم باسم لە ژیانی خۆمان و تۆم بۆ کردن. حیکمەتیش لەوێ بوو. پەیامەکەی تۆم پێ گەیاند . خۆشبەختانە. گوایە ئەوەی ئەو دەیگووت "جاویدی" ئیشەکەی تۆی ئەنجام داوە و، تەنانەت پارەکەشی وەرگرتووە ، تەنها چاوەڕێ ی ئەوەیە کە بزانی ئایا پارەکە دەبێ بەمن بدا ، یان بەتۆ . بەهەرحاڵ خۆت دەتوانی دەربارەی ئەو مەسەلەیە بڕیار بدەیت .

پەروێز، دایکم جلوبەرگی منالەٚکەمانی دوریوە و، کۆمیدییەکیشی بۆ راسپاردووەو، وتویەتی کەپێکەوە عەرەبانەیەکیشی بۆ





هەڵدەبژێرین و دەیکڕین. ئەمەش مژدەیەکی تر کەتۆی ...چیتر بیرلە عەرەبانە وشتەکانی تر نەکەیتەوە. هەڵبەت ئەمانە زانیاری و هەواڵێکن کە لەماوەی ئەم شەوەدا بە دەستم هێناوەو ، لەمە زیاتر ئیتر هیچ هەوالیێکی ترنازانم ." بیژەن" لەگەڵ نەنکیدا رۆیشت و بڕیارە بۆ رێکخستنی کارەکەی بێت بۆ ماڵیئێمە .

پەروێز دەزانی چەند رۆژە تۆم نەدیوە .یەك رۆژ .راستە رۆژێکی تەواوە هەست بە بوونی تۆ لەتەك خۆمدا ناکەم ، دەنگی تۆ نابیستم و ناتوانم وەك بوونەوەرێك خۆشبەختی خۆم لە نێو باوەشی تۆدا بشارمەوە . پەروێز ئەم خەیاڵە بەسە بۆ ئازاردانی من . تۆ نازانی لەو سەعاتەوەی کە لە تۆ جیا بوومەوە تاکو ئێستا چ بیرێکی رەش وتاریك وخەماوی لەمێشکما رەگیان داکوتاوە. بە بەردەوامی هەست بە فشاری رقێك دەکەم لە قوڕگما .حەز دەکەم بگریم روخساری تۆ بۆ ساتێکیش لەبەرچاو مادوور ناکەوێتەوە . تۆ دەبینم کە بە نیگای میهرەبان و پڕ لە عیشقت تێم دەڕوانی و لەو حالەٚتەدا دڵم لە ژێڕ فشارێکی ئازاراوی لەسینەمدا دەداتە تر پەترپ و لێدان . هەست بە گەرمی فرمیسك دەکەم لە روومەتما . پەروێز من ناتوانم دڵ خۆشی خۆم بەم بیروخەیالەٚ بدەمەوە کە 20 رۆژی تر تۆ دەبینم ... نا.. خەمی من بۆ یەك رۆژ ودوو رۆژ نیە، لەراستیدا من لەرووی چەند ایە تیەوە بیر لەم مەسەلەیە ناکەمەوە چۆنیەتی یەکەی بۆ من خەماوییە . من ناتوانم لە تۆ دوربم ، دوری لە تۆ ئازارم دەدا ئێستا چ فەرقێ دەکات ئەگەرئەم دوورییە دوو رۆژ بێ یان سەدساڵ .

پەروێز من بۆ بەختەوەربوون پێویستم بە بوونی تۆ هەیە .تۆم بە خرۆشانی عیشقێکی پیرۆز و پاکژ خۆشدەوێ .

عیشقیٚ کە پیٚناچیٚ لەدنیادا  هاوتایەکی هەبیٚ .پەرویٚز چ سوودیٚکی هەیە کە ئەگەر جاریٚکی تر بە تۆ بلْیٚم کە تۆ دەپەرستم . بەراستی تۆ دەپەرستم مەگەر تۆ خۆت ئەوە نازانی ؟ پەرویٚز بە من بلْیٚ بەتەنیایی چی دەکەی! بۆ من بنووسە چ خواردنیٚ دەخۆی و بەرنامەی ژیانت چی یە . پەرویٚز من ئیتر قەت لە  تۆ جیانابمەوە  ئەمە دوایین جارە. من تەنیایم خۆشناویٚ. ژیانی من بەعیشقی تۆ بۆتە جمك و بوونی تۆیە کەعیشقت و ژیانی منی رووناك و جوان کردووە . کاتیٚ تۆ نەبی ژیانی من وەکو گۆڕیٚکی رەش و تاریکی لیٚ دیٚ . نامەویٚ کۆتایی یە نامەکەم بهیٚنم ."میهران" لە ژووریٚکی ترەوە بانگم دەکات ، بەلاْم من نامەویٚ  ئەم دوایین کەرەسەیە کە بۆ ئارامکردنەوەی ئازارەکانی خۆم لەبەر دەستمایە ، لەدەستم بچیٚ . پەرویٚز نامەم بۆ بنووسە ئەوندە بنووسە کە ماندووبم . هەموو رۆژیٚ بنووسە ئەمە ئاواتی منە وە تۆ ئەگەر منت خۆشبویٚ ,گویٚ دەدەی بە ئاواتەکانی من . پەرویٚز من لە بەیانیەوە بەریٚکو پیٚکی کاغەز بۆ تۆ دەنووسم و بەسەرهاتی ژیانم بە دریٚژی باس دەکەم و چاوەڕیٚ ی ئەوەش لە تۆ دەکەم .ئەگەر دەست و خەتی نامەکەی  ئەمشەوم ناخۆش و پیسە ، بمبەحشە لەبەرئەوەی ئەوەندە ماندووم کە ئەگەر بیرو خەیالْیتۆ لیٚم بگەڕابا، ئیٚستا لە خەویٚکدا دەبووم کە کۆتایی یەکەی سبەی شەو بوایە . پەرویٚز ماچە تامەزرۆییەکانم قبولْ بکە .

بەئومیٚدی دیداری تۆ                    فروغ





## چوارشەممە26ی مایس

پەروێزی ئازیز, ئێستا من وەڵامی ئەو نامەیەی کە تۆ لە ژێر کار یگەری هەستێکی تایبەتیدا بۆت نووسیوم ، دەدەمەوە. ئەو نامەیە بۆ من زۆر تاڵ و ناخۆش بوو . تۆ لەوێدا نوسیووتە " کەلە دوای سێ مانگ دەتوانی من بەریتە لای خۆت. من ئێستا نازانم چۆن چۆنی دەبێ  ئەم سێ مانگە بەسەربەرم. تەنانەت بیر کردنەوەش لەو مەسەلەیە ، چاوانم پڕدەکا لە فرمێسک .شتێ کە  بە بەردەوامی لێی دەترسام و لە هەمانکاندا چاوەڕێم  دەکرد ئا ئەوەبوو .ئائەوەبوو کە تۆ بم خەلەتێنی وبڵێی " مانگێك و دواتر کە من بەمانەوە رازی بووم و تۆ بەتەواوەتی لە دەستی من دەرچوویت ﴿ ئەوکاتە﴾ راستییەکەی بڵێی . ڕاستە من دانی پیادەنێم ، کەمن بوومەتە هۆی رۆیشتنی تۆ و زۆریش  پەشیمان و خەجالەتبارم    ئەم بیر کۆڵی وئیرادە لاوازییەی من بوو کە تۆی لە من دور خستەوە وەمن بێ ئەوەی بەخۆم بزانم چی دەکەم ، رازی بووم    لەسەر رۆیشتنی تۆ .بەلام لەو کاتەدا هیواداربووم کە لەدوای هەفتەیەك و ئەوپەڕەکەی مانگێك لەگەڵ تۆدا دەژیم . من لە قسەی خەڵك دەترسام. باش بۆی چوویت بەبەردەوامی ترسم  هەبوو کە ئەم قسانە  بەختەوەری ئێمە تێك  بدات و ناکۆکی بخاتە نێوانی من وتۆوە. وەبۆ هەلاتن لە دەست ئەم قسانە.بۆ ئەوەی





کەکەسێ نەتوانی رەخنەمان لێبگرێت وبێتە ناو ژیانمانەوە. حەزمدەکرد بچم بۆ جێگایەك کەهیچ نیشانەیەکی لەم جۆرەمرۆڤە بێ ویژدان و دووڕووانەی لێ نەبێ .

پەروێز ، بۆ کەسێکی وەك من کۆشکێکی شکۆدارو ژوورێکیگڵ و سادە جیاوازییەکی نەبوو . وەمن لەهەردووجێگەکەدا بەختەوەربووم بەلام ئەوبیرە بەبەردەوامی ئازارمی دەداو ئێستا تێ دەگەم کە چەندە بێ مێشك بووم, چەندە بەدبەخت و لاوازبووم. من ئێستا دوژمنایەتی لەگەڵ هەر کەسێکدا دەکەم کەبیەوێ دەست وە ربداتە ژیانمەوە ، رقم لێ ی دەبێتەوە. دایکی من بەهۆی هەمان مەسەلەوە هەموو رۆژێ لانی کەم سەدجار دوعام لێ دەکات...باوابێ من شایانی ئەو دوعا خراپانەم. من ئەم شتانە بەگیان دەکڕم ، لەبەرئەوەی تازە تێگەیشتم کە پێویستە لە ژیاندا پیاو گاڵتەی بە قسەی خەڵك بێ و تۆ وتەنی وەك کولەکە سەیری خەڵکی بکات.من ئێستا ئەوەندە توانای بیرو سەربەخۆیی ئیرادەم پەیداکردووە تاهەرکاتێ پێویست بێ شەق لەوژیانە سەرانسەر کۆت و بەند و پڕلە دا ب و نەریتی بۆ گەنی کۆنە هەڵبدەم و پەنا بۆ باوەشی تۆ بێنم.من ئێستا راشکاوانە دانی پیادەنێم کە گێل ونەزان بووم .لەنەزانێ کە متر بووم وەتۆ ئیتر مەڵی. مەڵی!تۆ ئیتر ئەم قسانە بەبیری من مەهێنەرەوە.من شەرمم لەرابردووی خۆم هەیە.بۆچی گوێم بەقسەی ئەوانە ئەدا ، بۆچی ناڕەحەت دەبووم، بۆچی ئازارم دەچێشت، مەگەر مرۆڤێکی سەربەست مرۆڤێکی شارستانی, دەبێ لەوقسەبەتالانەی تۆ ئازار بچێژێ ؟

من لەبەردەم قسەی خراپی کەسانی لاوازدا بووم بەڵام ئێستا بەهێزبووم. وەرە بگەڕێوە پێکەوە ژوورێك بەکرێ بگرین وە لەوێدا بەوپەڕی شادمانیەوە دەژین.هیچ کەسێ هەقی نیە بڵێ بۆچی مۆبیلەت نیە، بۆچی فەرشت نیە. من دەڵێم لەبریدا ئێمە عیشقمان هەیە.عیشق گەرممان دەکاتەوە..ئێمە خۆشبەخت دەکا.ئێمە لەبەرخاتری یەکتری دەژین ،نەك لەبەر رازیکردنی خاتری خەڵکی ؟ ! من نامەوێ تۆ لەوێ زەحمەت بکێشی ، رەنج بدەی ، کاربکەی و لەبریدا من راحەت بم . من ئەو ئاسودە ییەم ناوێ . بگەڕێوە ئازیزی من بەخوا من لەبەردەم تۆدا دەبمە مەڕێکی گوێڕایەڵ. هەرچی بڵێ ی گوێڕایەڵی دەبم وەهەرگیز کەسێ ناتوانێ رەخنەمان لێ بگرێ. پەروێزی ئازیزم ئەگەر من بوومەتە مایەی سەفەرکردن وئازارو زەحمەتی تۆ ، بمبەخشە . من لەناخی دلەوە پەشیمانم وئاواتە خوازم رۆژێ بێت تابتوانم بەتۆی بسەلمێنم کە ئیتر بەو جۆرە نیم . بۆچی دەچی بۆ"ئابادان"، من رازی نیم. ئەگەر بچی منیش دێم. ئەوە ئیتر دڵنیابە . من دەمەوێ لەگەڵ تۆدا ئیش بکەم و لەگەڵ تۆ زەحمەت بکێشم و ، تۆ هەرگیز نابێ ڕێگری من بیت. شتێکم نەویستووە کە خراپ بێ . بەقسەی یەکێ لە شاعیرانی خۆمان "" شتێکم نەویستووە کە لە ئاوگڵیتۆدا نەبێ. هەرهیچ نەبێ پەروێزی ئازیز ، مولەت وەربگرەو وەرە بۆ ئێرە یەك دوو رۆژ لە لای من .دوو رۆژ لەسەر سینەی من پشووبە, دەبینی کە گەرمیی سینەی من لە خۆری ئەهواز سوتێنەرترە. تۆ بەماچەکانم دەسوتێنم تۆ بەفرمێسکی چاوم دەشۆرم .تۆ بە سینەی گڕاویمەوە دەنووسێنم . پەروێز ، وەرەمن توانام نیە سێ مانگ تۆ نەبینم ، من لە تاو ئازارو خەم شێت دەبم . من وەکو





بینادەمە شێتەکان هەڵدێم تا بێم بۆ ئەوێ و ئیتر نەگەڕێمەوە .من بەندەی تۆم ,من شێتانە تۆم خۆ شدە وێ ، لەرابردوو پەشیمانم . ئەگەر باوەڕت نیە تاقیم بکەرەوە.

پەروێزی ئازیز ، حەزم دەکرد تۆ لێرە بوویتایەو دەتدی کە چەندە دڵرەنجاوو لاواز بووم و چەندە ئازار دەچێژم . ئەگەر دەتدی دەهاتی دەتبردم و دەتلاواندمەوە ، سووچێکی ژوورەکەتت دەدا پێم ومن لەوێ وەکو خزمەتکارێکی راستگۆ خزمەتم دەکردی .ئیتر نەمدەهێڵا خواردنی ئامادەکراوی دەرەوە بخۆی. چیتر نەم دەهێڵا بێ هۆش بی و تۆم بە ماچەکانی خۆم بەهۆش دەهێنایەوە . ئاخ ئەمانە تەنها ئاواتە ، ئاواتێکی دوورە دەست ، شتێکە کە واقیعی یە . هەقیقەتێ کە وەك هەموو هەقیقەتەکان تاڵ وترسناکاوییە .ئەمەیە کە من دەبێ لێرە بمێنمەوە و تۆ نایێی ، هەرگیز نایێی ، رەنگە ئیتر نەتوانم تۆ ببینم. رەنگە بمرم, شێت بم. مەگەر مرۆڤ هەواڵی سبەی خۆی دەزانێ . من ناچارم لەگەڵ ژانی دوری تۆ وا هەڵکەم ، بەڵام تۆ ،تۆ دەتوانی من رزگاربکەی . خوا حافیز تۆ وتەندروستی تۆ ، ئەوپەڕی ئارەزووی منە .

فروغ

## سێ شەممە ( 1 ی تەمووز )

پەروێز گیان ئێستا کاتی خۆرئاوابوونە هیچ کەس لە ماڵ نیە تاڕادەیەك تەنیام دیسانەوەش پەنام هێناوەتەوە بۆ سووچی ئەم ژوورە دیسانیش بیری تۆ ئازارم دەدا وەك ئەوە وایە کە دەستێکی بەهێز.بەهێزێکی نامرۆیی هەموو لەشم لەخۆیدا دەگوشێ. حالەتێکی سەیرم هەیە، پێڵووەکانم داخە ، ئەو گەرماییە سەراپای جەستەمی گرتۆتەوە. ئەمڕۆیش پۆستەچی نەهات ئەمڕۆش وەك رۆژانی تر تێپەڕی و ، من لەم چاوەڕوانیە کوشندەدا مامەوە

چەندە ژیان سەختە پەروێزی ئازیز بۆچی بێ هوودە هەوڵدەدەی من لە خۆت دوور خەیتەوە بۆچی منت لەنێو ئەو خەڵکەدا تەنها جێهێڵاوە کە جگە لە ئازاردانی من ئامانج و نیازێکیان نیە. من لێرە نامێنمەوە من ناتوانم هەموو رۆژێ شەڕبکەم هەموو رۆژێ لێم بدەن من ناتوانم لەبەردەم کەسانێ کەجوێن بە تۆ و ، بەمن ئەدەن بێ دەنگ دابنیشم و هەڵس وکەوتی دۆستانەم لەگەڵیانا هەبێت. من ئەگەر ئەم شتانە بە تۆ نەڵێم ، بۆ چ کەسێکی باسکەم . من لەدەست ئەم خەمە پەنا بۆ باوەشی چ کەسێ بێنم. بەخوا من ژیانم لە نێو بیاباندا لە ژێر خۆرێکی سوتێنەردا پێ باشترە لە مانەوە لێرەدا . ئیتر لەوێ کەسێ نیە تالە هەموو سەعاتێکدا و لەسەر هەرمەسەلەیەکی لاوەکی و





بچووك ، بە داوێن پیس و نانەجیب بمدوێنێ . منیش مرۆڤێکم کە سێتی یەکم هەیە ، هەستێکم هەیە . من منالێکی دووسالەنیم. من ناتوانم هەموو رۆژێ قژو مووی خۆم بەچنگی ئەم وئەوەوە ببینم! گوێی من ئیتر ناتوانێ ئەو قسە ناشیرین و ئەو جنێوە بێ شەرمانەیە ببیستێ . من توانام نیە وەکو پەیکەر بوەستم و ئەوان قسەی خراپ بە تۆ بڵێن و جوێنت پێ بدەن . پەروێز ئەم ڕەوشتە سووك و نزمانە گیانی من بەخەم و ئازار کە نەقت دەکات . من ئەم ژیانە پڕلەهەرا و جەنجاڵو دوو ڕوویی و دەس خۆش کەرەم خۆشناوێ. وەرەبمبە لە دەست ئەم شێتانەم رزگاربکە.من تەنها تۆم لەم دنیایەدا هەیە. تەنها تۆ هاوڕێی منی. بەڵام تۆ لەکوێیت، تۆ بۆچی لەمن دوورکەوتویتەتەوە. بۆیان بنووسە کە ئازارم نەدەن . هەقیان بە سەرمەوە نەبێ . من نە موحیبەتی ئەوانەم دەوێ و ، نەرق و کینەو دوژمنایەتی یان . من رقم لە دڵنەوابی ساختە دەبێتەوە . ئەگەر ئەوان بە تۆ یان وت کە چاکیت و خۆشمان دەوێ ی .دڵنیابە درۆدەکەن. ئەوە ئیشیانە . بێ چاوو ڕوون .من هەقم بەسەر هیچ کەسێکەوە نیە ، لە کاتی پێو یستدا نەبێ لەگەڵ هیچ کەسێك قسە ناکەم.من جێگەی کەسێکم تەنگ نەکردووە .من لەو دۆلابە زیاتر هیچی ترم نیە و هەمیشە لەوێ دا دەنیشم و لە جێگەکەم ناجوڵێم . بەڵام ئەوانە وازم لێ ناهێنن. دڵی من خوێنە. پەروێز من لێرە لەنێوئەو بەد رەوشتی ، ئەو دوو روویی یانەو بەد ڕەگەزایەتیانە, ژیانێکی مەینەت بارم هەیە . لانی کەم ئەگەر تۆ لێرە بویتایە ، دەهاتم بۆلات ئێستا بۆ کوێ بڕۆم؟ ئەمە ژیان نیە .ئەمە ئەشکەنجەیە . پەروێز تۆ خوا وەرە.

نایەویٚ لەویٚ بمیٚنی ئیٚمە کەلوپەلی ژیانمان ناویٚ. وەرە لیٚرە پیٚکەوە کار دەکەین .من ئامادەم کارکەم و زووتر قەرزەکانمان دەدەینەوە ,هیچ شتیٚکم ناویٚ ئەوە نەبیٚ کە پیٚکەوە بژین و بەس. من لیٚرە زیادەم بنیادەمیٚکی زیادە وەك میوانیٚك کە زیاد لە رادەی ئاسایی ببیٚتە ئەرك بەسەر خاوەن ماڵەوە . تیٚ دەگەی چی دەڵیٚم . ئەوانە ئاوا لەگەڵ منا رەفتار دەکەن .من نامەویٚ ئاوا بیٚت من ناتوانم بەرگەی ئەوە بگرم، کە هەموو رۆژیٚ بەسەرما بقیژیٚنن کەی دەڕۆی لە دەستت راحەت بین، زووتر بڕۆ .وەیان چەندساڵیتر خەیاڵی مانەوەت هەیە ..پەرویٚز دەبینی کە چۆن چۆنی دەژیم.من نامەویٚ ببمە مایەی ناڕەحەتی تۆ. من نامەویٚ ببمە سەرباری تۆ. ئەگەر پیٚویست بیٚ ئیش دەکەم. پەرویٚز وەرە بەخوا تۆ ناڕەحەت ناکەم وەرە باپیٚکەوە بژین .من لەدەست ئەو دیٚوانە ,ئەو تاوانبارانە رزگار بکە. ئەوانە لەگەڵ من و تۆدا دوژمنن .روخساریان فریوت نەدەن. حەیفە تۆ کەمیهرەبانییت لەگەڵ ئەوانەدا کرد. حەیفە تۆ کەمرۆڤایەتیت دا بەهەوانتە. وەرە ئازیزی من ئیٚمە هیچ شتیٚکمان ناویٚ .من لە تۆ زیاتر پیٚویستم بە هیچ شتیٚ تر نیە. وەرە بە میهرەبانیەوە بمنوسیٚنە بە سنگتەوە، ماچم بکە، دڵنەواییم کە. ماوەیەکی زۆرە لە هەمووشتیٚ بیٚ بەشم . ماوەیەکی زۆرە کەسیٚ بەدڵسۆزییەوە روومی ماچنەکردووە، نەیڕوانیوەتە چاوم وگویٚ ی ڕانە دیٚراوە بۆ قسەو هات و هاوارەکانم .من تۆم دەویٚ . پەرویٚزی ئازیزم تۆ بەخواو بەوەی کەلای تۆ پیرۆزە سویٚند دەدەم. وەرە من تارادەی پیٚویست سزادرلوم. من جگە لە تۆ هیچ شتیٚکم ناویٚ .پەرویٚز. پەرویٚزی من ، ئیٚرە ماڵیمنە .بیٚچارە ئیٚمە کە تا ئیٚستا توانیومانە لەم لانەی بەرەلاٚیی یەدا بژین . باوکو دا





یکی من لەبەر چاوی منا دەمانچە لەیەکتر هەڵدەکیٚشن .من دەترسم ، من شیٚت دەبم ، من ناتوانم ، ئەم شتانە ببیستم .
پەرویٚز ئاگات لە حاڵی من بیٚ . من پیٚویستیم بە تۆیە .

**ماچت دەکەم**

**خوا حافیزی تۆ**

**فروغ**





## پێنج شەممە ( 9/ی تەمووز )

پەروێزی ئازیزم هیودارم حا ڵت باش بێ. نزیکەی هەفتەیەکە کە من هاتوومەوە و هێشتا نامەی تۆ نەگەیشتووە . نازانم بۆچی نامەت بۆ نەنووسیوم .بەهەر حاڵ تکام لەتۆ ئەوەیە کە زووتر نامە بنووسی ، چونکە من لێرە بەتووندی هەست بەتەنیایی دەکەم وتەنها نامەکانی تۆیە دەتوانی ًهێورم کات. لەحاڵێ من و کامی بتەوێ. خراپ نین. کامی کەلە بەیانیەوە تاکو شەو بەکاری شەیتانی و گاڵتەجاڕی هەمووان خەریك دەکات و منیش لە ژوورەکەی سەرەوە یا بۆ خۆم کتێب دەخوێنمەوە یان شتێ دەنووسم و ، یا ئەوەی کە سەرێ لە دایکم دەدەم . لە یەکەم رۆژی مانگەوە بڕیارە خۆم خواردنی خۆم لێ بنێم و لە دوای ئەوە بەم شێوەیە باوەڕ دەکەم کە منیش سەرقاڵ بوونێکم تووش ببێ.

پەروێز گیانم, نازانم تۆ لەوێ چی دەکەی ، وەك ئەوە وایە کەمن و تۆ کاتێ لەیەکتر دوور دەکەوینەوە ، هیچ کامێکمان ئەرکی خۆمان نازانین و لەبریدا کاتێ لە پاڵ یەکیشداین رەوشێکی روناکترمان هەیە . سەبارەت بە کتێبەکەم دەبێ بڵێم کە هەر ئێستا نوسخەی تەواو لەگەڵ بەرگی پشتەوە و ، وێنە و پێشەکی لە بەردەممایە . یانی لەلایەنی بنکەوە ناردوویانە. کاری کتێب تەواو بووە، ئالەم هەفتەیەدا

به دڵنیایەوە بلأو دەبێتەوە پێشەکییەك کە " شیفا " بۆی نووسیووم زۆر سەرنج راکێش و بۆتە مایەی خوێندنەوە. بنکەی " ئەمیرکەبیر " هەر لە ئێستاوە خۆی بۆ چاپی دووەمی کتێبەکەم ئامادەکردووە و ، لەو باوەڕەدایە کە کتێبەکەم باش دەفرۆشرێ . من زۆر خۆشحاڵم بە رادەیەکی ئەو تۆ کە ناتوانم بۆتۆی نەنووسم .رەنگە خۆشبەختی من تەنها ئالەمەدا بێت . کاتێ دەبینم کە دەتوانم سەرچاوەی بەرهەمێ بم ولەشێکی لە کارکەوتوو و بەتاڵم نیە ،کاتێ هەست دەکەم لەژیاندا پەیوەندییەکی توندم بە شتێکە وە هەیە ، ئەوکاتە لە گوزەراندنی ژیان رازی دەبم .

پەروێز ناتوانم رادەی خۆشحاڵیم بۆ تۆ بنوسم. ئەمە یەکێ لەئاواتە گەورەکانی من بوو .وە بێگومان دوای ئەوە هەوڵدەدەم کە بەر هەمێکی جوانتر بخوڵقێنم. لەوکاتەوەی کە لای تۆ هاتوومەوە دوو پارچە شیعرم نووسیووە کەهاتیەوە بۆتیدەخوێنمەوە .پارچەیەکیانم نارد بۆ گۆڤاری " سپید و سیاە " " بە پۆستدا " ، کەلە ژمارەیەکی تایبەتیدا دایبنێ .یەکێکیشیان هێشتا بیرێکم لێنە کردۆتەوە.

پەروێزەکەم حاڵێ دایکت و باوکت و خەسرەو ، دوٚخی باشەو ، بەوپەڕی میهرەبانییەوە هەڵس و کەوتم لەگەڵ دەکەن .ئاواتم ئەوەیە کە تۆ زووتر بێیت .چونکە تۆم خۆشدەوێ و ژیانی دوور لە تۆ بەرهەمێکی بۆم نیە .هەرچەندە خۆم بەکتێب و قەڵەمەوە خەریك دەکەم بەلأم هیچ یەکێ لەمانە جێگەی تۆ پڕناکاتەوە . بەیانی لە سپێدەوە دەچمە لای دایکم و دەمەوێ لەگەڵ کلۆر دانیشم و خەیاتی بکەم . من ئەو کراسەی کە کڕیوومە هێشتا نەمدوریوە .





پەروێز زووتر وەرە وەو بیرت نەچێ کە هەروا خۆشم دەوێ ی و، متمانەت پێم هەبێ و دڵنیابە کەئەمجارە بە پێچەوانەی حەزی تۆوە هەڵسوکەوت ناکەم .

چاوەڕێ ی نامەی تۆم

ماچت دەکەم

فروغ

## سیٚ شەممە ( 14 ی تەمووز )

پەروێزی ئلزیزم ، ئەو زەرفەی کە دوو نامەی تۆی تیا بوو ئەمڕۆ بە دەستم گەیشت و من ناچارم بۆ وەڵامدانەوەی تۆ نامەیەکی درێژ بنوسم و بۆ یەکەمین جار شێوازی داڕشتنی تۆ بەکار دەهێنم و وەڵامی چەند بە شێکی جیا جیای نامەکەی تۆ دەدەمەوە .

1تۆ دەتەویٚ نامەیەکی پڕ لە باق و بریق و پڕ لە رستەی بیٚ ناوەرۆك و گاڵتەجاڕی کە قەت ماناو چەمکێکی بە دە ر لەدرۆو فڕو فێڵ لەخۆ ناگرن، لەنامەکەی من بەباشتر دابنێی. تۆ هێشتا روخسارو رووکەش بینی . )

ئەو قسەیە راست نیە تۆ پەنا بۆ نامەکەی من دەبەیت ودەیکەی بە بەڵگەی دەستت و من بەڵگەیەکی گەورەترم هەیە و ئەو بەڵگەیەش خۆتی . پەروێز هەڵبەت ناتوانی ئەوە قبولٚ نەکەی کەخۆشت کتومت وەك نامەکەت وایت و هەروەك چۆن لەنێوان نامەکەی تۆ و ئەو نامە فریو دەرانەدا جیاوازی هەیە. خودی خۆیشت جیاوازییت هەیە لەگەلٚ مرۆڤی ماستاوچی وزمان لووس . من ئەگەر لایەنگری ئەو نامانە بومایە ئالەو پیاوانەشم پەسەند دەکرد ووەك چۆن نامەکەتم بۆ ناردیتەوە ،نەشمتوانی خۆت قبولٚ بکەم و رەزامەندیم لە سەر ژیان دەرنەدەبڕی .کەواتە من لێرە دوو ئیشی ناکۆکم





ئەنجامداوە . یانی تۆم ویستووە, نامەکەتم نەویستووە . لەم دوو کارە ئەوەی کەلە هەلومەرجی ئاسایی و سروشتیدا ئەنجامدراوە مایەی قبولەٚ, نەك ئەوەی کە لە حاڵەت و رەوشی نائاساییدا. من تۆم بی ئەوەی کەسیٚ بتوانیٚ کار لە باوەڕم بکات ، خۆشویستوووەو پەسەندم کردووە و، لەرێی گەیشتن بە تۆ تێکۆشاوم و بەوپەڕی حەزەوە ملم داوە بە شووکردن بە تۆ . بەڵام نامەکە... کەواتە من لایەنگری ئەو نامانە نیم کە تۆ دەڵێی ، بەڵام لەوەی کە نوسیووتە رووکەش بینم دیسانەوە درۆیەکی گەورەت نوسیووە .

پەروێز ئایا تەنها نووسینی نامەیەك بۆ تە مایەی پەردە لادان لەو هەموو خەوش و کەموکوڕییە ؟ ئەگەر تۆ بتەویٚ ئەونامەیەی من بکەیتە بەڵگەی رووکەش بینی ، منیش ئەو نامەی ی تۆ بەبەڵگەی رووکەش بینی دەزانم ، لەبەرئەوە بەو جۆرەی کە تۆ لەو کاتەدا ( لە دنیای دڵسۆزی و میهرەبانی کە لە دلیٚ تۆدا بوو ،بی ئاگا بووم و تۆ زقاڵە بە هاونرخێکم پیٚ رەوا نەدەبینی ) ، تۆش لە چاوەڕوانی و پەژلرەیەك کە ماوەی دووهەفتە دڵمی دەسوتاند ،... لەو ئاواتانەی کەلە دلیٚ خۆما پەروەردەم کردن...لەو ڕێزانەی کە بۆ نامەکانی تۆم دادەنا،... بیٚ ئاگابوویت و ، هیچ کامیٚ لەوانەت نەدەزانی و تەنها بە ڕواڵەتی نامەی من سەرقالٚ بوویت و بەڕستەی توڕاوی من وە ئەوەت بە رووکەش بینی داناوە. هەر وەك چۆن تۆ نەتتوانیوە درك بەبەڵگەی ئەم هەموو تووڕەو رقە بکەی وشوێنگەی من لەبەر چاو بگری ، منیش نەمتوانیوە ئاگایەکم لەحاڵەتی تۆ بیٚ. لەکاتی نووسینی ئەو نامەیەدا و، نەمتوانیوە بیروبۆچوونی تۆش لەبەر چاوبگرم 2. تەنانەت تۆ ئامادە نیت نامەیەکی من کەبیٚ رتووش نووسراوە ،قبولٚ

بکەی . " ئەم قسەیە راست نیە . من هەموو نامەکانی تۆم هەیە، لە نێوانیاندا ئەو نامانە بەدەردەکەویٚ کەزۆر ساکارو بەدەرە لەهەر جۆرە جوانکارییەك. من هەموو ئەوانەم خوێندۆتەوە و بەخۆشحاڵ!یەوە و بەرەزامەندییەوە قبوڵم کردووە، چونکە لەحاڵەتی ئاساییدا بووم و لەیەنی تۆوە نیگەرانیم نەبووە. دوو هەفتە لە تۆ بیٚ ئاگانە بووم. ئەڵێ ی کەواتە بۆچی ئەونامەیەم ناردەوە؟ حاڵەتی من لە بەرچاوبگرە حاڵەتی نائاسایی من لەبەرچاو بگرە ، رق و تورەبوونی من . ئەم نامە یەك لاپەڕەییە. لەدوای دووهەفتە چاوەڕوانی لەبەر چاوەبگرە و ئەمجا خۆت بڕیار بدە .4. تۆ هیچ حسابیٚ بۆ قسەی من ناکەی." ئەمجا نووسیووتە کەمن دەرهەق بە عیشقی تۆ بیٚ متمانەم و ئەوکاتە منت سەرزەنشت کردو وەکەچۆن دەتوانم پیاوێکم خۆشبویٚ لەکاتێکا کە متمانەم پیٚ ی نیە." پەروێز مەگەر تۆ نەبووی کە حسابت بۆ قسەنەدەکرد و بە بەردەوامی کارو کردەوەت لەبەر چاودەگرت .

پەروێز . . من بەکردەوە بە تۆم سەلماند کە باوەڕم بە عیشقی تۆ هەیە و باوەڕم بە وەفاداری تۆ هەیە . تۆ لە هەمان کاتدا کە مێردی منیت ، گیانی بەگیانی ترین هاوڕیٚ ی منیت. ئایا چ شتیٚ لەمتمانەو دڵنیایی زۆر بەولاوە ، دۆستایەتی دەهێنایە گۆڕیٚ. دڵنیابە ئەگەر من لەتۆ دڵنیا نەبوومایە تاکو ئێستا ئەم ژیانەم دابوو بەسەریەکدا, من بۆ ژیان و عیشقیٚ کە متمانەو دڵنیایی لەگەڵدا نەبیٚ نرخی فلسێکی بۆ دانانێم. من هەموو رازەکانی ژیانم بە تۆ وتووە. شتگەلێك کە هیچ کەسیٚ نایزانیٚ ، تۆ دەیزانی . تۆ لە خەمو شادی منا هاوبەشی. چ شتیٚ پێویست دەکات کە من ئەوەندە لەگەڵ تۆدا نزیك و گیانی بە گیانی بم ، ئایا جگە لە متمانە کردن بە عیشق و موحیبەتی تۆ





بزوێنەرێکی تریش هەیە ؟ پەروێز, من رووکەش بین نیم . ئەو ەتۆیت پەنا دەبەیتە بەر رستە توڕاوییەکانی من و گویٚ نادەیتە کرۆکی مەسەلەکە و دواتر تۆمەتم دەخەیتە پاڵ .

پەروێز ی ئازیزم من لەخۆم زیاتر متمانەم بە تۆ هەیە و لێت دڵنیام و باوەڕم بەعیشق و موحیبەتی تۆ هەیە. من راست دەکەم و تۆ دەتوانی ئەم بەشەی نامەکەم وەك بەڵگەیەکی گرانبەها لای خۆت بپارێزی و هەڵبگری .

پەروێز ،من و تۆ زیاتر لەوەی بتوانریٚ تەسەور بکریٚ لەگەڵ یەکتر دڵسۆزو میهرەبانین و دڵنیابە من متمانەم بەتۆ هەیە. بەڵام ئەوەش لەبەر چاوبگرە، خۆشەیستی من پەروێزی ئازیزم ، من کەمیٚ کەم حەوسەلەم . زوو تورە دەبم و زوو جنێودەدەم و زووش پەشیمان دەبمەوە . ئەگەر قسەیەکی خراپم پێت و تووە. داوای لێبوردن دەکەم. 4–کاتی ماوە بۆ بە خۆدا چوونەوە ، باشتر کە لەبری چەندین مانگ و چەندین ساڵ لە مرۆوە هەوڵ بدەی بەرامبەرەکەت بناسی . ئەگەر باشت هەڵبژارد بیٚ ئەوە هیچ ،ئەگینا ئەوەی کە دەتویست و ئەو ئەوکەسەی لێی بەشك نیت هەرکەسێکی تر کە بەبیرتدا دێت 1/10000 ی من رەنگە بەرامبەر بەتۆ بەوەفابیٚ ، هەڵبژێرە .من نازانم چ وەڵامێکی ئەو بەشەی نامەکەی تۆ بدەمەوە . من هیچ کەسێکم هێندەی تۆ خۆشناویٚ و تۆ ئەوکەسەی کە من دەمویست و پەسەندم دەکرد . تۆ هەقت نیە ئەو قسانە بۆ من بنووسی, من لەژیان لەگەڵ تۆدا سکالاٚ و ماندوێتیم نیشان نەداوە .من هەرگیز بە تۆم نەگوتووە کە تۆ هاو مەیلم نیت . من تۆم ناسیووە بە ڕۆحی تۆ ئاشنام و بەچاوی کراوەوە تۆم هەڵبژاردووە و لە مڕووە وە تەواو رازی

وخۆشحاڵم و تۆ ترۆپکی ئاواتی منیت.

پەروێز ، تکا دەکەم ئەم قسانە بۆ من مەنووسە .من نامەوێ گوێم لەم قسانە بێت . من نامەوێ ئەم شتانە لەنێوان من و تۆدا هەبێ .

6. تۆ مرۆڤێکی خۆپەرست و لە خۆڕازیت . " .

پەروێز ، من جاران وانەبووم و تۆ قەت ئەو قسەیەت بەمن نەوتووبوو . من کارێکم نەکردووە کە شایستەی ئەم هەموو تۆمەتەبم .ئەگەر عیشق نیشاندان، نیشانەی خۆپەسەندییە ، لەمەبەدوا دەمم دادەخەم .تۆوادەزانی من کاتێ دەڵێم تۆم زۆر خۆشدەوێ ، مەبەستم ئەوەیە کەتۆ شایستەی ئەو عەشقەنیت . من زیاتر لەوەی شایانتە ، خۆشم دەوێیت .من وانیم تۆ بە هەڵەدا چوویت . نازانی کە ئەم قسانە چۆن دڵێ من دێنیتە ئێش. نازانی من کاتێ دەبینم کە بە بۆ چوونیتۆ بەو شێوەیە دەرکەوتووم چەند پێ ی تێك دەچم . مەخابن کە من ناتوانم ئەوەی کە لە دڵمدایە بە تۆی بگەیەنم . بەڵام ئەگەر تۆ ئاوها منت ناسیووە "هێشتا درەنگ نەبوو ، تاکات ماوە بەخۆتا بچۆرەوە ، چەندە باشتر کە لە بری چەندین مانگ و چەندین ساڵ لە مڕۆوە هەوڵبدە بەرامبەرەکەت بناسی. ئەگەر باشت هەڵبژارد بێ ئەوە هیچ ئەگینا ئەوەی کە دەتویست و ئەو کەسەی کە خۆبەرست و لە خۆرازی نیە و هەرکە سێکی تر کە بەبیرت دا دێ 1/1000 ی من رەنگە بەرامبەر بەتۆ بەوە فابێ هەڵی بژێرە

7. تۆ بنیادەمێکی هەقنەناسیت لەدوای ئەو هەموو دۆستایەتی و موحیببەتە تازە بەرامبەر بەمن گومان و دوو دڵی نیشان دەدەی تۆ وەکو ئەو منالأنەیت کەشتێ دەدەن بەیەکتری تا کۆتایی ساڵ هەر باسی ئەو شتە دەکەن .کەداویانە بەیەکتری . راستە کە تۆ هەموو





شتی خۆت داوە بەمن بەڵام ئەم هەموو قسەیەی نیە . مرۆڤ کاتێ شتێکی دا بە کەسێك وخۆی بەگیان وماڵ خستە بەردەستی ئەو ، ئەگەر بەردەوام بیەوێ لەو رابوردووەی خۆی قسە بێنێتەوە ، بەباوەڕی من نرخێکی نیە . مننەت کردن مانای نیە " سەیرە کە تۆ وای بۆ دەچیت . من فیداکاریم بۆت کردووە و من ئەگەر بچووکترین قسەیەك بکەم هەر زوو پەیوەندی لە نێوان ئەو دووانەدا دروست دەکەیت و دەیدەی بەرووومدا. پەروێز من هەرچەندە بیر دەکەمەوە حالەتێك نەهاتۆتەپێیش تامن بەرژەوەندی خۆم لەبەرخاتری تۆ بخەمەژێر پێ . ئەگەر زەواج بە تۆ فیداکارییە ، ئەگەر هەوڵدان لەرێ ی گەیشتن بە تۆ فیداکارییە ،دیارە من ئەم فیداکارییانەم لەبەر خۆم ئەنجامداوە ،نەك لەبەر تۆ.من ئامانجێکم هەبووە و لەرێ ی گەیشتن بەو ئامانجە، تێ کۆشاوم .ئەگەر پەیڕەویم لە هەڵوێستەکانی تۆ کردووە ، دیسان وەش بەرژەوەندی خۆم لە بەرچاوگرتووە . من قەت فیداکاریم بۆ تۆ نەکردووە و هەرگیز کاروکردەوەی خۆم نەکردوە بەمننەت بەسەر تا. تۆ چەندجارێك ئەم قسەیەت پێ وتووم و ، من هەمیشە بێدەنگ دانیشتووم وئەوەم لەدڵی خۆما شاردۆتەوە. تۆ چەند جارێك بە منت گوتووە کەمننەت دەکەم بە سەرتا من هیچ شتێکم بۆ تۆ نەکردووە تا مننەت بەسەرا بکەم . من خۆم بە قەرزارباری تۆ دەزانم . من شادمانی خۆم لە بوونی تۆدا دەزانم . ئەو کاتە چۆن رێ ی تێ دەچێ مننەت بەسەرتۆدا بکەم . من کەی بە گیان ومالّی خۆم خستۆتە بەردەستی تۆ ؟ من کەی هەموو شتێکی خۆمم بە تۆداوە ؟ من چیم هەیە تا بەتۆی بدەم. من هیچ شتێکم نیە . هیچ شتێ جگە لەخۆم و, تەنها خۆم خستۆتە بەردەستی تۆو هەرگیز

مننەتیشم نەکردووە بە سەر تۆدا . لەبەر ئەوە باوەڕم وایە مرۆڤ نابێ هیچ شتێ لەخۆشەویستەکەی بەرتەسك بکاتەوە. چەندە تۆ تۆمەتم دەدەیتە پاڵ وەك بڵێ ی کە تازە منت ناسیووە ..جاران من وانەبووم, تۆ  هەمیشە دەتووت کە گللەیی وسکالأیەکت لێم نیە مەگەر ئەو کاتە کوێرو کە ڕ بوویت ؟ من لەمەبەدوا چیتر باس نە لە عیشق و لەموحیبەت دەکەم و ، نە لە شتەکانی تر. من دەمم دادەخەم لەبەر ئەوەی هەر ووشەیەك کەلە دوو لێوی منەوە دەرچێ گوزار شتە لەیەکێ لە سیفاتە خراپەکانی من و بە شێوازێکی جددی  راڤە دەکرێت و لێکدانەوەی بۆ دەکرێ . پەروێز, پێویست ناکات بۆ هێورکردنەوەو  دامرکاندنەوەی رق وکینەی خۆت ئەوەندە ئەو بڕو بیانووە ناپەسەندانە دابتاشی.چاوت بکەرەوەو باشتر من بناسە. رەنگە من سیفاتی خراپی تریشم هەبێ ، رەنگە بێ مێشك و نەزان و درۆکوێرو کەڕیش بم و تۆتا ئێستا نەتزانیبێ و دواتر پەشیمان بیتەوە . من هەقنەناسم . راست دەکەی ، من لەبەر خاتری ئەوەی کە تۆ خۆشت دەوێم ، بکەوم بەسەر دەست و پێ تداو بگریم . نازانم ، رەنگە ئاواش بێت. دەشێ ئەو شتانە لەبەر خاتری من بهێنی . راستە پەروێز ئەگەر تۆ نەبوویتایە من ئێستا ئەبوا  بە سوك وە ریسوایی لە ماڵێ باوکم بژیایەم وهەمیشە ئەو ناوەم پێوە بوایە کە گوناهم  کردووە و بەرەڵلأبوون. تۆ بەهەلەدا چووی من هەرگیز ئەم گەورەیی وجوامێر ییەی تۆ فەرامۆش ناکەم.من خۆم دەزانم کەبوونەوەرێکی تەواو نە بووم .خۆشم دەزانم کە ئەوەی کچانی تر هەیان بووە ،من  نەمبووەو، تۆ هەموو ئەو شتانەت  لەبەر چاو نەگرت. من دەزانم کە تۆ  هەقێکی گەورەت لە ئەستۆی مندایە بەلأم من قەت خۆم بە گوناهبار نازانم .





من لە بەردەم ویژدانی خۆما سەربەرزم . من ئەرکی ئاکاریی خۆمم ئەنجامداوەو داوێن پاك وساغ ،خۆمداوە بە دەست تۆوە . من هەرگیز پێم لە بازنەی پاکژی ونەجابەت نەبردۆتە دەرەوە و لەگەڵ  هەموو ئەمانە دا تۆ هەقت بوو.لە خۆتم دوورخەیتەوەو دەرم کەی ، بەلأم ئەو کارەت نەکرد. منت وەك هەمیشە خۆشوویست و قەت سەر زەنەشتت نەکردم . بەلأم من ئەم مەسەلەیەم فەرامۆش نەکردو تەنها بیرم ئەوەیە کە بەرامبەر بە تۆ وە فادار وگیانیبە گیانی بم و تۆم خۆشبوێ . تۆ هەقت نیە بەمن بڵێیهەقنەناس_ هیچ کەسێ هەقی نیە بەفاسدم ناوبەرێ . پەروێز بەوشێوەیە لەگەڵ من قسەمەکە. ئەگەر بزانم کە تۆ  گومانێکت  لە نەجیبی من هەبووە ، خۆم دەکوژم  و لەدەست ئەم ژیانە سەرانسەر گوماناوایی و دوودڵی یە رەحەت دەبم. راستە من هەقنەناسم. من تۆم کەم خۆشدەوێ. من دەبێ تۆ لە جێی خواوەند بپەرستم . پەروێز من دەزانم کە تۆ چەندە هەقت لەگەردنی منە. من دەزانم کەتۆ کارێکی سەیرت ئەنجام داوەو بە پێچەوانەی هەمووانەوە دیسانەوە خۆشت دەوێم . بەلأم بەخواو بەوەی کەلەلای تۆ پیرۆزە سوێند دەخۆم " من هەرگیز گوناهێکم نەکردووە . باوەڕت هەبێ بەخوا ، درۆناکەم .

ئەمە وەلأمی نامەکەی تۆ _____ نامەیەکی تریش هەیە کە لەوێش دا تۆ هێرشگەلێکت کردۆتە سەرم . بەلأم ئیتر ماندوو بووم ، دەستم ئێشی دێ ئ ینشا و ا للە جارێکی تر وەلأمی دەدەمەوە

**خوا حافیز**

**فروغ**

**پەرویز**, ئەمڕۆ نامەی تۆ گەیشت .هیوادارم حاڵت باش بێ .حاڵی منیش بەو شێوەیەی کەخۆت بۆی چوویت بەهۆی چەندین پیاسەو گەڕانی سەر پرد و" لا لەزار " و " اسلامبول " و "نادری " زۆر باشە و ئەگەر هاوڕێکانی تۆ ئەوەندە شعوریان هەبوایە ، بێ گومان ئەوە شیان بە تۆ دەگەیاند . نازانم مەبەستت لەنوسینی ئەو نامەیە چی یە .من نامەوێ درۆبکەم و لەسەریشی سوورنیم کە تۆ باوەڕ بەقسەکانم بکەی . هەڵبەت جێگەیەك کە هاوڕێکانت ئەوەندە زانیاری جیاجیاو گرانبە هایا ن لەسەری بەتۆداوە ، ئیتر من چی بنوسم کە باوەڕبکەی. بەلاّم وەکو چەند جاریك وتوومە ، دیسانەوەش دەیڵێم کە بە پێچەوانەی بۆ چوونیتۆوە. باوەڕبکەی خۆم دەزانم و باوەڕم وایە کە هیچ یەك لەو قسانە راست نیە . من زۆر حەز دەکەم چاوم بەو کابرایە بکەوێ کەمنی لەگەڵ پوراندا لە سەر پرد دیووەو تفێ بکەمە نێو چاوی ، لەبەر ئەوەی من لەو کاتەوەی کە هاتوومەوە بۆ تاران سێ جار خوشکمم دیوە ، کە دووجاریان من چووم بۆ ماڵیان و ، جارێکیش ئەو هاتووە بۆ ماڵی دایکت و ، ئێستا ش بۆ دوو هەفتە دەچێ کەئەوان چوون بۆ " میگون "و،خوا نەمبەخشێ ئەگەر من چووبێتم بۆ سەرپرد .من نامەوێ سوێند بخۆم . بەلاّم بە مەرگی کامی ، من ئێستا نزیکەی سێ ساڵە کەهەر سەری پردم نەدیوە ،چ





بگات بەوەی کە بمەوێ لەوێ پیاسە بکەم . بەلاّم سەبارەت بەگەڕان و پیاسەی من لە ا سلامبول ! لەگەڵ لاوێکدا کە بە بۆ چوونی ئێوە ئەویش بێ دوو دڵی فەرەیدوون هاتووە. باوەڕناکەم کارێکی دژ بە شەرعم ئەنجامدابێ . هەڵبەت منیش مرۆڤم ، کاتێ لە شارۆچکەیەکی دوورەوە هاتم گومانی تیانیە بۆ کڕین و سەیرکردن دەچم بۆ ا سلامبول و لالەزارو نادری, بەلاّم نەك هەموو رۆژێ ، بەڵکو لەو کاتەوەی کە هاتوو مەوە تاکو ئێستا ، دەتوانم بڵێم کەپێنج جاران چووم . ئەویش سێ جار یان لەبەرخاترولەسەرداوای دایکت و دوو جاریش بۆ کڕینی جلوبەرگ کەدەمویست بچم بۆ زەماوەندەکەی ئیرەج و بەلاّم ئەو زەلامانەی کە منیان بینیوەو ئابەو شیوۆیە هەروا ئاغا ی موهەندیسیش ،من رۆژێ کە لەسەر جادەبووم و لە ئەم سەری شەقامی نادرییەوە تا ئەوسەری، یەك دەرزەن ناسیاوی ئەهوازیم بینی. یانی دکتۆر "تاهیری " و خانمی " معازد" ، برای خانمی دکتۆر " ئەسەدییان "، ئاغا ی جمالی ، سێ وچوار مناڵی قوتابخانەی ئەهوازی ، کوڕی ئاغا ی "پێشکار " ئاغا ی مهندس " نادری " ئەمجا ژنەکەی برای خانمی معازید خانمی سەرهەنگ" مقام" و دوو سێ نەفەری تر کە ناویانم لە بیرنیە ., جا ئەگەر وابێ هەرکام لەو کەسانە زانیاری بە تۆ بدەن کە منیان بینیوە بەڵگەی ئەوە نیە کە هەر یەکە یان لە رۆژێکی تایبەتدا منیان دیوە بەلاّم وەك نووسیم دوور نیە لە ماوەی رۆژێکدا مرۆڤ چەند کەسێك ببینێ . وەئەوەی کە نووسیووتە ئەوانە پیاسە کەرانی لا لەزارن و پێ ناچێ لە دەوروبەری ماڵی خۆمان منیان بینیبێ ، ئەوەش هۆشیاری و متمانەی لە ڕادەبەدەری تۆ سەبارەت بە من نیشان دەدا . لەمە زیاتر من لەسەری

ناڕۆم كه خۆم به تۆ وه بنوسێنم . تۆ دەتوانی ئەگەر به ژیان گوزەراندن لەگەڵ منا ناڕەحەتی ، خۆت ئاسوودە بكه و من دەزانم كه چارەنووسم له سەرەتاوه لەگەڵ بەدبەخت یا, جمك بووه و ئێستا ش تاڕادەیەك دەتوانم بڵێم كه خۆم بۆ پێشوازی له هەر جۆره ڕووداوێك ئاماده كردووه . بەڵام ئەوەی كه نووسیووته " كاتێ دێ ی بۆ تاران حەوسەڵەی پیاسه و گەڕانت نیه ئەوەش مەیل و ئارەزووی تۆیه . من خۆم دەزانم نەچووم بۆ پیاسه و سینەما وخوای منیش دەیزانێ. ئێستا تۆ باوەڕمەكه و من مەبه بۆ پیاسەو گەڕان .ڕەنگەنەزانی كەكونجی ماڵ و بیركردنەوەم زیاتر له هەموو شتێ خۆش دەوێ و زۆر مەمنوون دەبم ، ئەگەر تۆ نەم بەی بۆ پیاسه و ڕێگەم بدەیتێ ئەم مانگەش لەسووچی ماڵەوه دابنیشم و بیربكەمەوه .نووسیووته كه خۆم خواردنی خۆم لێ دەنێم ، یان ، نا ، هەڵبەت من بڕیارێكی ئاوام هەبوو ، بەڵام ڕووبەڕووی نارەزایی دایكت بوومەوه و جگه لەوەش من 15 ڕۆژ له تاران " شاهی "ییەك پارەم پێ نەبووه . چۆن چۆنی دەمتوانی خۆم شت بكڕم و ، خواردن لێ بنێم . هەڵبەت كاتێ تر هاتی ، خۆم ئیشی خۆم دەكەم و ، وچێشت لێدەنێم .

پەروێز ، بەتێكڕا ، وا له نامەكەی تۆ گەیشتم كه زیاتر گرنگی به قسەی هاوڕێكانت دەدەی تا قسەی من.هەڵبەت هەركه سێ لێپرسراوی كارو كردەی خۆی دەبێ و فەرمانڕه وایی بیرو بۆچوون و باوەڕی خۆی دەكات . ژیانم تاڕادەی پێویست تاڵه وهیچ كاتێ ئەو سوكایەتیەی بەمنت كردووەو لەبەردەم هەركەسێكی سووكدا وئەو جوێنانەی كه داوته به من ، ناتوانم له بیری بەرمەوه .دڵم پڕه له ئازارو خەم . چیتر هەوڵ مەده كه زیاتر بمڕەنجێنی و ئازارم بدەی .





ڕەنگه بەرژەوەندی لەوه دابێ كه باوەڕ بەقسەی یەكتر بكەین ، نەك قسەی خەڵكی. چونكه خەڵك له پشت منەوه زۆر قسه دەكەن و هەڵبەت من دەزانم كەتۆ بەو جۆرەی كەخۆت چەندجارێك چ له تەنیایی داو چ لەبەردەم خەڵكاندا و تووته ، ژیلن گوزەراندن لەگەڵ منا بەجۆرێك لێ بوورد ن به فیداكاری دەزانی و من ئامادەنیم لەمه زیاتر تۆ لەگەڵ بوونی پیس و بێ بەهای خۆما نارەحەت بكەم. هەركاتێ بتەوێ و بڕیاریدەی من وەكو سێبەرێك دەڕۆم وگوم دەبم و تۆ ئیتر هیچ كاتێ ڕەنگی من نابینیتەوه. بەڵام ئاگات له خۆت بێ بەهەڵه دا نەچی و ئەوانەكه بەدوای نێچیردا دێن وبەدەستی خاڵی دەگەڕێنەوه بیرو هزرت به درۆكانی خۆیان نەشێوێنن . من به پاكی ده مێنمەوه و پاك ماومه تەمەوەو ئێستا تۆو هاوڕێ كانت هەرچیەكتان دەوێ بیڵێن ئیتر قسەیەكم نیه .

فروغ

**پەرویزی** ئازیزم بۆ هەفتەیەك دەچیٚ كە نامەت بۆ نەنووسیوم . نازانم هۆكەی چی یە. زیاتر وای بۆ دەچم كە لەمن زیزی بووی.بەلاّم دیسانەوەش نازانم بەچ بەڵگەیەك.چونكە من كارێكی پێچەوانەی مەیل وحەزی تۆم نەكردووە .

پەروێز.هیوادارم لەهەر حاڵێكدای و هەربیرو بۆچونێكت دەربارەی من هەیە ، لە بیری بەیتەوە, چونكە من هەمیشە تۆم بە هەموو گیان و دڵمەوە خۆش ویستوە و ، هیچ كاتیٚ ئەوە نەهاتووەبە خەیاڵما كە جگەلەتۆ دەتوانم یەكێكی ترم خۆشبویٚ .پەروێز ، نازانم سەبارەت بە من ، چۆن چۆنی بیردەكەیتەوە .

ژیانی من پەرێشان و ناڕەحەت بووە ، وە من هیچ نازانم چی بكەم . سەرەتا بیرم دەكردەوە كەهۆی نامەنەنووسین ئەوەیە كە خۆت دەتەویٚ بییێتەوە بەلاّم ئێستا ئیتر ئەو هیوایەم نیە ، چونكە ماوەی نزیكەی هەفتە یەك تێپەڕیوەو ، دیسانیش هەوا لێكی تۆم نیە. هەڵبەت تۆ هەقتە لە من زیز بیت ، تەنانەت هەقتە من تەلاّق بدەی . بیرم دیٚ ، پار جارێك لەبەر دەم خەسرەو، دایكتا پێت وتم“" هەركەسێكی تر لەجیٚ من بووایە ، تاكو ئێستا تۆی تەلاّق دابوو" . هیچ كاتیٚ بیرەوەری ئەوقسەیەو ئەو كاریگەرییە تالەٚی كەلیٚ ی كردم لە دڵم ناسڕێتەوە. بیٚ گومان بەو جۆرەی كە تۆ بۆی چوویت، من





شان وشكۆی تۆم نیە ومن ناتوانم تۆ لە ژیاندا خۆشبەخت بكەم و تۆ زۆر مرۆڤێكی بە ئارام ودنیا دیدەیت كە تاكو ئێستا منت هێشتۆتەوە . هەڵبەت تۆ دەزانی كە ئەگەر تۆ من تەلاّق بدەی ئەوەندە ش نەزان نیم كە دوو رۆژە سەر لەخۆم بشێوێنم. وە لەوەش زیاتر ئەمە مەسەلەیەك نیە كە تەنها لەمن روویدابیٚ و، لە هەموو ئەوانەش بترازیٚ من دەتوانم بەهێزی بازوی خۆم كاربكەم و پێویستییەكانم دەستەبەربكەم ومانایەكی نیە كەفاسدو خراپ بم. لەگەڵ هەمووئەمانەدا هیچ كاتیٚ نامەویٚ لێت جوداببمەوە و زۆربەی كات توانج وتەشەرەكانت وەكو پار بەو پەری خوێنساردییەوە تەحەممول دەكەم و ،تەنها بیرە وەری تاڵی لەرۆح و دڵی منا دەمێنێتەوە. پەروێز لە من زیز مەبە . چونكە ئەگەر هەلەٚیەكیشم كردبیٚ ، سووچی خۆم نیە . من ناتوانم بە تۆی بڵێم كە چەندە مرۆڤێكی بێچارەم . من دەزانم كە شیعرو هونەر خۆشبەختیان بۆ نەهێنام. وەك چۆن بۆ هیچ كەسێكیام نەهێناوە . بەلاّم من دیسا نەوە بە هەموو توانا وهێزەوە داوای ئەوە دەكەم و كاتیٚ دەبینم لەوەی كەداوای دەكەم دوورم و تەنگت پیٚ هەڵچنیووم ، دنیا لەبەر چاوما تارێك دەبیٚ و ،بیزار دەبم لە ژیان. من تۆم خۆشدەویٚ. ئێستا تۆ دەتە ویٚ تەلاّقم بدە. دەشتەویٚ مەیدە ئەوە بزانە كەتۆ تەنها پیاوی ژیانی منیت وهەمیشە ولە هەموو كاتێكدا دەبیت .

ماچت دەكەم

فروغ

**تا چ** رادەیەك خۆپەرستن وبیرناکەنەوە ،بەلاٚم تۆ وانیت .تۆ تەنانەت لەو حالەٚشدا بەبەردەوامی لە بیری مندا بووی و هەوڵتداوە تا ئەو شوێنەی کە دەتوانی خۆشیم پیٚ بدەی .من خەجالەٚتی تۆم .تۆ بۆچی ئەوەندە چاك ومیهرەبان و جوامێریت .بەخوا من خەجالەٚتی رەوشتی تۆم. من لە خۆم خۆشم نایی ، لەبەرئەوەی زۆر بیٚ چاوو رووم . ئەم شتانە نابینم و زوو لەبیریان دەکەم و ئەوسا لەسەر مەسەلەیەکی بچووك دەبمە هۆی بێتاقەتکردن و ئازار دانیتۆ.

بەخو اگاڵتە بووە . تۆ هەقتە لە خۆتم دوور خەیتەوە ودەرم بکەی . لەبەر ئەوەی من ژنێکی خراپم ، من قەدری تۆ نازانم .من روو دارو هەقنەناسم .ئاخ تۆ لات وایە لاوێتی و ژیانی من بیٚ تۆ بەهاو ، نرخێکی دەبیٚ ؟ تۆ لات وایە من بێجگەلە تۆ دەتوانم سوود لە لاوێتی و گەرمی وچالاکی خۆم وەربگرم؟ نەبەخوا. پەروێز باوەڕکە من پێویستم بە تۆ هەیە .پێویستم بە بوونی تۆ هەیە و ،بێجگە لە تۆ لە هەموو جیهاندا پیاویٚ نی یە بۆ من, من تەنها تۆم خۆشدەویٚ و، خۆشم دەوییێت . تۆ جیاوازیت هەیە لەگەلٚ هەموو ئەو بوونەوە رانەی کە بە ناوی پیاوەوە لەسەر رووی زەوی دەژین تۆ لە هەموو ئەوانە باشتر و بەرزتری . تۆ هەقتە دارکاریم بکەی . لەبەر ئەوەی من خراپ بووم . زۆر خراپ بووم . لە بری ئەوەی کە تۆی مێردی چاك ودورەوە





کەوتووم بەقسەی شیرین دڵبدەمەوە ، بیٚ وچان جوێن بە تۆ دەدەم . دەبیٚ زمانم ببڕی .من شایستەی ئەو سزایانەم. بەخوا هەلەٚم کرد . پەروێز من لە کویٚ وهونەر لە کویٚ . من کەی هونەرمەندبووم و بانگە شەی هورمەندیم کردووە من کەی باسم لە هونەرەکەی خۆم کرد ووە. هونەری من تەنها جوێن دانە ، مردوو شۆر ئەو هونەرە ببەن کە بیەویٚ من لە تۆ جیا بکاتەوە .

من هونەرم بیٚ بوونی تۆ ناویٚ. من هەر هونەرمەندنیم . مەگەر هەر کەسیٚ توانی قەلەٚمیٚ بەدەستەوە بگریٚ و دووسیٚ رستەی فارسی بنوسیٚ ، هونەرمەندە. ئەگەر من ژنێکی هونەرمەند بوومایە، بەرلە هەموو شتیٚ کارێکم دەکرد کەتۆ هیچ کاتیٚ لە من نەڕەنجێی.هیچ کاتیٚ لەدەستی من تووڕەنەبی. من و هونەر چەند فرسەخێك لەیەکەوە +نیمە بیکەم بە چاردانە ! ئەگەر من هونەرمەندبومایە ، تۆ زۆر لە من هونەرمەند تری. هونەری تۆ رەوشتی پەسەندکراوی تۆیە .من خەجالٚەتی تۆم .

پەروێز تۆ هەقتە هەر چۆنیٚ کە دەتەویٚ لەگەلٚ منا رەفتاربکەی .من شایستەی هەموو جۆرە سزادانێکم . من ئامادەم لەبەر ئەو بیٚ ئەدە بییەی کە کردوومە ، قورسترین سزا بدرێم. تۆ سزاکانی من دیاری کە ولەنامەی داهاتووتدا بینوسە .من ئەوسزایە لێرە وەك خۆی ئەنجام دەدەم .تکات لیٚ دەکەم سزام بدە .

پەروێزی من ئەوبیرە لە سەروکەللەت دەربکە . هەرگیز بە خۆت ڕامەگەیەنە کە پیری. دەزانم کە خۆم هۆکاری سەرهەڵدانی ئەو بیرەم . بەلاٚم ئێستا زۆر پەشیمانم . من لە رووی سادەیی و کەم هزرییەوە ویستم گاڵتە بکەم .لە بری ئەوەی تۆ بێنمە پێکەنین . هەستی پیاوە

تیتم رووشاند.من زۆر خەجاڵەتم،من داوای لێبوردن دەکەم .بمبەخشە ،من زۆر بێ هزرم . لە دوای ئەوە هەوڵدەدەم وەك مرۆڤێکی ئاقڵ قسە بکەم .

من تۆم خۆشدەوێ و تەنها مردن دەتوانێ جودایی بخاتە نێوانمانەوە . ئەو ناکۆکیە قەت لە نێوانماندا نەبووە ولەوە بچوکترە کە بتوانێ ببێتە هۆی _کەواتە پەروێزی من .پەروێزی ئازیزی من .تورە مەبە. جوێنم پێ مەدە, خۆت دەزانی کە ئێمە هەردووکمان پێویستمان بە خۆشەویستی یەکتر هەیە و ئەم قسانە، ئەم خستنەپالأنەو تۆمەتانە ، جگە لە تالێ وئازار شتێکیان لێ سەوز نابێ . من تۆم خۆشدەوێ . چونکە تۆ ئەو پیاوەی کە پسوولەی حەز و ئاواتە ناوەکییەکانی منی و تۆش منت خۆشدەوێ . لەبەرئەوە منت بەو شێوەیەی کە ویستووتە ،دەست کەوتووە. ئەگەر من رۆژێك خیانەتم لە تۆ کرد ، تۆ هەقت دەبێ جەستەی من بەو شێوەیەی کە وتووتە پارچە پارچە کەی و چاوەکانم بە پەنجەکانت دەربهێنی و منیش هەر ئاوا ، منیش لە بەردەم تۆدا هەمان ئەرکم هەیە و لە دوای ئەوە خۆشم دەکوژم. من بە تۆی دەسەلمێنم کە ژنم و ژن بە پێچەوانەی بۆچوونی تۆوە جوانترین شاکاری بوونە . ژن دەریای لوتف و میهرەبانییە . ژن بەوەفایەو من تۆم خۆشدەوێ .

خوا حافیز

فروغی تۆ



## شەممە 15 ی تەمووز

پەروێزی خۆشەویستم هیوادارم حاڵت باش بێ .ئەم نامەیە یەکەمین رۆژی گەیشتنم بۆ تاران بۆ تۆی دەنووسم . هەوڵدەدەم بەسەرهاتی سەفەرەکە بۆ تۆشی بنوسم . هەرچەندە کاتێ لە ئەهواز دەرچووین, فارگۆنی ئێمە بە تاڵ بوو ، بەلأم لە رێگا ژمارەیەکی زۆر عەرەب سوار بوون و ترەنجانیانە فارگۆنەکەی ئێمە وەو یەکسەر پیس و پۆخڵی دەستی پێکرد . ئەوەندە دەنگە دەنگیان دەکرد کە خەریك بوو شێت ببم ، سەرەنجام شەو کابرایەك هات و وتی کە تۆ لە وێستگە ئەوت راسپاردووە بۆ من . وتی کە تەنها دەتوانم ئێوە بۆ نووستن ببەم بۆ نومرە یەك بەلأم دەبێ جیاوازی نرخی بلیتەکە بدەی و منیش زۆر تورە بووم چونکە نە دەکرا بەم کارە بوتری ' گوپێدان ویارمەتی. بە هەرحاڵ ( 10) تمەنم دا و شەو لەگەڵ کامی جووین بۆ نومرەیەك چونکە بەهیچ شێوەیەك نەدەکرا لەوفار گۆنەولە نێو عەرەبان هەتا شوێنێکی خالێ بچووك بۆ دانیشتن پەیابکەی . شەویش ئەوەندە گەرم بوو کە بە هیچ شێوەیەك نەخەوتم. بەلأم لەبریدا رۆژێکی زۆرخۆشمان بەسەربرد.چونکە پیاوێك کە لە شەمەندەفەرەکە دا بوو دوایی دەرکەوت کەبرای ئاغای "جلیلی " بە ڕێوەبەری گشتی کاروباری دارایی هێڵیئاسنینە وباوکی تۆی دەناسی ، کاتێ زانی ئێمە لەگەڵ ئەودا نزیکین، زۆریارمەتی داین و وتی کەئەگەر

زووتربمزانیایە شەوخۆم جێگەیەکی باشترم بۆ ئامادە دەکردن.سەرەنجام رۆیشت وفەرمانیدابەیەکێ لەفارگۆنێکی بەتاڵێ خستەبەردەستمانودواتریش بەرێکوپێکی لەرووی ئاوخواردنەوەوە کە لە شەمەندەفەرەکەدا وەکو کیمیایی لێ هاتبوو ، یارمەتی داین و بەر ێکوپێکی ئاوی دەدا بەکامی . بەڵام باسی فرامەرز هەرمەکە, ئەو هەر هیچ خۆی لێ تێ نەگەیاندین . هەرچەندە کە من لە راستیدا پێ ویستم بەیارمەتی ئەو نەبوو ، خۆم بە تەنها دەمتوانی ئیشوکارە کانم جێ بە جێ بکەم ، بەڵام ئەو وەك ئەوەی کوڕە پووری تۆ نەبێ و ، ئێمە نەناسی ٚ ، هەتا کاتێ گەیشتینە تاران , لەگەڵ ئەوەی کە خەسرەویش هاتبووە وێستگە ، هیچ کەس لەگەڵمان نە هات و من خۆم تاکسی یەکم گرت و چوومەماڵەوە . هەڵبەت ئەمانە ئەو شتانەن کە تەنها وەك راپۆرتی سەفەر بۆ تۆی دەنووسم ،نەك گللەیی و هیوادارم تۆش لە مبارەوە بەو شێوەبە بیربکەیتەوە .سەرەتا چووین بۆ لای دایکم و جانتاکانم داناو دەست و دەموچاوو خۆمم شت و جلوبەرگەکانم کەبەتەواوی رەش بوو بوو گۆڕی و ئەمجا چوومە لای دایکت. کامی هەموویانی دەناسی و دیسان دەستی کردەوە بەهاروهاجی, ماوەیەك لەوێ بووین"دۆخی"هەمان رۆژ بەیانییەکەی چوو بوو بۆ" وادیان"و من ئەوم نەبینی دواتر هاتینە ماڵەوەو چونکە هیلاك بووم نووستین و ئەمڕۆش پوران دێت بۆ ئێرە. من جگە لەوەی دەبێ بچم بۆ حەمام و دەمەوێ عەسر جانتاکانم هەڵبگرم و بچم بۆ لای دایکت و هیوادارم لێم رازی بێ . بەهەرحاڵ لە ئەهوازەوە بۆ تاران نزیکەی 30 تمەنم خەرج کرد ، بێ ئەوەی کە زیادە خەرجیەك هەبێ.خەرجی بارکردنی کەلوپەل و کۆڵ هە ڵگرو تاکسی و جیاوازی





نرخی بلیت ونموونەی ئەوانە وخواردن . بۆ بینینی کتێبەکەم هیچ کۆششێکم نەکردو باوەرپش ناکەم کارێ بکەم کە تۆ نارازی بیت .ئەمە بە سەرهاتی سەفەرە کەم. بەڵام ئێستا بڕۆینە سەر کرۆکی مەسەلەکەی خۆمان. هیوا دارم تۆ لە نەبوونی ئێمە زۆر ناڕەحەت نەبی. هەمیشە کاتێ لە تۆ دوور دەکەومەوە درك بەوە دەکەم کە ژیانی دورلە تۆ مەحاڵە. وەمن و تۆ هەرچەندێ لەگەڵ یەك بەشەڕ بێین ، هیچ کاتێ دڵمان لە یەکتر جیانابێتەوە . پەروێزم نازانم ژیانی ئێمە بۆچی وای لێهات . من هەمیشە بیر دەکەمەوە کە ئەگەر وانە بووایە ئایا ئێمە خۆشبەختر نەبووین . بەڵام لەهەمان حاڵدا قبوڵ دەکەم کە مەحاڵە لە ژیاندا ئەو حاڵەتانەت نەیەتەڕێت. بەهەر حاڵ تۆ دەبێ تاکو ئێستا درکت بە وە کردبێ کە من خۆشم دەوێ ی و ، هیچ کام لەو رووداوو شتە نەشیاوانە نەیتوانیوە موحیبەت و عیشقی من بەرامبەر بە تۆ کەمبکاتەوە . پەروێز گیانم تکای من لە تۆ ئەوەیە کە دەرباری من بەهیچ شێوەیەك ناڕەحەت نەبی, من قسەکانی تۆ قبوڵ دەکەم و تۆ خۆت کاتێ ببێیت بەو خالە بەئاگا دەبیت .بەڵام لە هەمان حاڵدا شتگەلێك لە دڵمایە کە هەمیشە ئازارم دەدا و سەرجەم ئازارو ناڕەحەتییەکانی من لەوێوە سەر چاوە دەگرێ وە نازانم کەی راحەت ئدبم وکەی ژیانم وازم لێ دێنێ. پەروێز تۆ من ناناسی مانای وایە لە قولاّیی گیان و فیکری من تێنە گەیشتوویت. هەندێ کات لەو بڕیارانەی بە سەرمندا دەیدەی ، بەوپەڕی متمانەو باوەڕیشەوە دەیکەی. ئەوەندە سەرم سووڕ دەمێنێ و ئەوەندە ناڕەحەت ئدبم ، کە بێ ڕادەیە.

گریمان من ژنێکی خراپ و بەد بەخت بم ، بەڵام تا ئەو شوێنەی کە خۆم دەیزانم نامەوێ خراپە لەگەڵ تۆ بکەم . چونکە تۆم خۆشدەوێ. تەنها هەندێ کات شێت دەبم و هەڵس و کەوتێك لێمەوە بە دیار دەکەون . کەخۆشم دواتر پەشیمان دەبمەوە.

پەروێز بمبەخشە ئەگەر بەختەتێکی ناشیرین دەنووسم .هەڵبەت ئەم نامەیەم لەسەر حساب مەکە . رەنگە عەسر نامەیەکی درێژو باشت بۆ بنووسم لێرە ئەوەندە منالْ دەنگ دەنگ دەکەن کە مرۆۋ لە هیچ شتێ تێ ناگات و حالێ نابێ.چاوەڕێ ی نامەی تۆم .هیوادارم گەرما زۆر نارەحەتت نەکات. لەلایەنی خواردنەوە هەوڵبدە بەرنامەیەکی رێکو پێك ئامادە بکەی . ئاواتی من ئەوەیە کە زووتر بێیت . تا من لەکارەکانما سەربەستییەکی زیاترم هەبێ و ، بتوانم بە پشتی تۆ بەرەو پێشەوە بچم . پەروێز تۆم خۆشدەوێ . باوەڕ بە قسەم بکە .

تۆ ماچ دەکەم

فروغ



## دووشەمم 17 ی تەمووز

پەروێزی ئازیزم ، هیوادارم حاڵت باش بێ. لە حالێ من و کامی بپرسی ، خراپ نین وە بەبێ ئارامییەوە چاوەڕوانی هاتنی تۆ دەکەم . دوێنێ نامەیەکم بۆ نووسیت و ئەمڕۆش دووەمین نامەم دەنووسم لە عەسری رۆژی شەممە وە هاتمە لای دایکت وەئێستا سەرقالێ ژیانم . کەش هەوای تاران بە پێچەوانەی ئەوەی کە رۆژنامەکان نوسیوویانە زۆر باشە ، یانی بۆ ئێمە ! ئەوێ کە ئیتر نازانم . بێ گومان زۆر فەرقی نەکردووە . پەروێزم سەبارەت بەکتێبەکەم تەلەفونم کرد بۆ ئەمیرکەبیر و نوسخەیەکیان بۆ ناردم بۆ ماڵەوە. من دانیشتم و ، هەڵە چنییم کرد و ئەمڕۆش بڕیارە بێن و بیبەنەوە. شیعری ئەسیترەکان و شەوێکیش تیایە . یانی خراوە تەسەر کتێبەکە و پێشەکییەکەی " شیفا " یش زۆر باش بوو. وەبەکورتی گوایە رۆژی شەممە ئیتر بڵاوببێتەوە . هەروەك تۆ وتت پەیوەندیم بە هیچ کەسێکەوە نەکردووە " حائری " دووسێ جار تەلەفونی کرد و داوەتی کردم بۆ " ئەنجومەنی دانشوەران " وتی پیشتر گفتم بەمیوانەکان داوە ، ئێوە بانگێشت بکەین و ، بیگومان ئەم دانیشتنە بۆ ڕیز لێنانی ئێوە یە . بەڵام من وەك چۆن گفتم بە تۆ دابوو ، داوای لێبوردنم کرد ، وتم بیریش بکەرەوە کە من هێشتا لە ئەهوازم . هەڵبەت کاتێ مێردەکەم هاتەوە

بەوپەڕی حەزو مەیلەوە .کتێبەکەم زۆر جوان لە چاپدراوە و بەتابیەتی پشتی بەرگەکەی زۆر جوانە . ئەگەر من کتێبەکەم نەدیبایە بە هەلەوە لە چاپ دەدراو هیوادارم کە ئیتر تۆ ناڕەزایی دەرنەبڕی ، کە بۆچی تەلەفونم بۆ أ ئەمیرکەبیر کردووە . پەروێز گیانم ، نازانم تۆ لەویٚ چی دەکەی . نامەت کە هێشتای نەگەیشتووە بەلاٚم ئاواتم ئەوەیە کە لەهەموو حالەتێکدا خۆشبەخت و رازی بیت . دوێنیٚ چووم بۆ بازلڕ و بڕێك قوماشم کڕی. هەڵبەت نەك بڕێك ... چونکە ئەو کاتە خەیالٚ دەکەی 10 یا 20 مەتر. نە ، تەنها کراسێك. ئەویش لەبەر ئەوەی قوماشەکەی چاك و هەرزان بوو .

پەروێزم، ئێستا چونکە دووسیٚ رۆژە کە لە تۆ دورکەوتوومەتەوەو دەورو بەریشم پڕە لە منالٚ ومەزن . زۆر ناڕەحەت نیم . بەلاٚم کاتیٚ دیداری ئەوان ئاسایی بۆوە بۆم ، ئەوکاتە زیاتر هەست بەدووری تۆ دەکەم . هەمیشە لە ژیاندا پێویستم بە تۆ هەبووە . چ ئەو کات و وەختەی کە لە یەکتر زیز بوو بووین و ، چ ئەو کات و وەختەی کە حالٚەتی ئاسایی هەبوو . لە هەموو حالٚەتێکدا هەستم کردووە کە تەنها پشتیوانی من تۆ یت . هەندیٚ کات بیر دەکەمەوە کە بۆچی دەبیٚ بوونی پیسی من ژیانی تۆ تا ئەو رادەیە ناڕەحەت و پڕ لە ژاوە ژاو بکات . بە توندی رقم لە خۆم دەبێتەوە و ئاوات دەخوازم کە بمرم و لە جێیدا تۆ خۆشبە خت بی و خەڵکی نەلٚێن کە من ژنێکی خراپم . تۆ من باش دەناسی من لە هیچ شتیٚ ناترسم و ئەگەر بڕیاربدەم هیچ ئیشیٚ بە لامەوە نە کردەیی نیە . من لەوەی کە ماوەیەکە ژیانی تۆم تالٚ کردووە ئازار دەچێژم و بەداخەوەم کە بۆچی ناتوانم وەکو ژنانی تر بەقەناعەت و رازی بم و ئەوەندە هیوا و ئارەزوو لە دلٚمدا پەنهانە و





چونکە ژیانی رۆتینی رۆژانە قەناعەت بە من ناکات گومانی تیا نیە ، رۆژیٚ دیٚ کە من لە دەست بیروباوەڕی خۆم و لەدەست باری گرانی ئەو ئەشکەنجەیەی کە لەسەر شانمە هاوار بکەم و دیسانەوەش ناچارم داوای کۆمەك لە تۆ بکەم . لەبەر ئەوەی جگە لە تۆ کەسێکم نیە و لە هەمان حالٚدا کە ئازاری منی ، دەوای ئازاری منیشی و من نازانم تۆم بۆچی خۆش دەویٚ . خۆشم دەویٚ ی وەکو منالێك کە زیاد لەهەر شتێکی تر هۆگری باوەشی گەرمی دایکیەتی و ئەگەر دایکیشی بە تووندی سزای بدات ، دیسانەوە پەنا بۆ دامێنی ئەو دەبات.

پەروێز هیوادارم نامەکەی من تۆی هیلاك نەکردبیٚ و لە هەمان حالٚدا دیسان وەکو پار نەلٚێیکە نامەکانت شێوازێکی تریان پەیدا کردووە . ئا بەمە رازی بە چونکە هەقیقەتە و باوەڕناکەم لەو بێچمە درۆیانەی کە چیتر لە من و تۆ نایەت. هیوادارم زووتر بێیتەوە چاوەڕیٚ ی نامەی تۆم

ماچت دەکەم

فروغ





## شەممە 18 ی تەمووز

پەروێزی خۆشەویستم دوێنێ هەینی بوو ، من وەك هەمیشە لە بەیانیە وە  چووم بۆ ماڵێ ئێوە . ماڵێ ئێوە ئێستا ئیتر زۆر چۆڵ بووە تۆی لێ نیت وخەسرەویش چووە بۆ دەماوەند ،ئەوانی دیکەش کە هەر هیچ دەنگیان لێوەنایەت . رۆژێکی خۆشم بە سەربرد .

پەروێز گیان ئێستا من و دۆخی بووینەتە هاوڕێ .من تا ئێستا نەمدەزانی کە دۆخی ئەوەندە شەیتانە . دوێنێ دوای نیوەڕۆ ئێمە ئەوەندە پێکەنین کە هەمووان لەخەو هەڵسان . من و دۆخی دەمانەوێ هەفتەی داهاتوو پێکەوە وێنەیەك بگرین و بۆ تۆی بنێرین . بڕیار دراوە نیوەی پارەکەی  من بیدەم نیوەکەی تریش ئەو . لەسەرنان خواردن مەنۆچەهر وێنەی گرتین و عەسریش دایکت من ودۆخی برد بۆ پیاسەو گەڕان. چووین هەتا نزیك ئاوی کەرەج وماوەیەك پیاسەمان کرد و خواردنێکییش بۆ کڕین. شەویش کە من دەمویست بۆ ماڵ بگەڕێمەوە ،باوکت شیرێك  و دوو قاڵب سابون و گۆڤارێکی "تاران مصور " ی دا بە من .

پەروێز گیان من بێئەندازە مەممنونی هەموو ئەو کەسانەم کە لە نەبوونی تۆدا موحیبەتم بەرامبەر دەکەن . حەز دەکەم رەوشێ بێتە پێش و من  بتوانم بەشێوازێکی چاك  سوپا سگوزاری ئەو هەموو

لوتف و میهرەبانیە بکەم. باشترین ساتەکانی تەمەنی من لەنێو ئەوانەدا تێدەپەڕیٚ و هەرچەندە کە هەمیشە نەبوونی تۆ ئازارم دەدا ، بەلاٚم ئەویٚ بۆ من لە هەموو شوێنیٚ باشترە.

پەروێزی ئازیزم لێرە دوو سیٚ رۆژە هەموو بیرو خەیالیٚ من لە دەورو بەری ژیانی دا هاتووم دەخولێتەوە . نازانی چ بیروخەیاٚلێك دەکەمەوە ، چ پلانێك دا دەڕێژم و ، چ بەرنامەیەك رێك دەخەم . ئەگەر بزانی پێم پێدەکەنیت . چونکە من خۆشم لە نێو ئەم هەموو پلان و بەرنامانەدا سەرگەردانم. تۆ لەبەرچاوما بەرجەستە دەکەم. منالەٚکەشمان ,خۆم و مالەٚکەمان و لەبەر چاوم هەموو شتیٚ جوان خۆی دەنوێنیٚ . من زۆر خۆشبینم بە ژیانی دا هاتووم . پەروێز بەخوا من کاتیٚ بیردەکەمەوە کە بوومەتە ژنی مالٚێك و بۆ نموونە بەیانی دەبیٚ هەلٚسم ونانی بەیانی بۆ مێردی چاکم دروست بکەم ، دلٚم لە تاسەو خۆشیدا دەلەرزیٚ. من بەبەردەوامی چاوەڕوانی ئەو رۆژانە دەکەم .من حەز دەکەم تۆ زووتر بێیت وئاواتەکانی من بێتە دی. دلیٚ من زۆر شتی دەویٚ . نیگای من کە بەر رووی ژن و پیاوێکی لاو دەکەویٚ کە دەستیان لە نێو دەستی یەکتر ناوە و لە شەقامەکەوە ڕەت دەبن ، هەر لە خۆوە ئارەزووی تۆ دەکەم .دلٚم رق و حەسوودی دەیگوشیٚ .من بەم دواییە بوومەتە حەسوود وەجگە لە تۆ حەسوودی بەهیچ کەسێکی تر نابەم . پەروێزم خۆشەویستی دلٚم ، زووتر وەرە .من ئارەزووی دیداری تۆ دەکەم .من حەزدەکەم زووتر بێی من تۆم زۆر خۆش دەویٚ . زۆر . _ هەر هێندەی کە تۆ منت خۆشدەویٚ و بگرە زیاتر . پەروێزی من ، دلٚم زۆر تەنگ بووە بۆت. زووتر وەرە کە هەر چەندیٚ بلٚێم زووتر وەرە کارناکاتە سەر بە رواری هاتنی تۆ ،



لەبەر ئەوەی تۆ دەترسی ببیتە ئامێری دەستی من.بەلاٚم دیسانەوەش دەلٚێم زووتر وەرە، توخوا زووتر وەرە.

ماچت دەکەم

فروغ

## شەممە 21 ی تەمووز )

پەروێز گیانم ، نازانم بۆچی نامەم بۆ نانوسی ، زۆر ناڕەحەتم, ئێستا نزیکەی شەش رۆژە کە هاتوومەوە وهیچ هەوا ڵێکی تۆ نازانم . هیوادارم حاڵت باش بێ. لە حالێ من وکامی بپرسی خراپ نین , بەلاّم من خۆم نازانم بۆچی ماوەیەکە ئەوەندە بێ تاقەتم . وەك بڵیی کە ئیتر مێشکم بەرگەی هیچ شتێك ناگرێ . ئەوەندە بێ هێزوماندووم کە بەکەمترین ناڕەحەتی لە ژیان بێزار دەبم .لەهەمووی خراپتر ، تۆش لێرە نیت و  من نازانم بە چ شێوەیەك خۆم هێور بکەمە وە.پەروێز بەبێ ئوقرەییە وە  چاوەڕێ ی هاتنی تۆم . ئیشی کتێبەکەم هەروەك بۆم نووسیت “ بڕیار بوو ئەمڕۆ بلاّوببێتەوە . بەلاّم دیسان گوایە گرفێتك هاتۆتەپێش وە . بەهەرحالێ شەممە ئیتر ئەوپەڕەکەیەتی .

پەروێزم من زۆر لە تەنیایی ناڕەحەتم و لە سەرووی هەموویانەوە نازانم بۆچی ئەوەندە دەترسم . هەستێکی نادیار بەردەوام پەریشانم دەکات . نازانم ناوی چی لێ بنێم ، وەك ئەوەیە کە روداویکی خراپ لە کە میندایە بۆم .هەمیشە خۆم لەبەردەم مەترسیدا دەبینمەوە و هەست  دەکەم کە لە مرۆڤێکی بەدبەخت بەولاوە زیاتر نیم ، چونکە رۆحم ناجێگرو مێشکم بێ هێز بووە . پەروێز نازانم چی بۆ تۆ بنووسم . تۆ کە منت فەرامۆشکردووە و هەر هیچ نامەم بۆ نانووسی





. بەلاّم ئاواتم ئەوەیە کە لە هەر کوێ یەك هەیت شادو بەختەوەربی. بۆ من ئەوە گرنگ نیە . کە تۆ نامەم زۆر بۆ نووسی . گرنگ ئەوەیە کە خۆشت بوێم وئەوەش بزانە کە خۆشم دەوێ ی .

پەروێز گیانم دوێنێ شەو کامی لەگەڵ کلۆرو فەرەیدوون ومنالاّن چوو بوو بۆ کافتریای شارەوانی و بەکورتی کاتێ هاتەوە زۆر خۆشحالێ بوو ، چونکە دەزانی کە کەرەستەی یاری بۆ منالاّن لەوێ زۆر و بەرفراوانە وبە کورتی بڕیارمدا هەندێ جار لەگەڵ منالەکانا ئەو بنێرم . چونکە لە مالەوە کەس نیە یاری لەگەڵدا بکات ، کاتێکیش دەچێ بۆ لای دایکت لە جیاتی یاریکردن هەڵدەکوتنە سەرو کەللەی یەکترو باش نیە . پەروێز من لە باوکم زیزم وئیتر هیچ کاتێ لەگەڵێ پێك نایەمەوە .چونکە ئەو منی خۆشناوێ و هەرچی قسەی خراپە بە دەمیدا بێت و لە پشتەوە پێمی دەڵێت . منیش بڕیارم داوە کە بە هیچ جۆرێ نەیبینم و تاکو ئێستاش نە مبینیوە و هیوادارم هیچ کاتێ ناچار نەبم ئەو ببینم . پەروێز گیانم خۆشم دەوێ ی و چاوەڕێ ی هاتنتم .

فروغ

## سێ شەممە ( 23 ی تەمووز )

پەروێز ئەمڕۆ لەدوای 10 ڕۆژ نامەیەکی تۆم پێگەیشت .مەمنوونتم لەوەی کە بیرێکی منت کردووە و ئاواتم ئەوەیە کە تەمبەڵییەکەت زووتر لاچێ و نەمێنێ و زووتر بێیت بۆ تاران . هیچ گومانێکت لەوە نەبێ کەمن تۆم خۆشدەوێ ، بەڵام لەوەی کە بوونەوەرێکی خۆشبەختم و ئایا توانیوومە تۆش بەختەوەرو رازی بێڵمەوە هەمیشە گومانم هەیە.

پەروێز ئەمڕۆ کاتێ نامەکەی تۆم خوێندەوە هەر لە خۆوەدڵم داخورپا . من نامەوێ ئازاری تۆ بدەم لە ژیانا . پەروێز من شانو شکۆی تۆم نیە و دەبێ دوای چارەنووسی رەشی خۆم بکەوم .تۆ هیچ کاتێ نابێ رەحم بەمن بکەی ، چونکە ئەو تاسەیەی کە من هەمە بۆ هونەرەکەم ، ئەوەندە بەسەرما زاڵە کە ئیتر گوێ بە هیچ شتێ نادەم. کاتێ لەگەڵ تۆدام و کاتێ خۆم دەدەم بە دەست ژیانی ئاسایی یەوە ، هەست دەکەم و دەسەلمێ بۆم کە پێشکەوتنێکم دەست ناکەوێ و کاتێ بڕیار دەدەم لە تۆ جیا ببمەوە ، شەپۆڵێ لە عیشق و موحیبەت دڵم دەگرێتەوە و زەبوون و بێچارەم دەکات . پەروێز ماوەیەکە کە بەد بە ختم . بەدبەخت ، نازانم چ چارەنووسێ چاوەڕێم دەکا. ترسێکم لە ئایندە نیە چونکە مەرگ لەسەروو هەموو شتێکەوە یە. وەئەگەر





من بمرم بێ گومان هەم تۆم ئاسوودە کردووە و هەم خۆشم . بەڵام من نامەوێ بوونی من ببێتە مایەی نەنگی و ئەشکەنجەی تۆ. تامەوێ موحیبەتی من ، تۆ سووك و ریسوابکا و رەحمم پێ بکەی .پەروێز زووتر وەرە رزگارم بکە .ئەم نامەیە لە ناخی دڵەوە بۆ تۆی دەنووسم هیچ رووکەش کاری ناکەم . هێزێك لە دەروونی منا بێدار بۆتەوە ، وە فەرمانم پێ دەکا کەلەمە زیاترت ئەشکەنجە نەدەم .

پەروێز من ئامادەم بمرم و لە جیاتیدا ئیتر ناچار نەبم لەبەر تاسەیەك کە لە دڵمایە تۆ ئەشکەنجەبدەم . پەروێز چارەنووسی من جیایە لە چارەنووسی تۆ . دەڵێی من بۆ چارە رەشی و ئازار چەشتن ، خوڵقاوم . نەمویست ئەم شتانەت بۆ بنووسم بەڵام ئیتر ناتوانم ئیتر توانای شاردنەوەم نیە .ئیترلە هیچ شتێ ناترسم . بەڵام لە هەمان حاڵدا خۆم لەرێ ی شادمانی تۆدا بەخت دەکەم مەلێ بۆچی؟ چونکە دەزانم کە بوونی‌من لە راستیدا مایەی ئەشکەنجەی خاتری تۆیە.

پەروێز وەرە هەر چیەکت لێم دەوێ بیکە. لە جیاتیدا من ئیتر لە ژێر فشاری ئەو بارەی کە لە سەر شانمە هەست بە مەرگ ناکەم . من نامەوێ تۆ منت خۆشبوێ چونکە شانوشکۆی عیشقی تۆم نیە تۆ دەبێ من دوور بخەیتەوە . لەبیرم بەرەوە و هەر هیچ رەحم بە حاڵێ من مەکە . پەروێز نازانم چی بنوسم و نازانم چی دەبێت ، هەر ئەوەندە بزانە کە ئەگەر ماوەیەك بە سەربچێ من شێت دەبم .پەروێز بمبەخشە و زووتر وەرە. تۆ دەتوانی لە هەموو دنیا دەربارەی من لێکۆڵینەوە بکەی ، بەڵام بەداخەوە ئەفغوس دەخۆم کەژیانم لە دەست دەچێ . پەروێز نازانم چی دەنووسم ئەوەندە بەد بەختم کە ئارەزووی مردن

دەکەم . وەرە و رزگارم بکە . هەرچی دەبێ با زووتر ببێ ، چونکە من ئیتر بەرگەی فشارناگرم

ماچت دەکەم

فروغ

فروغ نامەکەت گەیشت یەکسەر سەبارەت بەو بەڵێنەی کە دابووم . وەفادارم و برەپارەی پێداویستیم نارد کە بێ گومان تاکو ئێستا بە دەستت گەیشتووە بەلاّم چونکە لە نامەکەتدا بەبەیانی ناو کەواتە " ( من خۆم لە مالەوە رەو شێکی باشم نیە . ...) . لەو دەوروبەرەی کە تیایدا دەژیت نارەزابیت نیشاندابوو و ، کە باستکردبوو لە لایەکەوە گوتبوت " دەمەوێ کەمێ کەلوپەلی ناو ماڵ بکڕم ئەوەندە بۆم دەر کەوت کە بەنیازی سەربەخۆ بژیت و ، ئەم مەسەلەیە جگە لەوەی کە بەبۆچوونی من چاك و دروست نیە ، بێ هیچ گومانێك کامی زیاتر لە تۆ دور دەخاتەوە لەبەر ئەوەمن ئیتر رازی نابم کە کامی لە دەوروبەرێکی ئاوهادا کە گوایا بەنیازی بۆ خۆتی فەراهەم کەی هەتا تاقە سەعاتێك بژی .هیوادارم ئەم بۆچونەی من بنەمایەکی راستی نەبێ و تەنها لەرووی بەدبینیەوە بێ .

بە هەر حاڵ ئەگەر بۆ چوونی من راست نیە ، یەکسەر لیستی ئەو کەلوپەلانەی کە پێویستت پێ یانە بۆمی بنووسە تا یەکسەر بۆتی بنێرم . کتێبەکەشت لای منە جەژن بۆتی دەهێنمەوە . لەکۆتاییدا بە خوێندنەوەی کتێبەکەی مارك " ئۆریل " بەجدی رات دەسپێرم وئامادەیی خۆشم بۆ یارمەتی هەمیشە یی بەو هۆکارەوەبۆ تۆ را دەگەیەنم .



## پێنج شەممە ( 25 ی تەمووز )

پەروێزی ئازیزم ، ئەمڕۆ و دوێنێ نامەم لەتۆوە هەبوو .گوایە نوسیوتە حاڵت باش بووە ، ئاواتم ئەوەیە کە هەمیشە سەلامەت بیت .لە حالێ ئێمەش بپرسی ، باشین و تەنها چاوەڕوانی هاتنەوەی تۆ دە کەم . لە نامەکانتا رازی بوونت لەمن نیشانداوە . هەڵبەت من هەمیشە حەز دەکەم کە بیرو بۆچوونی تۆم لەبەر چاو گرتبێ. بەلاّم تۆش دەبێ بیر بکەیتەوە کەزۆر تەنگم پێ هەڵنەچنی. لەبەرئەوە من هەتا ئەگەر پێویستتشم بە ئازادی نەبێ. هەر هزری ئازادی و سروش بەخۆدان دەربارەی ئلزادی، کە سایەتییەکم پێ دەبەخشێ وەیارمەتیم دەدا و هانم دەدا .

پەروێزی ئازیزم, کتێبەکەم لەهەفتەی ئایندەدا بەدڵنیاییەوە بلأودەبێتەوە .سەبارەت بە " فەرەیدون کار " نازانم چیت بۆ بنوسم .ئەو پیاوێکی شەریفەو تۆ نابێ بیرو بۆچوونێکی خراپت لەسەری هەبێ. ئەولەرێگەی دایکتەوە زانیویەتی کەمن هاتومەتەوە, یانی هەمان ئەوشەوەی کەئێمە هاتینەوە، تەلەفونی بۆ ماڵێ ئێوە کرد بوو و دایکت وتبووی کەهاتوونەتەوە وتەلەفونیشی بۆ من کردووە ومن ناچارم کە سەبارەت بەکاری کتێبەکەم لەگەڵ ئەو قسەبکەم . هەڵبەت من لە یەك دووجار زیاتر قسەم لەگەڵ ئەو نەکردووە و,ئەگەر من بمەوێ نەك لەگەڵ ئەو کە ئەو کارەی لە ئەستۆ گرتووە قسەبکەم ،

نەپەیوەندی بەئەمیرکەبیر ەوە بکەم،ئەو کاتە لەدوای ئەوە کە کتێبەکەم چاپکراو پڕ بوو لە هەلە، چیم لەدەست دێ. هەرواش ئەگەر نوسخەیەکیان نەناردا یە بۆم هەر ئاوا بە هەلە چاپ دەبوو . هەڵبەت پەروێز من تۆم خۆشدەوێ. هیچ گومانێکت لەوەدا نەبێت. بەڵام تۆش لەگەڵ منا بەجۆرێ هەڵس و کەوت بکە کە دادوەرانەبێ. دەبینی کە دەربارەی من بەم دواییەیانە هیچ قسەیەك ناکرێ و بەڵگەکەشی ئەوەیە کەفەرەیدوونی کار,لاوێکی نەجیبەو لە هەموو شوێنێ بەرگری لە من دەکات . هەڵبەت ئێستا ناتوانم بەسەرهاتەکەت بەدرێژی بۆ بنوسم . بەڵام لەدا هاتوودا کاتێ هاتیەوە هەرچییەك بپرسی وەڵام دەدەمەوە . پەروێز من تۆم خۆشدەوێ لە رادە بەدەر حەز دەکەم کە ژیانم لەگەڵ تۆدا درێژە پێ بدەم و دەزانم کە ئەگەر لە تۆ جیا ببمەوە یادەوەری عیشق وموحیبە تی تۆ تاکۆتایی تەمەن ئازارم دەدا . بەڵام چی بکەم.تۆ ئینسافت هەبێ من تائەو شوێنەی دەتوانم رێنماییەکانی تۆ جێ بەجێ بکەم, دەیکەم و کاریان پێ دەکەم . گۆڤاری " سخن " بانگێشتیان کردم نەچووم " دانیشوران " یش کە نووسیم لێرە بەرێکوپێکی لەرێ ی جیاجیا وە بۆ بینینی من دێنە پێشەوە بەڵام لەبەر تۆو لە بەر خاتری ئەوەی کەوای بۆ دەچم دواتر هەمووشتێکم بۆ دەستەبەر دەبێ ، داوای لێبوردن دەکەم . سەبارەت بە پارەی کتێبەکەم چەندرۆژێ لەمەوبەر ئەمیرکەبیر تەلەفونی کرد کە بڕۆم بۆ وەرگرتنی مافی نووسین . منیش رۆیشتم هەقی 1200 دانە ، 720 تمەنی دا بە من . کە 600 تمەنی ئەوەم یەکسەر خستە بانکەوە وبایی 50 تمەن کتێبم وەرگرت. یانی بریاردرا" 5 "دانە ی کتێبەکەی خۆم لەبڕیاری هەر دانەیەکی" 5 "تومەن یانی بەتمەنێك





داشکان ، بدا بەخۆم و دواتر یەك بەرگ " ویس و رامین " م وەرگرت بە 15 تمەن و " گوڵستانیی سەعدی " بە15 تمەن و 70 تمەنیش ماوەتەوە . هەندێ شتیشم کڕی بۆ خۆم و هەمە وچونکە لە پارەوە 140 تمەن قەرزاربووم وەبە تۆشم وتبوو ئەو 100 تمەنەی کە لە حائری یمان دەوێ ، یانی فەرەیدون کاری وەریگرتووە پێم وتووە کە بیبات وەبیدا بە دایکم و 40 تمەنەکەی فرامەرزیش دەمەوێ بیدەمەوە بەهەقی قەرزەکەما و بەکورتی دایکت دەیووت کە ئەو پارەکەی هێناوەو لە بەردەرگا داویەتی پێ ی . پەروێز گیان بەکورتی پێ دەچێ کە مێ زیادە خەرجیم کردبێ بەڵام بەخوا 600 تمەنیش هی تۆیە. هەر کارێکت ئەوێ بیکە. پەروێز ئیتر ماندوو بووم هیوادارم تۆ زووتر بێیت .

**ماچت دەکەم**

**فروغ**

## شەممە ( 27 ی تەمووز )

پەروێزی خۆشەویستم من تازە ئەمڕۆ لە ماڵێ پوران گەڕاومەتەوە, بۆم نووسیبوویت کە " پوران " زۆر نەخۆشەو لەبەرئەوەی تەنها بوو و پێو یستی بەیارمەتی و پەرستیاری هەبوو ، من ناچار چووم بۆ ئەوێ . تۆ پێت وتبووم کە کەمتر بچم بۆ ئەوێ و شەو نەمێنمەوە بەلاّم پەروێزی ئازیزی من ، ئەمە یەك حالّەتی کوت و پڕبوو وەمن ناچار بووم بچم لەبەرئەوەی ئەو پێویستی بە یارمەتی هەبوو . بەلاّم ئێستا کە ئەمڕۆ سوپاس بۆ خوا حالێ باشتر بووە .من گەڕامەوە نزیکەی سێ رۆژ لەوێ بووم . هیوادارم لەم ڕووەوە لۆمەم نەکەیت . لەم یەك دوو رۆژەدا زۆر هەوڵمدا نامەیەکت بۆ بنووسم بەلاّم دەرفەتم بۆ نەرەخسا، ناچار بووم چاودێری لەو بکەم بەلاّم ئێستاکە گەڕاومەتەوە. بەدووی بەرنامەی رابووردومدا دەکەوم. نامەیەکت بۆ ناردووم و نووسیووتە بڕی 550 ریال پارەت بۆم داوە هێشتا کەبەدەستم نەگەیشتووە چونکەئەم سێ رۆژە لێرە نەبووم و پۆستەچی کاغەزی نەداوە بە کوڕگەل . رەنگە ئەمڕۆ بێت ، بەلاّم پەروێز من وای بۆ دەچم مەسەلەی ئەسکەناسی 50 ریالیی گرفتێکی نەبێ . چونکە لایحە ماوەی (2) مانگ موڵەتی بۆ کۆکردنەوەی ئەسکەناسەکان لە ئەنجوومەنی پیران تازە کردۆتە وە و





لەوەش بترازێ ئەو زەرفانەی کە تا رۆژی 20 تەموز گەیشتووەتە پۆستخانە هەموو یان ناردووە بۆ بانکی میللی نائەسکەناسەکان وردبکەنەوە. من هیوادارم زەرفەکەی منیش لە نێو ئەو زەرفانەدا بێت. ئەگەر وابێت ئیتر پێویستم بە رێنماییەکانی تۆ نیە . بەلاّم لە هەمان حالّدا سوپاست دەکەم لەوەی کە تۆ ئیشەکەت بۆ من ئاسان کردووە .

پەروێز هەوالّێکی خۆشم بۆ تۆ پێ یە . ئاخ نەك بۆ تۆ چونکە پەیوەندی بە تۆ وە نیە ، بەلاّم لەبەر ئەوەی‌منی خۆشحالّ کردووە ، دلّنیابە تۆ ش خۆشحالّ دەبی . من 8 مانگی تر دەبمە پوور ! ئێستا دەزانی نەخۆشییەکەی پوران چی بووە ؟ من زۆر خۆشحالّم .

پەروێزی من .... دوێنێ شەو خەوم بەتۆوە بینی ، هەر شەوێ خەوبە تۆوە دەبینم . هەر شەوێ خەو دەبینم کە هاتوویتەوە . ئەمڕۆ بەیانی کاتێ لە شەمێرانەوە دەگەڕاینەوە ، بەدرێژایی رێ بیرم لە تۆ دەکردەوە . بێهودە ئاواتم دەخواست کە " ئەی خوایە گیان خەوەکەم هاتبێتەدی و کاتێ دەگەمەوە مالّەوە پەروێز لەوێ ببینم " بەلاّم ئەفوس تۆی لێ نەبووی.هیچ شتێ بێجگە لە بێ دەنگییەکی بێزارکەرو تووڕەکەر چاوەڕێ ی نەدەکردین .

پەروێز ، ئەم دوورییە چەندە درێژ خایەن و سامناك بووە .ئەم ئاواتە خەریکە دلّم دەخواو دلّم خوێناوی دەکات ئارەزووی دیدەنی تۆ ، لەباوەش گوشینی تۆ ، ماچکردنی تۆیە . بۆچی ناتوانم وەك هەمیشە تۆم لە پالّ خۆمدا هەبێت ؟ بۆچی ناتوانم سەربخەمە سەر سینەی تۆو خەمەکانی دلّم لە بیربەرمەوە. رۆژانە بەساردی و خامۆشی تێدەپەڕێ. هەموو رۆژێ خۆر دەبینم و گەرمو گوڕی و

خرۆشی ژیان لە دەوروبەری خۆمدا هەست پێ دەکەم، بەڵام وەك بڵێی کە ئەم خۆرە لە هەموان دەدا ،لە من نەبێ . وەك ئەوە وایە کە ژیان مردووەو من بێ هوودە زیندووم و، لەژیانی کە سانی ترم دزیووە. چ سوودێکی هەیە من ئەم شتا نە بۆ تۆ بنووسم. مەگەر تۆ ناڵییێت کە عیشق دەبێ لە سینەدا پەنهان بکرێ . من ئەگەر بڵێم تۆم خۆشدەوێ تۆ دەڵێیت دەزانم وە دیسانە وە ناڕەزایی دەردەبڕی ئەمجا سێ لاپەرەی سپی رەش دەکەیتەوەو سەرەنجام ئەنجامەکەی وەردەگری کە لە عیشقی خۆما بزر بووم و خۆپەرستم دەبێ ئەم ناڵەیە دابمرکێنمەوە. دەبێ گوێ بە قسەی تۆبەم . بەڵام باشترە تۆش ئاگات لە نامەکانی خۆت بێت . تۆش وەکو منیت و من دەتوانم لە بەرنامەکەتدا بە لانی کەمەوە سێ جار رستەی " بۆتۆ بۆ یار " بدۆزمەوە . تۆ تەنها کارەکانی من دەبینی. ئەگەر ئەوە خراپە بۆ هەمووان خراپە . خراپیەکەشی لەوێ دایە کە تۆ هەموو شتێ هەتا عیشق لە روانگەی مرۆڤێکی 28 ساڵەوە دەبینی . و چاوەڕبێت کە منیش هەروابم و بە شەوێك رێگەی سەدساڵە بپێوم من پێم خۆشە کەکچێکی ئاقڵ بم و بەو هەموو بیرو ئەقڵەی کە لەم تەمەنەدا هەمە هەوڵدەدەم تا کارەکانم باش و بەتەواو ی وەك مەیل و حەزی تۆ بێ . ئەگەر کەسێ بەمن بڵێ بچکۆل من توڕە دەبم. بەڵام باوەڕبکە کە ناتوانم ئەوەندەی ژنێکی 28 ساڵەلە رووی هزرو بیرەوە پیرببم و ئەزموونم هەبێ . کارەکانم لەگەڵ تەمەنما گونجاوە وەئەگەر تووشی هەلەیەك بم ، هەڵبەت لە بۆ چوونی تۆوە هەڵەیەك بکەم ، شایستەی سەرزەنشت ولومە کردن نیم و کەسێ ناتوانێ بڵێ کە من خراپم. چونکە من ئەوکارەم بە زانین و بەوەی کە خراپە. ئەنجام نەداوە.





هەڵبەت ئەگەر دەمتوانی دەستنیشانی بکەم خراپە ، نەمدەکرد. تۆ ئەمرۆ ئەزموونت لە من زۆرترە. من بیروباوەڕی تۆ بەرێزەوە لە قەڵەم دەدەم و باوەڕم پێ یانە،بەڵام کاتێ من دەتوانم ئەوانە قبوڵ بکەم کەتۆ لەئەنجامدانی کاری خراپمدا من بەگوناهبار نەزانیو بەبەردەوامی نەڵێیت کەخۆبین و خۆپەرستی،هەقنەناسیو هەزارشتی تر یت. تۆ کاتێ دەتەوێ دەربارەی من بڕیاربدەی گوڕچالاکی و گەرمی لاوێتی و لە خۆبایی بوون و هەستیاری ، لەبەر چاوبگری کەئەویش تایبەتە بەسەر دەمی لاوێتی و ئەو کاتە بڵێی چ ژنێکی خراپم هەیە . خۆت بە بیربێنەوە کە لەو تەمەنەدا چۆن چۆنی بیرت دەکردەوە وچ حاڵە تێکت هەبووە ، ئەمجامن بە خۆت بەراوردکە. ئەو کاتە دەزانی کە من خراپ نیم ، من خراپیم تەنها ئەوەیەکە لەکاتی نامە نووسین دا رەوشتی تۆ لە بەرچاو ناگرم .

پەروێزی ئازیزم من رۆژی 2ی مهرماه چاوەڕوانی تۆ دەکەم .من ئەو رۆژەم دوێنێ شەو بەخەوبینی وهێشتا چێژی سەیرومەستیی ئەو خەونەلەبوونی منا ماوەتەوە. هێشتا وەکو ئەوە وایە کە دەموچاوی تۆ لەبەردەم و رووی منایە و ، من چاوانی تۆ دەبینم و هەست بەگەرمی هەناسەی تۆ دەکەم. وەك ئەوە وایە کەقژە رەشەکەی تۆبەدەست پەرێشان دەکەم.خۆم هەڵدەدەمەباوەشی تۆ. ، پێ دەکەنم ، دەگریم . ناڵینەکانی شادی من، لەنێوانی دوو لێومدا دەلەرزێ وەکو ئەوە وایە کە من تۆ پێکەوە لە کۆلاندا رێ دەکەین وتۆ ئەو چاکەتە هاوینەییە کراوەیەت لەبەردایە و پێدەکەنی ئاخ ئەی خوای من دوێنێ شەو چ شەوێکی شیرین بوو ، تابەیانی لەگەڵ تۆدا بووم . لەباوەشی تۆدا نووستبووم خۆزیا ئەوشەوەتەواو نەدەبوو . بریا خەونی من

هەقیقی بووا یە . من بە بەردەوامی لە خەودا  لە سەرخۆ ، لە خۆم دەپرسم " ئایا خەوتووم یان بیدارم ! وە دواتر لە خەودا دڵنیادەبووم لە بێداری خۆم و ، وای بۆ دەچووم بێدارم و شەو تابەیان ساتێك چی یە بزەی لێوانی تۆ منی جێ نە هێلاّ. من دوێنی" شەو تا بەیان رووی بزە لێ نیشتووی تۆم دەبینی . وەك ئەوەی هاوارێك لە دڵمایە و ، خامۆش نابێ ، وەك ئەوەی کە هەموو بوونی من لە خەیاڵی تۆدا بزربووە و ، ئەم دەنگە هاوارێکە کە لە دڵێ بەدبەختی من هەڵدەستێ ، کەلەدەست خەیاڵی تۆ ، فشاری ئارەزووی تۆ ،خەمی دووری تۆ، تامەزرۆی دیداری تۆ ، هاواریلێ هەڵساوە ئەو دەنگە. ئازارە ناڵەیە خرۆشان و فشارە و هەر دەمێ رەنگێکی هەیە .

هەست دەکەم کە ئیتر توانای تەحەممولکردنی ئەم ژیانەم نیە . هەموو گەردیلەکانی بوونی من تۆیان دەوێ ئەم ژیانە لەبری ئەوەی کە وورده ووردە ئاسایی بێت بۆم ، ئازاراوی بووە . من بەبەردەوامی چاوەروانی تۆ دەکەم و تەنها ئارەزووی تۆ دەکەم لەخوا .

**ماچت دەکەم**

**فروغ**







## شەممە ( 28 ی تەمووز )

پەروێزی ئازیزم ،هیوادارم حاڵت باش لەحاڵێ من وکامی بپرسی ،خراپ نین . ئیتر حەوسەڵەم بەتەواوی لە بەربڕاوە ، چونکە تۆش نایەیتەوە و هیچ کەسێکم نیە جگە لە تۆ کە لەگەڵیا زۆر هاوڕێ بم . پەروێز گیانم ، نازانم بۆچی حاڵم هێندەخراپە .دەترسم شێت ببم. هیچ کاتێ هەست بەئارامی ورەحەتی لەدڵما ناکەم . هەندێ کات ئەگەر شتێ بە من نەڵێن تا سێ رۆژ خواردن ناخۆم . دەچم بۆ لای دایکم ودەگەڕێمەوە ودەڵێم خواردنم خواردووە لەکاتێکدا کە هەر هیچ شتێکم نەخواردووە . خواردنم بۆ ناخورێ . شەوانە ئەوەندە بەناڕەحەتی دەخەوم و هێندە خەوی ترسناك دەبینم کەئێستا ڕقم لە خەوتنیش دەبێتەوە .حالەتێکی شلەژانی هەمیشەییم هەیە و نازانم هۆکەی چی یە ؟ بەگشتی تاقەتم لە ژیان چووە . خەیاڵ نەکەی دیسان لە رووی هەستەوە قسان دەکەم ، نە بەخوا پەیوەندییەکم بە ژیانەوە نیە . حەز دەکەم بمرم و بوونی من نەبێتە هۆی ناڕەحەتی کەسێك ، رۆژانە بەزۆری بۆ خۆم دادەنیشم و شیعر دەنووسم . تاکو ئێستا سێ پارچە شیعری باشم نووسیووە کەیەکێکیان بەیانی لە " سپی و رەش " دا بخوێنەرەوە، ئەم شیعرە خۆم خستومەتە بۆکسی





پۆستەی گۆڤاری " سپی و رەش " و ڕەنگە بەیانی دای بەزێنێ چونکە هەمان رۆژانی سەرەتای هاتنەوەم بۆ تاران،خستمە بۆکسەکەوە . پەروێز گیانم ، نازانم تۆ چیم لێ دەکەی ئایا هەروا منت خۆشدەوێ یان بە یەکجاری جێم دەهێڵی . من هەمیشە بیر لەو مەسەلەیە دەکەمەوە . من تۆم خۆشدەوێ . لە ناخی دلەوە دەیلێم ، هیچ کاتێ یادگاری موحیبەتەکانی تۆ لە بیر ناکەم. نامەوێ تۆ بەبەدبەختی ببینم . هەمووکاتێ من هەست دەکەم کە بوونی من بۆتە مایەی بەدبەختی تۆ . من فروغ لە مەیدانی ژیانی تۆ دەردەهێنم . من نامەوێ تۆ لەبەر خاتری من کە نرخ و شان وشکۆی خۆبەختکردنم نیە. ئازار بکێشی . پەروێز بە خوا نازانی چەندە بەدبەدختم. هیچ کاتێ روخساری من فریوت نەدات ، هەمیشە خەم دەخۆم و لەوەی کە رێگە چارەیەك بۆ ئازارە رۆحییەکانی خۆم نابینمەوە ، ناڕەحەتم . پەروێز تۆ دەبێ هەمیشە خۆشبەخت بیت ، چونکە خۆت پاکی و ، خراپە لەگەڵ هیچ کەسێکدا ناکەی و هەرهەموو تۆیان خۆشدەوێ . بەلام من نا .من چیم .... مرۆڤێکی خراپ کە هەر کەسێ زۆری هەبێ بە شێوەیەك ئازاری دەدات ! مرۆڤێك کە بلێسەی رۆحی دەیسوتێنێ و ، توانای هاوار کردن نیە ، مرۆڤێك هەقی بەسەر هیچ کەسێکەوە نیە و لەماڵێ دنیا بەم کتێب و دەفتەرەی رازییە ، بەلام دیسانەوەش خەڵکی وادەزانن ئەو بە زمان لووسی دەیەوێ کەڵکت لێوەرگرێ و بە پارەکانی تۆ جلوبەرگ بکڕێ . پەروێز ، چی بلێم. دلم پڕە لە ئازار و دەترسم تۆش ئاخرییەکەی بەرەڵلام کەی .دەترسم تۆش بیر بکەیتەوە کە من خراپم وە ئەو کاتە من چی بکەم ،چۆن چۆنی بەرگەی ئەم هەموو بەد بەختییە دەگرم ؟ لێم ببورە ئەگەر زیاد لە پێویست درێژەم

بەقسەکەدا . نازانم بۆچی ئەوەندە خەم دەخۆم . زووتر وەرە. تۆم بە هەموو دڵ و رۆحمەوە دەویٚ و ماچ دەکەم .

فروغ

پەروێز گیان ، نووسیبووت چیم لە قژم کردووە ، هیچ, چووم و بۆیاخی رەشم کرد وئێستا زۆر باش بووە و رازیم .



## دوو شەممە ( 29 ی تەمووز )

پەروێزی ئازیزم هیوادارم حاڵت باش بێ. دوێنێ و ئەمڕۆ دیسان نامەی تۆم پێگەیشت . لەوەی کە زیاد نامەم بۆ دەنووسی, مەمنوونم. کاتێ نامەکانی تۆ بە من دەگات ، هەموو خەم وژانەکانم فەرامۆش دەکەم و بەرادەیەك نامەکانی تۆ کاریگەرییان لەسەرمە کە هەندێ کات ئەگەر بیروبۆچوونێکی هەڵەشم هەبێ ، بەتەواوی لە مێشکم دەردەچێ وە لە خۆما هەست بە ئارامی و سەفای دەروون دەکەم .پەروێز ، خۆشم دەوێ ی هەر بە جۆرەی کە بۆم نووسیت .وەکو منالێك کە دایکی خۆشدەوێ و هەست بە پێویستی دایکی دەکات . تەنیایی رۆحم دەجوێ و بیرو هۆشم لە کار دەخات.هەموو ناڕەحەتییەکانی بیرو هۆشم, هی تەنیاییە. کاتێ تەنیام و کەسێ نیە تا بیروباوەڕی ساغ و بێگەردم دابدات ئەو کاتە دەست وپێ بەستراو ، یەخسیری بیرو بۆچوونی سەیری خۆم دەبم. کاتێ دەبینم کە ئیتر هیچ توانای بەرگریم نیە . دەبینم لە ژیان بێ تاقەتم ، هەست دەکەم کە هەمووان بە چاوی سووکەوە تێم دەڕوانن وەدێتە بەرچاوم کە بوونم لەکار کەوتوو و بە تاڵ ومایەی نەنگی و ناڕەحەتییە ، ئەوکاتە ئازار دەچێژم و لەلای خۆمەوە پلان دادەڕێژم کە هەمووان لە دەستی خۆم راحەت کەم .لە ئاوازی نامەکە تەوە زانیم کە نامەکانی ئەم

دواییەی منت خوێندۆتەوە و ناڕەحەت بوویت . پەروێز بمبەخشە .مەگەر من دەتوانم تۆ جێ بێڵم ، مەگەر من دەتوانم تۆم خۆشدەوێ ، بە هەموو بوونمەوە داوای تۆ دەکەم و حەزدەکەم بمرم و چیتر دوچاری ئەم مێشك تێکچوون و ئەشکەنجەی بیروهۆشە نەبم . پەروێز هەندێ کات ژیان بۆم دەبێتە کابوسێکی تاڵ و کوشندە. حەزدەکەم باوەڕبە قسەکانم بکەی .حەزدەکەم بەو جۆرەی کە دڵم دەیەوێ منت خۆشبوێ . ئێستا کە خەریکم ئەم نامەیە بۆ تۆ دەنووسم فرمێسك بە چاوانما دێتە خوارێ و نازانم بۆچی دەگریم . هەمیشە هەروام, هەتا کاتێ دەمەوێ قسەی رۆژانەم بکەم رق وکینە گەرووم دەگرێ، گومانی تیا نیە هۆکارێ هەیە کە من ئازار دەدات ,بەلاّم خۆم نازانم لە هیچ هۆیەکی حالەّت و رۆحیاتی سەیری خۆم تێ ناگەم. دوێنێ شەو دانیشتبووم بیرم دەکردەوە و لە بەرخۆمەوە وتم گومانیتیا نیە، هۆکەی ئەوەیە کە تەنیام و تەنیایی بۆتە هۆی بیرکردنەوەو ناڕەحەتی من. تۆ زووتر وەرە چ سوودێکی هەیە . کۆتایی شەهریوەر , تۆ زووتر وەرە لە جیاتیدا ئێمە لە دوای یەك مانگ کە مۆلەّتەکەی تۆ تەواو بوو ، لەگەڵ تۆ دێین بۆ ئەوی ، لەوێ ژیانمان راحەتترەو ئارامی هەیە و من وتۆ ین ومن وتۆ . پەروێز گیانم بەخوا و بەگیانی کامی بێجگە لە تۆ هیچ کەسێکم خۆش ناوێ و هیچ شتێ ناتوانێ جێگەی تۆ لە دڵما پڕ بکاتەوە. من ئەگەر لە تۆ جیاببمەوە خۆم دەکوژم. نەك ئەوەی کە بیر بکەیتەوە درۆدەکەم. موحیبەتی تۆ لە دەمارو پێمدا رەگی لێداوەو چەندین جار تا قۆناغی دوای جودایی یش توانیومە خۆڕاگربم . بەلاّم لەو دەمانەی دواییدا بەقسەیەك ، بەنیگایەکی دڵسوزانەی تۆ ، پەتی هیممەتم لێك هەڵوەشا وەدیسان





وەکو شێت پەنام بۆ تۆ هێنا . چ کەسێ دەتوانێ نکوڵێ لە موحیبەتی من بکات بۆ تۆ . ئەگەر هەندێ کات شێت دەبم و قسەی پەرش و بلاّو دەکەم ، بمبەخشە . من هەست دەکەم کە مێشکم ماندوو و بێ توانا بووە ، پێویستم بە حەوانەوە و ئارامیی هەیە . پەروێزم نووسیبووت بچم دەرزی ئاولەّ لە خۆم بدەم. من کامیم هەفتەی پێشوو برد دەرزی ئاولەّم لێ دا, بەلاّم خۆمم هێشتا نەکوتیوەو بڕیارە خۆم بڕۆم و خۆم بکوتم .قژیشم رەش کردۆتەوە و بە جۆرێك کە خەڵکی دەڵێن لە جاران باشتر بووەو خۆشم لێ ی رازیم . دوو کراسی زۆر جوانیشم کڕیووەو کە هێشتا نەمدوور یوون .سەبارەت بە کتێبەکەم ، دوێنێ لە ئەمیر کەبیرەوە تەلەفونیان کرد کە کتێبەکە تەواو بووە و مۆلەّتی بلاّو کردنەوەی بدەم . منیش وتم کە ئیتر خۆتان دەزانن و گوایا سبەی بلاّبێتەوە . نوسخەیەکت بۆ دەنێرم .خۆم 10 نوسخە وەردەگرم کە دەمەوێ بەسەر هاورێکانما , دابەشیان کەم . سەرەتا وتم 5 نوسخە ودواتر بینیم 5 نوسخە زۆرکەمە و بەکورتی نزیکەی 80 تمەن لە مافی نوو سینی کتێبەکەم وەرگرت ، یانی 10 نوسخە کتێب و دوو نوسخەی " سەعدی و ویس و رامین " یش .پارەکەم هێشتا لە فرامەرز وەرنەگرتووە . کاتێ هاتەوە دەڵێم کە بیدات ، باقی پارەکەم هەرچەندێکی مایەوە. تۆ و کامی. تۆ چاکەت و پانتۆڵێ بکڕەو بۆ کامیش پاسکیلێکی سێ تایی دەکڕم .

ماچت دەکەم. من هەمیشە هی تۆ دەبم .

فروغ





## چوار شەممە ( 3 ی ئاب )

پەروێزی ئازیزیم دوو سێ ڕۆژێکە کە لە تۆوە نامەم نیە .دیسان بە گومانم فەرامۆشت کردووم . بەهەرحاڵ هیوادارم حاڵت باش بێ من هیچ حەوسەلەم نیە و بەرادەیەك هیلاکم کە نازانم بە چ شێوەیەك خۆم تیمار کەم ، هاتنی تۆش کە بە بەردەوامی دوادەکەوێ . ئەمڕۆ چوومە لای دایکت و لەبەیانیەوە هەموویانی لێ بوون و جێگەی تۆ خاڵی،خراپ نەبوو،دانیشتین و باسمان لەهەموو شوێنێ کرد وکامیش لەگەڵ میهرداد شمشێربازی دەکردو بەکورتی میهرداد بەباشی ئەو پەروەردە دەکات .پەروێز گیانم،دوێنێ بەیانی چوو بووم هەندێ شت بۆدایکت بکڕم لەسەر شەقام دکتۆر تاهیری و خێزانەکەبیم بینی و ماوەیەك قسەم کرد و دکتۆر تاهیری داوەتی کردم ومن وتم چونکە تەنهام داوای لێبوردن دەکەم . سەرەنجام دواجار وتی کە بۆ تۆ ی بنوسم ئەو پارچە کاغەزەی کەبڕیار بوو بۆ ئەوی بنێری زووتر بینێرەوچەند جارێك ڕایسپاردم کە دەبێ بینوسم و تۆش کە دەیزانی ئەو کاغەزە چی یە وتکا دەکەم ئیشوکارەکەی زووتر بۆ راپەڕێنە کە دواجار گللەیی نەکات. کەمێ لەسەرووترەوە پەروین موعاسرم بینی ئەمجاش خانمی موهەندیس نادری دواتر یش خودی موهەندیس وبە کورتی چاوم بە هەموو ئاشنایانی ئەهوازیمان کەوت . هەوای

تاران دووسێ ڕۆژە ئەوەندە گەرم بووە کە من هەمیشە لەبەر خۆمەوە دەڵێم سەد ڕەحمەت لە ئەهواز . باوەڕکە ئەمڕۆ تەواو هەوا وەکو بای شەرجی ئەهواز لیقە .هەناسەدان زەحمەت ، و گوایا پێیش بینیان کردووە کە لە هەقتەی داهاتوودا گەرما بگات بەوپەڕی ڕادەی خۆی .من لەلای خۆمەوە وای بۆ دەچم کە بەم ڕێژە یە ئەهواز چەندە گەرمە و دواتر ناڕەحەت دەبم . هیوادارم ئاوا نەبێ و تۆ زیاد گەرمات بەرنەکەوێ . بەو شێوەیەی کە خۆت نووسیووتە هەوا باشەو ئاواتی منیش ئەوەیە کە تۆ هەمیشە لە ژیانت ڕازی بیت و دوور لە من ناڕەحەت نەبی . پەروێز لەوەی کە نووسیووتە باری خواردن و جلوبەرگت باش نیە بەخوا من ناڕەحەتم .من دەمتوانی چی بکەم ئێستا تۆ دەتوانی خزمەتکارێ بهێنی کە خواردنت بۆ دروست بکات و جلوبەرگەکانیشت بدەی بەجل شۆرێ .گوایا بڕیار بوو تۆ بۆنانی نیوەڕوان بچی بۆ ماڵێ " هیدائی " و من بەو ئومێدەی کە لەوێ پێشوازیت لێ دەکەن، دڵخوش بووم. بە هەر حاڵ تۆ خۆت بەرەوشەکە ئاشنایت و هیوادارم .پەروێز گیانم ، بۆم بنوسە تا بزانم ئایا قەڵەمەکەمت لەلایە یان نا،چونکە من قەڵەمەکەمم لە ئەهواز نەهێناوەو بەو شێوەیەی کە لەخەتی نامەکانتەوە دیارە،گوایا لەوێ بەجێمابێت . پەروێز گیان ، لە حاڵێ من بپرسی ، خۆشم نازانم چی بنووسم . ئایا باشم. نە ,وئایا خراپم ، ئەویش نە, و ئەوەی گومانیتێدا نیە ئەوەیە کە وامن هەرگیز ناتوانم لە ژیان ڕازی بم . چونکە لەو حاڵەتەدا ژیان لوتفێکی بۆم نابێ . ئێستا نازانم تۆچ بیرێ دەکەیتەوە . دەزانم کە تۆ لە ڕووی شێوازی بیرەوە لەگەڵ منا زەوی تا ئاسمان فەرقت هەیە . من لە مناڵییەوە بە شێوەیەکی تایبەت بە خۆم گەورە





بووم و خووم پێ وەگرتووە . ئێستا زەحمەتە کە بتوانم پێشوازی لە ڕاستییەکانی ژیان بکەم . بۆ من هەموو شتێ لایەنی خەون و وەهماوی هەیە و من کاتێ لە ژیانی ڕاستەقینەدا جلوەی بیرو باوەڕم نادۆزنەوە دیسانیش پەنا بۆ بیرو باوەڕی خۆم دەبەم . تیایدا دنیایەك دروست دەکەم پێم خۆشە دەژیم . ئەمەش شێوازێکی هزرەو ،باوەڕناکەم زیانیکی بۆ تۆ هەبێ. زۆر تێکەڵ و پێکەڵ نووسیم . زووتر وەرەوە. بەخوا دڵم تەنگ بووە و جگە لەوەش تەنیایی زۆر ناڕەحەتکەرە .

پەروێزم ، چەند ڕۆژ لەمەوبەر کە چووم بۆسەرشەقام پاسکیلێکی سێ تاییم بۆ کامی بینی بە لێکردنەوەی تایەیەکی دواوەی بە گۆرینی جێگەی تایەکەی تری دەبێ بە دوانە و زۆر جوانە و توندو تۆڵە ، نرخەکەشی دەیووت بە 190 تمەن . بەڵام هەڵبەت لەکاتی کڕین دا دەبێ بە هەرزانتر بیکڕین . حەزم دەکرد بۆی بکڕم ، چونکە ئەگەر بیرت بێ لە ئەهواز بە تۆم وت کە دەمەوێ پاسکیلێکی سێ تایی بۆ کامی بکڕم. ئێستا ڕای تۆ چیە “ وتم باشترە بۆتۆشی بنووسم . هەڵبەت سەبارەت بەومەسەلەیە ، پێ داناگرم بەڵام حەزم دەکرد ڕاوبۆچوونتم بۆ بنووسی . ئیتر هیلاك بووم. ماچت دەکەم .

**فروغی تۆ**





**یەکشەممە ( 4 ی ئاب )**

پەروێز گیان بەیانی بۆ تۆ نووسیبوو و لەلای خۆم بڕیارم دا کە عەسریش بێمەوەو تەواوی کەم  ئێستا کەهاتوومەوە پاشماوەی نامەکەی بەیانی بنوسم. جارێکیش ئەوەم لە سەرەتاوە تا کۆتایی خوێندەوە. شتێکی گرنگم نەنووسیووە, یانی لە خوێندنەوەی ئەم نامەیەدا شتێك ناچێتە سەر زانیاری تۆ . سەبارەت بەمن بەبیرم هاتەوە کە تۆ بۆت نووسیووم کە خۆم هەڵبوێرم لە دووپاتکردنەوەی شتەباسکراوەکان. بینیم کە ئەو نامەیە شتیٚ نیە جگە لە دووپاتکردنەوەی شتە دووبارەبووەکان. من لەوەی کە ناتوانم لە نووسینی ئەو بابەتە ئاساییانە بەدوربم ، وەشت یٚکت بۆ بنووسم کەسانی تر نەیان وتووە ،ناڕەحەتم.من بە دوای بابەت و مەسەلەیەکدا دەگەڕێم کە بیٚ ویٚنەبیٚ و خوێندنەوە یان تام وچێژت پیٚ بدا. باسی هەموو شتێکم نووسیبوو. لەو پرسە خوێنانەی کە سەر لەبەیانیان لە ماڵ ئێمەدا شەڕوشۆڕیان هەڵدەخراند . لە باس و خوازو سەرەنجام شەڕەکانی خۆمان لەگەڵ ئەو ژنە عەبا بەسەرانە ، لە خەونەکاندا کە دەیان بینم ، و لەبیری هەمیشەییم و ، لەخەڵکی. لەگەڵ هەموو ئەوانە دا لەگەڵ ئەوەی کە هەوڵمدا بوو هیچ دەربارەی عیشق نەڵێم، دیسانەوەش نامەکەم ماندووکە رو ناشیرین بوو بوو .ئەوەم توڕدا من

بەدوای شتێکدا ئدگەڕێم  کە بەتەواوی تازەو سەرنجڕاکێش بێ . بەڵام هەرگیز جگە لە رووداو وکارەساتی ئاسایی  ژیان ، بە وشنانەی کە دوورنیە سەد هەزار جار و لە سەد هەزار خاڵدا. بەڵام تەنها لە یەك رۆژدا روویدات ، رووبەڕووی مەسەلەو کارەسا تێکی تر نابمەوە .هەرچییەك لە دەوروبەری مندایە وهەر چی بەهۆشیمنا رەت دەبێ ولە من روودەدا. رووبەرووی هەرکێیەك دەبمە وە. هەمووئەو قسانەی کە لەم ولەو دەبیستم و وەڵام دەدەمەوە. هەر هەمووی  لە ئاستی ئاساییدایە .

ئەگەر من دەمتوانی هەنگاوێك بۆ پێشەوە بنێم .ئەگەر من ئەو جورئەت و لێهتاوییەم هەبووایە کە لەنێو دەوروبەر " ژینگە" لە نێو ئەو هەموو شتە هیچ و پووچ و ئاساییە هەڵبێم و پەنا بۆ باوەشی تۆ بێنم و پێکەوە بچین بۆ جێگەیەك کە بەدووربێ لەغەوغاو جەنجاڵ ژیانی رۆژانە ، ئەوکاتە زۆر خۆشبەخت بووم . تۆ نازانی من چەندە پێم خۆشە بە پێچەوانەی رێنمایی وداب و نەریت و بەپێچەوانەی یاساو بیرو بۆچوون و باوەڕی خەڵك هەڵس و کەوت کەم . بەڵام کۆت و بەندێك لە پێمایە کە گرفتارم دەکات . رۆحی من ، بوونی من و کاروکردەی من نێو چوار دیوارێکی زەبون و بێ مانای کۆمەڵایەتی دیلە و من  بەبەردەوامی بیر دەکەمەوە کە هەر جۆری ٚ بووە دەبێ هەنگاوێك بەرزتر لە ئاستی شتە ئاساییەکان هەڵبێنم. من ئەم ژیانە ماندووکەر و پڕلە کۆت و بەندەم خۆش ناوێ .

گومانی تیانیە کە تۆ ئاشنای بە فەلسەفەی " ئە گز یستا نسیا لیست " ییەکان ئەوانە. تاقێمێکی تازەن کە باوەڕشیان وایە هیچ شتێکی خراپ لەدنیادا بوونی نیە .هیچ شتێ خراپ نیە و



لەسەرهەمان بیروباوەڕ هەر کارێ کە دەیانەوێ دەیکەن ، تەنانەت بەرووتی بەشەقامەکاندا دەگەڕێن. لەبەرئەوە هیچ خراپیەك بوونی نیە .کوڕان  جلوبەرگی کچان دەپۆشن و وەکو ئەوان ئارایش دەکەن و کچان ئیش وکاری پیاوان ئەنجام دەدەن و ژیانیان پڕە لە شتی سەیرو سەمەرە .... تۆ پێت  وانیە ئەو ژیانە خۆش و جوانە ؟

بەڵام هەڵبەت خراپیشی هەر هەیە, یانی ئەوانە بنەمای رەوشت و شەرەفیان لە ژێر پیٚناوەو زۆر جار بینراوە کە لەیەکە کاتدا ژنێك سێ دۆستی هەبووە و ترسێکی نەبووە لە هاوڕێیە تیکردنی برای خۆشی.

هەڵبەت لە رێبازی " ئەگزیستالسیا" لیستەکان ئیتر نەیانوتووە کە ببیتە هاوڕێ ی برای خۆت ، بەڵام ئەوخەڵکە بەشخوراوە،ئەو کچانە و ئەوکوڕانەی کە باشترین قۆناغی تەمەنیان بە نەبوونی و ناکامی بەسەر بردووە. ئێستا کەپەناگەیەکیان دیوەتەوە بەهەموو هەستێکی تووڕەو رق وکینەیەکی ترسناکانەی خۆیان هەوڵنەدەن لەیاساو رێسا کۆمەڵایەتیەکان تۆڵە بکەنەوەو بەزۆری کارو کردەوەکانیان ئاکامی تەمەنێك لە بەشخوراوییە. پەیڕەوانی ئەو رێبازە ئێستا بەجۆرێك لەکارو کردەوەکانی خوٚیاندا پێشڕەوییان کردووە کە (ژان پۆڵ سارتەر)ی رابەرو دامەزرێنەری ریبازی نوێ هاتۆتە دەنگ و هاواری لێ هەڵئەسێ کە ئێوە رێگەی توندڕەوی ئەگرنە بەر . من هەقم بەسەر ئەو شتانەوە نییە . من تەنها بۆ ئەو ژیانە ئەوان بەجۆش و خرۆش و خۆشویستن ئەزانم کە ئەوانە توانیویانە بەیەکجاری بەندو کۆتی کۆمەڵایەتی بپچڕێنن و لەو زیندانە ترسناکە دەرباز بن و پێ بنێنە سەر رێگایەك کە بەتەواوی سەیرو نائاساییە.وەتاکو ئێستا کەسێك جورئەت ودلێری

ئەوەی‌نەبووە بەو ڕێگایەدا بڕوات.لەم (تاران)ەی خۆشماندا ئەگزیستانسیالیستەکان بەدەر کەوتوون و گوایە کۆمەڵەیەکیان پێکهێناوە. من ئەم مەسەلەیەم لەیەکێك بیستووەو باوەڕم بەهەقیقەتەکەشی نیە. ئەمە باشترین ڕێگای ژیان و گوزەراندنە، بەلاّم بە داخەوە کە لەنێو ئەم قەومە ئازادە، پاکی و چاکی ماناو چەمکێکی نیەو بەقسەی کەسێکی خاوەن روانگە ، بنچینەی بۆرژوازی سەبارەت بەژن لەبەر چاو ناگیرێ. من نازانم تۆ لەمبارەیەوە چ بیرێ ئەکەیتەوە “ بەلاّم من هەمیشە لایەنگری ژیانێکی سەیرو پڕ ڕووداوبووم . رەنگە پێکەنینت بێت ئەگەر بڵێم: من حەز ئەکەم بەپێ دەوری دنیا بگەڕێم . من حەز ئەکەم لە شەقامەکاندا وەکو منداڵ سەما بکەم ، پێبکەنم، بقیژێنم. من حەز ئەکەم کارو کردەیەك بکەم کە دژی یاسابێ.رەنگە بڵێی سروشتی مەیلەو تاوان و گوناهم هەیە. بەلاّم وانیە. من لەکردنی کارێکی سەیرو سەمەرە ، چێژ وەردەگرم. من حەزدەکەم ئەم وشەی (دەبێ) یە لەژیان دوور کەوێتەوە. (دەبێ) ئەو کارە بکەی. (دەبێ) ئاوا جل لەبەر بکەی . (دەبێ) ئاوا بڕۆی بەڕێگادا. (دەبێ) ئاوا قسە بکەی.(دەبێ)ئاوا پێبکەنی“ ئاخ هەمووی(دەبێ) هەمووی سەندنەوەی سەربەستی و سنووردار کردن,بۆچی دەبێ؟ دەزانم کەوەلاّمم دەدەنەوە “ چونکە یاساو رێسای کۆمەڵ ڕێگە نادات بەجۆرێکی دی رەفتار بکەیت. ئەگەر بتەوێ وەکو خەڵکی هەڵسوکەوت نەکەیت, ئەوا بەشێت و هەندێ جار بە گێل و دەبەنگت لەقەڵەم دەدەن. من نازانم ئەو یاسایانە چ کەسێ دایناون.کامە شێت مرۆڤی مەحکومی ئەو





ژیانە تاڵ و پڕ لە ئازارە کردووە, من تاکو ئێستا دەربارەی ئەم شتانە قسەیەکم بۆ تۆ نەکردبوو,بەلاّم تۆ خۆت دەبێ تێگەشتبیت, لەبەر ئەوە من بەو جۆرەی‌کە شێتی عیشقی ترسناکانە ,عیشقی سەیرو سەمەرەو نائاسایی و بێ لە نەوازش و پڕ لە توندو تیژیم , بەو شێوەیەش شێتی ژیانی ئازادو بێ‌کێشەم . من حەزدەکەم لەگەڵ تۆدا ژیانێکی ئارامم هەبێ‌و ئامادەم تەنها فەرمانی تۆ جێبەجێ بکەم. نەك یاسا کۆمەلاّیەتییەکان.ژیانێکی سەیرو سەمەرەو پڕلەکارەسات, پڕ لەجۆش و خرۆش , وەك ژیانی پاڵەوانەکان , وەکو ژیانی ئەوانەی کەبەرەو پۆڕایی دارستانەکانی ئەفریقیا دەڕۆن. تۆ بیر بکەرەوە لە هەر هەنگاوێ کە دەینێن چەند ترس و چەند خرۆشان, چەند پەشۆکاوی و, چەند چێژ و خۆشی دەچێتە دڵیانەوە! منیش حەز دەکەم لە هەر هەنگاوێکی ژیاندا تووشی حاڵە ساتیکی ئاوا بم . تۆ نازانی من چ بیرێك دەکەمەوە . چ خەیاڵێك دەچنم . خۆشم بە دەست ئەو بیرو بۆچوونانەوە هیلاك دەبم . هەندێ کات خۆم گاڵتە بەخۆم دەکەم و کاتێ دەبینم ئەو توانایەم نیە , تا بیرو بۆچوونەکانم پیادە بکەم ,هەست دەکەم کە زەبوونم و بچووك بوومەتەوە . بۆم بنووسە بزانم ئایا من هەقمە ئاو بیر بکەمەوە. ئایا بیر و بۆچوونەکانم راستە , خراپ نیە , گوناهکارانە نیە , ئایا تۆ ئەوانە پەسەند دەکەی ؟ من دەزانم کە تۆ بەپێچەوانەی منەوە لایەنگری ژیانێکی ئارامیت , بەلاّم دەتوانم بڵێم کەتۆش لەوەی کە ناچاری ڕێز لە کۆمەڵ و دەورو بەر بگری و پەیڕەوی بکەیت , ناڕەحەتیت.

پەروێز گیان زۆر بیٚ سەرو پیٚ نووسیم . خوا حافیز ی تۆ , هیوادارم حاڵت هەتا دوای خوێندنەوەی ئەم نامەیەش باشی باش بێت .

ماچت دەکەم
فروغ



## سێشەممە 5ی ئاب

پەروێز گیانم , سەرەنجام دوێنیٚلەدوای ماوەیەکی زۆر نامەی تۆ گەیشت و ناڕەحەتیەکانی من ڕەوییەوە . دوێنیٚ کاتم نەبوو وەڵامی نامەکەت بدەمەوە, بەڵام ئەمڕۆ دیسانەوەش نامەیەك لەلای تۆوە هات .هیوادارم بەو شێوەیەی کە نووسیووتە حاڵت باش بیٚو , بارودۆخت رێکو پێك بێت.وەلەو بارەیەوە ناڕەحتیت نەبێت.هەوای تاران کە ئەمساڵ زۆر زۆر گەرمە.نازانم بۆ ئەویٚ.بەڵام بەهەر حاڵ دەبیٚ بەرگە بگریت,پێم وایە کە ئیتر سەردەمی دووری من و تۆ کۆتایی پیٚ هاتبیٚو ئەو پەڕەکەی تا هەفتەیەکی تر دەتوانم تۆ لەنزیکەوە ببینم , پەروێز گیان , حاڵی من خراپ نیە هەر وەك چۆن چەندین جار بۆتم نووسیووە, تەنها ناڕەحەتیی ڕۆحییم هەیەو ئیتر بە هیچ جۆرێك مەسەلەیەك نیە کە مایەی ناڕەخەتی من بێت .پەروێز گیان, سەبارەت بە کتێبەکەم دەبیٚ بۆتی بنووسم کە شەش ڕۆژ لەمەو بەر نێردراوە بۆ شارەکان و هەر کە هەواڵی بڵاوبوونەوەی لە شارەکان بگات, لەتارانیش بڵاو دەبێتەوە. چونکە ئەگەر لە تاران زووتر لەشارەکان بڵاوبێتەوە,کتێب فرۆشە لاوەکییەکان خۆیان کتێبەکە دەنێرن بۆ شارەکان و بەو شێوەیە دوور نیە پەخشکەر زەرەر بکات. بەهەر حاڵ , باوەڕ دەکەم تاکو ئێستا گەشتبێتە ئەهواز.

پەروێز گیان, بۆ کتێبەکەم بەو شێوەیەی کە ئاغای (شیفا)تەلەفونی کرد. وتی: ئاغای (سەعیدی نەفیسی) گفتی داوە کەلەسەری بنوسیٚ. دەشتی وعەلی ئەکبەری کەسمایی و سەعیدیش دەینوسن و سەعیدی نەفیسیش,ماموٚسنای زانکۆ,دوو نوسخە لەکتێبەکنی بۆ ئیزاکردووم و دابووی بە شیفا , شیفاش تەلەفوونی بۆ کردم و منیش فەرەیدوونم ناردو بۆی وەرگرتم ,لەگەلٚ نوسخەیەك کە خودی شیفا لە کتێبەکانی بۆی ناردبووم. بەو شێوەیەی کەلەتەلەفونەکەدا بەمنی وت, سەعیدی نەفیسی زۆر هاوڕایە لەگەلٚ مناو ئیتر جگە لەوەی کەڕۆژی هەینی , سوبحی لەبەر نامەی مندالأندا, کتێبەکەی منی وەك یەکیٚ اەباشترین کتێبەکانی مانگ , ناوبردووەو پارچەیەکی خوێندوٚتەوە وخۆشحالٚی نبشانداوە , کەشیعری من ,لەگەلٚ ئەوەی کەلەڕووی بابەتەوە تازەو نوێیە, لەڕووی شێوازیشەوە چوار چێوەی قالٚبی کۆنی پاراستووە و وتوویەتی کە شیعرەکانی ئەم (شاعیرە لاوە) لە شیعرەکانی مەولاناو مەولەوی دەچیٚ و تۆ ئەگەر لەبیرت بیٚ , سوبحی لەناحەزانی سەر سەختی من بوو, بەلأم کاتیٚ نوسخەیەکی کتێبەکەمی خوێندەوە, هاوڕابوو لەگەلٚما و تەنانەت لەڕادوێدا باسی کردووەو کاتێکیش باسی منی دەکرد, باوکم بەتووندی تووڕەبووەو وەلەگەلٚ دایکما کردویەتی بەشەڕ.پێی وتووە کەتۆ کچەکەمانت خراپ کردووە .پەروێز گیان, ئەمەش هەوالٚێکی تازە: من لەو کاتەوە کەلە ئەهواز هاتوومەوەچوار پارچە شیعرم نووسیووە کەهەموویان باشبوون, (کامی) حالٚی باشەو من ئەوم زۆر خۆش دەویٚ و ڕۆژ بەڕۆژ پەیوەندیم پێوەی زیاتر دەبیٚ. هەر کاتیٚ لەگەلٚی بەشەڕ دێم , دەچێت لە سوچێکدا لێی دادەنیشیٚو وەکو ماتەم گێڕان , دەلاوێنێتەوە: ئەی



بابە گیان لەکوێی, ئەی بابە گبان وەرەو بە کورتی زۆر پێی پێدەکەنین. ئۆتۆ مبیلێکم بۆ کڕیووە بە (10)تمەن . کەگەورەیەو لەشێوەی پاسدایەو,فڕۆکەیەکیشی هەیە کەبە(15)ریال بۆم کڕیووە.و ڕۆژانەش لەگەلٚ میهردادو میهرانبەشمشێربازیو تەڕەزانبازی بەسەر دەبات و میهردادی زۆر خۆشدەویٚ بەجۆرێك کەدەیەویٚ هەمیشە بچێت بوٚلای ئەو. پەروێز گیان, نووسیووتە کەپارەکەم لە خۆمدا خەرج بکەم . من بەهیچ جۆریٚ ئامادەنیم لەتاران بڕۆمە لای دکتۆرو تۆش سوور مەبە لەسەریو ئەگەر بمەویٚ بۆ ساغ و سەلامەتیم شتێك بکەم , دەبیٚ چارەسەری ڕۆم بکەم و دەست بەچارەسەری مێشکم بکەم. پەروێز گیان, فەرامەرز بەهیچ جۆرێك خەبالٚی دانەوەی پارەکەمی نییەو بەوەی دەزانم , کەتا ئێستا دوو سیٚ جار پێم ووتووەو هەر هیچ گوێی پێنادات و بەڕووی خۆیا ناهێنیٚ. لەبەر چاوی بگرە ئەگەر من پارەی کتێبەکەم وەر نەگرتایە ئێستا لێرە چیم دەکردو بەبەلٚێنەکانی فەرامەرز خان چۆن چۆنی ڕۆژو شەوم بەسەر دەبرد. پەروێز گبان , ڕۆژی شەممە زەماوەندی (ئیرەج)ی کوڕە مامە مەوئێمەیان بانگێشت کردووەو هەلٚبەت زەماوەندی ژنانەو پیاوانە بەجیایە. ئیرەج چوٚتە ئەمریکاو ئێستا بوٚتە ئەندازیارو بەکورتی ژن دەهێنیٚو من خەیالٚم وایە بچم و جێگەی تۆ خالٚی کەم.پەروێز گیان,خانمی سەعیدی تاکو ئێستا دوو سیٚ جار بەتەلەفون داوەتی کردووم و من هەموویم بەستوٚتەوە بەهاتنەوەی توٚوە و نازانم تۆ کاتیٚ بێیتەوە , من دەبەی یان نا.سەبارەت بە فەرەیدوونی کار , من بیرو بۆ چوونی توٚم خوێندوٚتەوە , بەلأن من وەك خۆم ناتوانم بەرامبەر بە ئەو بۆچوونێکی خراپم هەبیٚ.چونکە ئەو چاکە نەبیٚ لە گەلٚما نەیکردووە

و هەڵەی کتێبەکەشم هەڵەی چاپخانەیە . بتەوێ‌و نەتەوێ لەهەر کتێبێکداو لەهەر چاپێکدا هەڵە ڕوودەدات و دەربارەی من چونکە خۆم لەوێ نەبووم و ئەو هەرچەندە ش کە وردبینی دەکرد, بەدڵنیاییەوە  وەکو خۆم نەیدەتوانی درك بەبابەتی شیعر بکات. ئەمەیە کە کەمێ  زیاتر بووە و قسەی تۆ ڕاست نییە کە ئەو نەچووە بەسەر کارییەوە . بۆ نموونە : فەرەیدوونی تەوەللی  ئێستا شەش مانگە خەریکە کتێبێك چاپ بکات و هێشتا لەسەرەتای کاردایەو هەر بەو شێوەیە کەسانی ترو من جگە لەوەی کە دەرهەق بەئەو و , زەحمەتییەکانی , هەستی ڕێزلێنان و سوپاسکردنم لەدڵا هەبێت , ناتوانم دەرهەق بەئەو , بۆچوونێکی تر بخەمە ڕوو. سەبارەت بە پەیوەندیکردنی بە ئێمەوە و ئەنجامدانی کارەکانی ئێمە , بەهیچ جۆرێ و لەهیچ جێگەیەك وەکو خەڵکانی تر  سوودی لەم مەسەلەیە وەرنەگرتووە و لەهەموو شوێنێ لەپارستنی ئابڕووی ئێمەدا تێکۆشاوەو, من ڕێزی بۆ دادەنێم , چونکە بەلاوێکی پاك و دڵسۆز دێتە بەرچاوم .هەڵبەت من نامەوێ پەیوەندیم لەگەڵیدا هەبێت , بەڵام باوەڕم دەربارەی ئەو تائەو کاتە شەرح دەکەم .

پەروێز گیان, (شیفا)ش بەنۆرەی خۆی لەکارەکەی ئێمەدا زۆر زەحمەتی کێشاوە. کاتێ تۆ هاتییەوە دەبێ ئەو داوەت بکەم و تۆ لە نزیکەوە بەو ئاشنا بیت. تۆ  زووتر وەرەوە چونکە من زۆر ماندوو و تەنیام. بەگیانی تۆو بە گیانی کامی تاکو ئێستا بێجگە لەماڵی دایکم و ماڵی پووران ,





بۆ هیچ جێگەیەك نەچووم و هەتا شەوێکیش چییە نەچووم بۆ سینەما و هەڵبەتە نازانم باوەڕ بە قسەم دەکەیت یان نا . زووتر وەرەوە.

فروغ

## شەممە 9ی ئاب

پەروێزی -ئازیزم, ئەمڕۆ لەدوای چوار ڕۆژ بێ ئاگایی لە تۆ , نامەت گەیشت. من لام وابوو کەتۆ چونکە دەتەوێ ( 14)ی ئاب بێیتەوە " نامەت نەنووسیووە وە منیش لەبەر هەمان هۆ سێ چوار ڕۆژە کە نامەم بۆ نەنووسیوویت. و ئەمڕۆ کاتێ لەنامەکەتدا خوێندمەوە کە هەمدیسان خەیاڵی هاتنەوەت نییە , زۆر ناڕەحەت بووم .چونکە خۆم ئامادە کردبوو کە ئەم ڕۆژانە تۆ لە باوەشما یگوشم و ئەوەندەت ماچ بکەم کە ماندوو بیت پەروێزم , هیوادارم حاڵت باش بێ لەهیچ ڕوویەکەوە نیگەرانیت نەبێ. حاڵی من و کامیش باشە , هێشتا هیچ شتێکم بۆ کامی نەکڕیوە . بڕیارم داوە تا تۆ نەیەیتەوە هیچ نەکڕم .پەروێز گیان, چەند پرسیارێکت لێم کردبوو ,کەوا لەخوارەوە وەڵام دەدەمەوە: سە بارەت بە ( سینیەکان) , دەزانی کە دایکم چەند بە تەماعە . بە کورتی هەردووکی هەڵگرت و هەر چی هەوڵم دا نەیداو باشتر وایە تۆ خۆت دوو سینی جوان بۆ دایکت ئامادە بکەیت وبیهێنی. دەربارەی کتێبەکەم , دڵنیام کە تا ئێستا لە ئەهواز بلاو بۆتەوە .لە تارانیش دوو ڕۆژ لەمەو بەر بلاو بۆوە . لێکۆڵینەوەو رەخنەگرتن لێی بەم زووانە دەست پێدەکات .(سەعبدی نەفیسی )مامۆستای زانکۆ, ڕانانێکی نوسیوە ئەمڕۆ





تەلەفونی کردو گوتی داومە بە گۆڤاری فیردەوسی.( محەمەدی سەعیدی و عەلی دەشتی و عەلی ئەکبەری کەسمایی )یش گفتیان داوە کە بنوسن.یانی ئاغای (شیفا) تەلەفونی بۆ من کرد و گوتی :کە کتێبەکەی ئێوەم بۆ ئەوانە بردووەو ئەوانیش گفتیان داوە کە بنوسن. پەروێز گیان , لەبەر ئەوەی پارەم پێ نییەو فەرامەرزیش بە هیچ جۆرێ ئامادە نییە (40) چل تمەنەکەم بداتەوە . وە گوتبووی لەبەر ئەوەی هاوڕێکەم ئەم مانگە زەماوەندی هەیە.من ناتوانم چل تمەنەکەی تۆ بدەمەوە.لەبەر ئەوە لە ناردنی کتێبەکە,داوای لێبوردنت لێدەکەم . چونکە بۆ پارەی ئوتومبیلەکەشم ماتڵم.و هۆکەشی ئەوەیە کە(600) شەش سەد تمەن لە پارەکەی چەکە. کە (10)ی شەهریوەر دەتوانم وەریبگرم.و هێشتا وادەی نەهاتووە وئەوی تریشی (پاشماوەی پارەکە) لەبەر ئەوەی ئەم مانگە پارەم پێ نەبوو ,خەرجمکردووەو کتێبێك و نامەیەکیشم بۆ ئەمبر نوسیبوو . کەلەبەر پێ پارەیی ماوەتەوەوهێشتا نەمناردووە. پروپاگەندە سەبارەت بە کتێبەکەشم . ئەمڕۆژانە دەست پێدەکات و نابێ پەلە بکەین. پەروێزم , دوێنێ شەو زەماوەندی ئیرەجی کوڕە مامم بوو . ئێمەش چووبووین وجێگەی تۆ بەتاڵ بوو. هەڵبەت لەبەر ئەوەی خێزانی (کەسوکاری) بوکێ ئایینی و دیندار بوون ,ژنان و پیاوان لە یەکدیجیابوون و حەوشەکە ئەوەندە قەرەباڵغ بوو کەمن خەریکبوو دەخنکام و بووك و زاوام زۆر ئەشکەنجە دا.بەتایبەتی ئیرەج .کەبۆم باسکردی لە مناڵییەوە پێکەوە گەورە ببوین وپاریمان دەکرد.پەروێزم زووتر وەرەوە.چونکە بەبەردەوامی داوەتم دەکەن و منیش بەبەردەوامی داوای لێبوردن دەکەم وچاوەڕێی تۆم .سەعیدینەفیسی کە دەناسی ,

هەمان ئەو مامۆستاو پیرەمێردەی کەلەنێو خۆماندا زۆر خۆشەویستە .ئەمڕۆبە تەلەفون پێی گوتم دەمەوێ دەستی منالّە کانم بگرم وبێین بۆ مالّی ئێوە و لە نزیکەوەئێوە ببینم .زوو کات دیاری بکەو من گوتم : هەلّبەت ئەمە ئەوپەڕی شانازییەکە دەتوانی بە منی بدەیت , بەلاّم روخسەتم بدەرێ , مێردەکەشم بێت تا ئەویش لەم شانازییە بێبەش نەبێت .ئەو منی زۆر خۆشدەویٌو من تکام لێکرد کە موتالاّکانم لە ژێر چاودێری ئەودا درێژە پێبدەم .ئەگەر رانانەکەی ئەو بلاّو ببێتەوە , زۆر بایەخم پێدەدا .چونکە ئەو گەورەترین لێکۆلّەری ئێرانی و گەورەترین نوسەری کلاسیکی ئێرانەو لە ولاّتانی دەرەوە , پلەو پایەو بەهایەکی گرنگی هەبەو لەگەلّ هەموو ئەمانەدا دەیگوت: کە چێژو خۆشیم لە شیعرەکانی تۆ وەرگرتووە . وهیوام زۆر پێتە. و دەیگوت: لە کۆنفرانسێکدا کە لەروسیا دەربارەی ئەدەبیاتی جیهان ساز درا, لە ئێران ناوی چوار کەسیان برد. یەکێکیان تەوەکەللی ,یەکێکی تریان دوکتۆر حەمیدی , یەکێکی تر پەروین ئیعتیسامی , یەکێکیش فروغ فەروخزاد.کەمنیان لەگەلّ (خوانا دیبا ببوو) ژنە شاعیری رووسیی بەراورد کرد.پەروێزم , زۆر خۆشحالّم کە تۆ بێیت و تۆ نازانیکاتیٌ لە ئیشەکەمدا بەرەو پێش دەچم و هەندیٌ نارەحەت و نارازی دەبینم ,چەند خۆشحالّ دەبم. ئاواتم ئەوەیە کە بە جێگەیەك بگەم کە باوکم لەبیرهێنانەوەی رابردوو , شەرم بیگریٌو من بە مایەی شانازیخێزانەکەی بزانیٌ.پەروێز زۆرم نووسی,هیوادارم زوو بێیتەوە .سەبارەت بەکاری زیادەی تۆ , تەلەفون دەکەم . بەلاّم وەك ئەوەی کە تۆ پێشتر نووسیت , فەرمانی زیادکردنی کارت دەرچووە .....هەلّبەت من تەلەفون دەکەم و ئەنجامەکەت بۆ دەنوسم.پەروێزم .سەبارەت بە





پەیکەرو گولّدان کە نوسیبووت شکاندومەو لە بوخچەکەدا شاردومەتەوە . هەلّبەت تۆ راست دەکەی ,بەلاّم چونکە فەریبۆرزیکوڕی فەرامەرز شکاندبوونی ,من بەتایبەتی شاردمەوە .تا ناکۆکییەك روونەدات. بەسەرهاتەکە ئەوەیە کە رۆژێکیان لەم ژوورە دانیشتبووم و بینیم لەو ژورە دەنگە دەنگ دیٌ.هەلّبەت سەرەتا بایەخم پێنەدا , بەلاّم کاتیٌ دوای نیو سەعات بۆ کارێك چووم بۆ ئەو ژوورە , بینیم پەیکەرو گولّدانەکە ,کەوتۆتە سەر زەوی و شکاوە .من یەکسەر بۆی چووم کە ئیشی چ کەسێکەو لەبەر ئەوەی تیرە خانم داوای لێکردم کە دەنگە دەنگ نەکەم , منیش ئەوانەم شاردەوە.و هەلّبەت گولّدانەکە جاری دووەمی بوو کە شکا.چونکە جارێکیان شکاو من پێکەوەم نووساندەوەو جاری دووەم سەرەنجام کاری خۆی کرد.تۆ دەزانی کەمن لەم بارەیەوە سەرنجی خراپم نەبووە ,بەلّکو ویستم نێوانمان لەگەلّیاندا تێك نەچیٌ.ئیتر ماندوو بووم . ماچت دەکەم.

فروغ

## یەکشەممە 18ی ئاب

پەرویز ئەمڕۆ نامەیەکم لە تۆوە هەبوو. هیوادارم حاڵت باش بێ . هەر چەندە نامەکانی تۆ رۆژ بە رۆژ زیاتر لایەنی سکالاّ بە خۆیەوە دەگرێ بەجۆرێ کەمن لە ژیان بێتاقەت دەبم.بەلاّم لەگەڵ هەموو ئەوەشدا دیسانیش نامە بۆ تۆ دەنووسم . ئەگەر نامەکانی من ئەم رۆژانە بەدەستی تۆ ناگات, هۆکەی ئەوەیە کەهەموو ساتێ چاوەڕێی هاتنەوەی تۆم .ئێستا نزیکەی چوار رۆژە کە نامەم بۆ تۆ نەنووسیووە, چونکە لام وا بوو, یەکەمی شەهریوەر بێیت ,لە حاڵەتێکدا کە دیسان بۆ دایکتت نوسیوە (10)رۆژی تر دێمەوە. بەهەر حاڵ لەمبارەوە نیگەران مەبەو بیرت نەچێ کە ئەگەر بشمەوێ تۆڵە بکەمەوە.زۆر لەوە زیاتر جێ دەستم هەیە ,کەنامە بۆ تۆ نەنووسم .پەرویز لە حاڵی بپرسی باش نییە.بە دڵنیاییەوە لە دوای ئەوە ئیتر هیچ شتێ ناتوانێ ئارامییەکی دەروونیی بۆ من بگەڕێنێتەوە .بۆ منت نوسیووە : کە هیواداری سەرم لەبەرد بدات و بەدناوی منت ناو ناوە بەردی ژیان.دیسانەوەش نووسیوتە کەسوێند دەخۆی کەخۆت حەز دەکەی خەڵك,لەپشتەوە قسە بکەن.....!!دەشێ وا بێت.چ کەسێ دەتوانێ لەبەر دەم بیرو باوەڕی نەگۆڕاوی تۆدا خۆی بگرێ .بە دڵنیاییەوە هەر وایە. بەلاّم بەداخەوەم کەوەکو تۆ مرۆڤێکی





خۆشبیرو تێگەیشتوو نیم .ئاخ.......بێڵە با بەردەکانی ژیان لەسەری من بدات ومن لەدەست ئەم ژیانە کە هیچ دڵم پێی خۆش نییە " رزگار بکات .وای بۆ نەچی کە بوونی تۆ بۆتە مایەی تاڵیی ژیانی من.نە....من لەخۆم بێزارم...خوا زوڵمی لێکردم چونکە دەیتوانی ئەوچاوەڕوانی و ئارەزووانەی هاوشێوەی ژنانی تر بەمن بداو نەیدا.پەرویز تۆ ژنێکی نەخۆشت هێناوە,من خۆشبەختیم خۆشدەوێ" بەلاّم ناتوانم لەمە زیاتر بم. من بەم شێوەیە هەست بەخۆشبەختی دەکەم ,نەك بەو شێوەیەی کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە .رەنگە بیری من هەڵەو فڕێدراو بێ .بەلاّم من جوانیی ژیان لە خرۆشان و تاڵییەکانیا دەبینمەوە.من دەزانم کە سەرەنجام بوونی منیش لە ژیانی تۆدا هەروا دەبێتە مایەی نارەحەتی وە ئاواتەخوازم کە بمرم.لەبەر ئەوە, بە هیچ جۆرێ بۆ ئەوەی کە تۆ دەیڵێی و دەیدەیتە پاڵم, تەخوڵقێنراوم. پەرویز ئێستا ئیتر نووسیوتە کە ئەگەر ببێت بە شەڕمان تۆ دەڵێیت (من کە خەرجی خۆم دەردەهێنم)ئەم رستەیەی تۆ زۆر ژەهراوییانە بەبیرما هات.کەمن هیچ کاتێ نەمویستووە ئەو شتانە بکەم بە مننەت بەسەرتەوە.وەك چۆن کەهیچ کاتێ نەموتووە هوتەرمەندم.لە کاتێکدا هەر کاتێ بووە بە شەڕمان,تۆ ئەوانەت خستۆتە پاڵم.خوا خۆشی دەزانێ کەمن مرۆڤێکی لە خۆبایی نیم و بەهیچ جۆرێ نامەوێ بڵێم کە لەپێش تۆوەم من لەدوای ئەوە لە بەردەم تۆدا لەبێدەنگی بەولاوە کارێکی تر ناکەم. تۆدەتوانی بڵێی کەمن سەلامو عەلەیکم لەهاوڕێکانت کردووە, دەتوانی لە هەموو جێگەیەك هاوار بکەی کە ژنی من بێ مێشك و سادەیە، لە کاتێکدا کە

وانیە و تۆ بەم شێوەیە من لە خۆت دوور دەخەیتەوە و فێرم دەکەی کە نهێنی یەکانم بۆ خۆم بپارێزم و ، ئیێتر بە تۆ نەڵێم کە بەوتەی ناسراوی. من کاتیٚ دەڵێم " ف " تۆ دەچیت بۆ فەروخزاد. من تەنها بۆ تۆم نوسی کەفلاٚنە کەسم بینی. بەلاٚم ئایا نووسیوومە کە سەلاموعەلەیکیشم لێکردووە " کە خەریکی خۆت دەکوژیو نامەی هەڕەشاوی بۆ من دەنووسی. پەروێز ڕەحەتم بێلەٚ . دەزانم کە بەکاری ژیان نایەم " بەلاٚم ئایا دەتوانم دوای 6 ساڵ تێکۆشان دیسانەوەش هیوام بەم مەسەلەیە هەبیٚ. دەزانم کە خەریکم بەرەو شێتێتی و شێتبوون دەچم . هەندیٚ جار ئەوەندە سەرم لە کارەکانی خۆم سووڕ دەمێنیٚ ، وەك بلێی کەسێکی تر ئەوکارەی کردووە . بیرم دیٚ کە تۆ هەمووە کاتەکانی ژیانت لە تاران لە ناو هەمان شەقام ئیسلامبول و لالەزار و نادری کە ئێستا بۆتە کۆگەی فەسادو بە دڕەوشتی بەسەر دەبرد" لەکاتێکا من لەماڵەٚوە ئازارم دەچێشت. کاتیٚ بۆ تۆی بنووسم من 6 جار چوومەتە سەر جادە ، درۆ ناکەم. بەلاٚم ئەمە نابێتە بەڵگەیئەوەی کەمن لەبەیانیەوە تا نیوەڕۆ بەشەقامەکاندا گەڕاوم" بەڵکۆ تەنها بەتەکسی چوومەتە بەردەم ئەو دوکانەی کە کارم پیٚ ی بووەو دوای شت کڕین دیسانەوەش لە هەمان شوێنەوە سواری تەکسی بوومەتەوەو گەڕاومەتەوە . دەڵیٚ ی لە ماڵ نەچیتە دەرەوە ... و پێت وانیە کە من لە ماڵەٚوە لە نێو چوار دیواردا چۆن چۆنی دەتوانم خۆم بگرم و ڕەنگی هیچ شتیٚ نەبینم. لەکاتێکدا کە تۆش زیاد ڕێزت بۆ حەزو بۆ چوونی من دانەناوە "بەلاٚم لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پێم وانیە کە هەڵەٚیەکم کردبیٚ. تۆ هەرچۆنیٚ دەتەویٚ دەربارەی من بڕیاربدە . بەلاٚم من خۆم دەزانم کە کارێکی ناشیرینم





نەکردووە . مەڕەنجیٚ لە نامەکەم لەبەرئەوەی ئێستا کە خەریکم ئەم نامەیە بۆ تۆ دەنووسم لە خەم و ئازار بەولاوە هیچ شتیٚ لە دڵمانیەو لە ژیان بێزارم . ماچت دەکەم

فروغ

**پەروێزی** ئازیزم نامەکەتم دووسێ رۆژ لەمەوبەر پێگەیشت ، نازانم بۆ چی تائەمڕۆ وەڵامم نەداوەتەوە . بەڵام ئەمڕۆ هەرلە خۆوە هەستم کرد کە دەبێ نامەت بۆ بنووسم . ئێستا سەعات 10 ی شەوە هەموو خەوتوون و من تەنهای تەنها لەژوورەکەمدا دانیشتووم و بیرلە تۆ دەکە مەوە.ئەگەر بڵێم حاڵم باشە,درۆدەکەم .چونکە سەرگەردانیی رۆحیی من بێ چارەسەرەو ، من دەزانم کە هەرگیز ناگەم بەئارامیی . هێزێك لە منا هەیە. هێزی هەڵاتن لە شتی عادی.و من بەباشی هەست بە بێهودەیی ژیان و بوون دەکەم و دەبینم کە لەم بەندیخانەیەدا، بەندم .من ئەگەر تێ دەکۆشم بۆ ئەوەی کەلێرە بڕۆم تۆ نابێ وابی ربکەیتەوە کە بۆ من بینیی دنیاکانی ترو سەرزەمینەکانی تر سەرنج راکێش و ، جێ ی گوێ پێدانە ، نا . من باوەڕم وایە کە لەژێر ئەم ئاسمانە شینەدا روو بەرووی هیچ شێتکی تازە نابێتەوە و کرۆکی ژیان بریتیە لەشتیهەڕ ەمەو،دووپاتکردنەوەی شتە دووبارەبووەکانە . دلێنام کە بۆ رۆحی یا خی و سەرگەردانی لە هیچ سوچێکی دنیادا پەناگاو ئارامیی یەك نیە . من ئەمەوەێ ژیانم تێپەڕێ ، من ئەژیم بۆ ئەوەی کە زووتر ئەم بارە بگەیەنمە شوێن مەبەست. نەك لە بەرئەوەی کە ژیانم خۆشئەوێ . پەروێز قسەکانی من نابێ تۆ نارەحەت بکات . ئەمشەو زۆر شێنم ماوەیەکی زۆر گریام . نازانم بۆچی، تەنها





بیرمەکە" گریاوم و ئەگەر نەگریمایە ئەتاسام . هیچ شتێ دوای تەنیایی رۆحی من ناداتەوە.وەکو دەفرێکی بە تاڵ وام لە گۆماوەکاندا بەدوای گەوهەردا ئەگەڕێم.

پەروێز نازانم چێت بۆ بنووسم خۆزیا ئەمتوانی وەك مرۆڤەکانی تر خۆم لەهەرەمە بوونی ژیاندا بزربکەم.بریا جلوبەرگێکی تازەیا ناوەندێکی گەرمی خێزانیی و یا خواردنێکی بەچێژ،ئەیتوانی شادمانی لەپێکەنینی منا بژێتەوە .کاشکی سەماکردنی کەسانی تر ئەتیوانی فریوم بداو راێکشامایە بۆناو مەیدانی سەماو بێ ئاگایی وکەیف و خۆشی و رابواردنە .خۆزگە ئەمتوانی بۆ ووشەی سەرکەوتن نرخ و بەهایەکم بۆ دانیایە .ئاخ تۆ نازانی من چەندە بەدبەختم .من لە ژیاندا بەدوای فریدێکی تازەدا ئەگەڕێم . بەڵام ئەفوس کەچیتر ناتوانم خۆم بخەڵەتێنم .من زۆر تەنیام ئەمڕۆ لە ئاوێنەکەدا سەیری خۆم کرد ئێستا وردە وردە لە روخساری خۆم ئەترسم . ئایا من ئەو فروغە م ؟ هەمانە ئەو فروغەم کە بەیانی تاکوشەو لەبەردەم ئاوێنەدا رائەوەستا و خۆی بەهەزار شێوەرێك ئەخست و بەوەش دڵخوش بوو . ئەم چاوە نەخۆشانە ،ئەم روخسارە تێکشاوولاوازو ئەم هێڵە ناوەختانەی ژێر چاوو ناوچەوانە هی مێن ؟ بەخۆم ئەڵێم بۆچی خۆت ئەدەی بەدەست هەستەکانتەوە ؟ بۆچی لەخۆڕا ژیانە بەسەختی ئەگری ؟ بۆچی سوود لەو ڕۆژانە وەرناگری کە تێبئەپەڕێ و چیتر تازە نابێتەوە ؟

پەروێز گیان پایەدار بوونە کارێکی ئاسانە نیە . نائومێدی ، وەکو مۆریانە رۆحی من ئەکاتە تۆزو گەرد " بەڵام بە ڕواڵەت لەسەر پێ کانم راوەستاوم هەندێ جار پێ ئەکەنم و هەندێ جار ئەگریم " بەڵام

هەقیقەتەکەی ئەوەیە کە ماندووم ، ئەمەویٚ هەڵبیٚم ، ئەمەویٚ بڕۆم و گوم ببم! بەم میٚشکە نەخۆشەوە نازانم سەرەنجام چی لیٚ دیٚ . نامەویٚ زۆر شتت بۆ بنوسم . پەرویٚز کاری من زۆر خراپە .ئەگەر لیٚرە نەڕۆم شیٚت ئەبم .کاتیٚ ئەلیٚم باوەڕکە ئەمڕۆ لەسەرشەقام نزیك نیٚوەڕۆ حالەٚتیٚکم بەسەر هات کە بەتەواوی نائۆمیٚدی کردم .هیچ کەس ناتوانیٚ لە ئازارم بگات.هەموو خەیالٚ ئەکەم من ساغ و خۆشبەختم ، لەکاتیٚکدا کە من خۆم باش هەست ئەکەم کەی رۆژ بە رۆژ زیاتر شیتالٚ ئەبمەوە . هەندیٚ کات وەك ئەوەیە کە ئەرژیٚمە ناو خۆمەوە . کاتیٚ خەریکم بەسەر شەقامەکاندا ئەڕۆم وەك ئەوەیە کە بەستەم ئەبیٚتە تۆزو گەرد و ئەپرژیٚت بە دەوروبەرمدا.من هیچ مەسەلەیەك گەورە ناکەم ، تەنانەت وتنی زۆریٚك لە نارەحەتیە کانم خۆم هەڵدەویٚرم تا دەوروبەرەکەم خەیالٚ نەکەنە کە من دەور ئەبینم بەلاٚم تۆ ئەوە بزانە کەمن ئیتر ناتوانم بەرگەبگرم.حەزم ئەکرد نەفەریٚ هەبووایە کە من بە دڵنیاییەوە سەرم بخستایە سەرسنگی و زارزار بگریمایە.یەکیٚ بووایە کە موحیبەتەوە ماچی بکردمایە .پەرویٚز بەدبەختی من ئەوەیە کەهیچ هۆکاریٚ رۆحمە رازی ناکات هەندیٚ کات لەبەرخۆمەوە بیرئەکەمەوە کە پەنا بۆ ئاین بیٚنم و هیٚزی باوەڕ لە خۆما پەروەردە بکەم.بەڵکو لەم ریٚگەیەوە بگەم بە ئارامیی .بەلاٚم باش ئەزانم کەئیتر ناتوانم خۆم فریوبدەم.رۆحی من لەدۆزەخی سەرگەرانیدا ئەسووتیٚ ومن بەنائومیٚدییەوە ئەڕوانمە خۆلەٚمیٚشەکەی وبیرلە وژنە خۆشبەختانەئەکەمەوە کەلەمالیٚ میٚردەکانیاندا سەرگەرمی خەوتی منالاٚنەن و، بە تام و چیٚژەو خۆشگوزەرانی رابووردوویان کاویٚژ ئەکەنەوە.





پەرویٚز زۆرم نووسی . هەموو شتیٚکیش پڕوپوچ . بەلاٚم تۆ من ببەخشە چونکە زۆر نارەحەتم . لە مالیٚ کامی بپٚرسی خراپ نیەو من کەمتر ئەچمە سەردانی ، چونکە ئەومەسەلەیە هەم من ئەشکەنجە ئەدا و هەم ئەویش نارەحەت ئەکات . کاتی وەرگرتن من لەو زانکۆیەی کە پیٚم وتی گەیشتووە . دوو رۆژەکە گەیشتووە . من سەرقالیٚ ئیشکردنم بۆ وەرگرتن پاسپۆرت نازانم هەندیٚ شیٚت چۆن چۆنی بۆ بنوسم . من هەموو شتیٚکم قەرزارباری تۆیە و بۆ تەنها بە پشتوانەو پاپیٚشتم ئەزانم . تا ئیٚستا لە ئەرك و زەحمەت بەولاوە هیچ سوودیکی ترم بۆ تۆ نەبووە . ئاه ئاواتم ئەوەیە کە رۆژیٚ بتوانم بە نۆرەی خۆم کاریگەربم لە ژیانی تۆدا وخزمەتیٚ بە تۆ بکەم . تۆ ئەگەر ئەتەویٚ ئەتوانی کۆمەکی من بکەی ئەبیٚ زووتر دەست بەکاربیت . زۆر زوو لەبەرئەوەی کە من کاتیٚکی زۆر کەمم بەدەسەوەیە و جگەلەوە وەرگرتنی دۆلار زۆر ئاسانە نیە .

پەرویٚز تۆ دوعا بکەی من بڕۆم . بەڵکو بتوانم خۆم لەم نائومیٚدییە تووندە ڕزگار بکەم . وەلاٚمی نامەکەی من زوو بنووسە و روونی کەرەوە بۆم کە ئایا ئەتوانم پیشت بەقسەکانی تۆ ببەستم یان نا . هەڵبەتە تاکو ئیٚستا کە ئاوابووە بەلاٚم رەنگە لە مبارەوە گرفتیك بیٚتە پیٚش . دەربارەی نامەکەی من کە نووسیت بزربووە ، من خۆشم نارەحەتم . هەڵبەت داوایەکی گرنگ نەبووە ، تارادەیەك هاوشیٚوەی نامەکانی ترم بووە . بەلاٚم دیسانیش باش نیە کە بەردەستی کەسانی تر بکەویٚ . تۆ لیٚ ی بکۆلەٚوە رەنگە بەدەربکەویٚ . پەرویٚز گیانە بیرت نەچیٚ کە لەنامەکەتا راشکاوانە قسەم لەگەلٚ بکەی و ئەگەر ئەتوانی بەو شیٚوەیەی کەوتت یارمەتی من بدە بنوسە کە کەی دەست پیٚ

ئەکەی . من زۆر نارەحەتم کە ئەم قسانە بۆ تۆ ئەنووسم بەلاّم تۆ ئەزانی کە جگە لە تۆ کەسێکم نیە و لەوەش زیاتر هیوادارم کە رۆژێ بتوانم قەرەبووی بکەمەوە . چاوەڕوانی نامەی تۆم ، ئارەزووم خۆشبەختی تۆیە و خۆشم ئەوێ ی .

ماچت ئەکەم
فروغ



( 29 **ی مایس** )

پەروێز گیانم ئەم نامەیەت لەبەر ئەوە بۆ ئەنووسیم چونکە کارێکی بەپەلەم پێت هەبوو . حسابی نامەکانی ترمی بۆ مەکە. هیوادارم حالّت باش بێ ئەمجاش نازانم چۆن سوپاسی تۆ بکەم . من لە مەبەدوا لەبەردەم چاکیەکانی تۆ دا کپ و بێدەنگ لێی دا ئەنیشم بە ئومێدی رۆژی ٚ ئەژیم کە بتوانم قەرەبوویان بکەمەوە من بۆ وەرگرتنی پاسپۆرت رووبەرووی گرفتێ بوومەتەوە و ئەویش ئەوەیە کە ژنان بۆ سەفەرکردن بۆ دەرەوەی ولاّت،ئەبێ یا ڕەزامەندی باوکیان هەبێت ، یان لە حالەتی هەبوونی مێردا ، رەزامەندی مێردەکانیان . من لەماوەی سێ هەفتە لە مەوپێش ، پێناسەکەمم گۆری و پێناسەی نوێم وەرگرت . لە پێناسەی نوێمدا ، لاپەڕەی تەلاّق و منالّ بەتالە و هەرچی پرسیاری هۆکەیم کرد ،وتیان چونکە لە پێناسە کۆنەکەدا نازانم ئەم شتە بە پەسەندکردنی چ بەرپرسێ نەگەیشتووە، " هەلّبەت بیرم نیە " تاتەسدیق نەکرێ ئێمە لە پێناسەدا ناینوسین . منیش زیاد گرنگیم بەومەسەلەیە نەدا . ئێستا کە وێنەی پێناسەکەم بۆ وەرگرتنی پاسپۆرت برد ، بۆ فەرمانگەی پاسپۆرت ، وتیانە ئەبێ مێردەکەتان ریگەبدات . من بەسەرهاتەکەم باسکرد و ئەوان وتیان چونکە لە پێناسەکەدا باسی لێوەنەکراوە ئەبێ مۆلەتی مێرد هەبێ .

من بیر مکردەوە کە ئەگەر بمەویٚ برۆم بە دوایدا تا ئەم بەسەرهاتە لە پێناسە کەم تۆماربکریٚ زۆر ئەخایەنیٚ . ئەوەیە کە بە ناچاری دیسان هانا بۆ تۆ ئەهێنم.تکا ئەکەم بۆ خێرا راپەڕاندنی کارەکانی من مۆڵەتنامەیەك لەسەر سەفەرکردنی من بنوسە و، ئەگەر پەسەندکردنی بنکەی پولیسی گەڕەك و یان نووسینگەیەکی ڕەسمی بگەیەنە وەهەرچی زووتر بۆمی بنێرە . تکا ئەکەم زۆر پەلە بکە . چونگە کاتی قوتابخانەی من درەنگ ئەبیٚ نامەشم بۆ بنووسە . من نزیکەی دوو هەفتە لەمەوبەر نامەیەکم نووسی کە هێشتا وەڵامت نەداوەتەوە . حاڵیٚ من نەباشەو نەخراپە ، تەنها حەزئەکەم هەموو شتیٚ فەرامۆش بکەم و ببمە مرۆڤێکی تازە . ئەگەر خوا بیەویٚ رەنگە رۆیشتن بڕیت کاریگەری بیٚ . پەروێز گیان ، چونکە لە دەرەوە ئەم نامەیە ئەنووسم ئەوەیەکە لە هەمان جێگەدا کۆتایی پیٚ دێنم . ئەزانی کە خۆشم ئەوێی وئاواتم ئەوەیە کە لەبیری نەکەیت . زوو نامەم بۆ بنێرە .

ماچت ئەکەم

فروغی تۆ



**پەروێز** گیان هیوادارم حاڵیٚ تۆ باش بیٚ . ئەمڕۆ چووم بۆ ماڵیٚ ئێوەو دایکت پێی وتم کە تۆ بۆت نووسیووە قاڵیٚ یەکان بفرۆشیٚ و وتی کە من ناچمە ژێر باری ئەم کارەوە و . با ئەوکاتەی خودی پەورێز هات بۆ تاران خۆی بیفرۆشیٚ .من ویستم ئەم باس و خوازەت بۆ بنوسم . من لەوەی کە تۆ ئەتەویٚ بێیت بۆ تاران زۆر خۆشحاڵم بەڵام هات بە بیرما کەم وکورتی پارەکەم لەجیٚ یەکی ترەوە دەستەبەربکەم چونکە من رازی نیم . لەبەر خاتری من سەرئێشە بۆ هەندێك دروست ببیٚ .جگە لەوەی من پەلەمە وەئەم باس و خوازە ئەبێتە هۆی ئەوەی کە من لە کاتی خۆیدا نەتوانم خۆم بگەیەنمە قوتابخانە و وسەرەنجام پارەکەم خەرج ئەکەم و دیسان ناچار ئەبم ماوەیەکی تر لێرە بمێنمەوە تا دیسان کەی خوا شانسی رۆیشتنم ئەکابەنسیب پەروێز من نامەویٚ خۆم بەسەرتادا بسەپێنم. من وەزعی تۆ باش ئەزانم ، ئاگام لە داهاتی تۆو قەرزەکانی تۆیە.من کە هەمیشە ئەرك بووم بەسەرتۆوە ئێستا ئیتر نابیٚ لەسەر شانی تۆ وەکو بارێك قورسایی دابنێم من ئە3000 هەزار تمەن پارەیەی کە ئەمەویٚ ، سەرەنجام ئەتوانم بە شێوەیەك دەستەبەری کەم . من ئەگەر لێرەبڕۆم پاشماوەکەی جیٚ بەجیٚ ئەبیٚ . من هەرئێستا بۆ ئێشکردن لە کۆمپانیای " هیادوبلاژ فیلم " دوو پێشنیاریان بۆ کردوم . گرنگ

ئەوەیە کە من لە کاتی خۆیدا بتوانم خۆم بگەیەنمە ئەوێ . پەروێز گیان من نازانم تۆ کەی دێیت بۆ تاران . بەڵام ئاواتم ئەوەیە کە تۆ هەر ببینم. نامەم زوو بۆ بنووسە . من زۆر حەز ئەکەم بزانم تۆ کەی دێیت بۆ تاران . تەنها گرفتی کارەکەی من ئێستا هەمان مەسەلەی پارەکەیە . یانی ئەو کتێب فرۆشە سەگبابە کە تاکاری کتێبەکە تەواو نەبێ پارە بە من نادات وە پاشماوەی پارەکەش ئەبێ هەرچی زووە دەستەبەری کەم ومن دڵنیام کە ئەتوانم بڕۆم ، چونکە تۆم زیاتر لەهەر کەسێ بەهاوڕێ و پشتیوانی خۆمم ئەزانی و داوای یارمەتیم لە تۆ کرد . من مرۆڤێکی زۆر خراپم من خۆپەرستیم لە سنوری خۆی تێپەڕاندو تۆ ئەتەوێ یارمەتی من بدەی لەکاتێکا کە بڕیك قەرزاریت و ئەو قەرزانەش دیسان من بۆم دروست کردوویت

پەروێز من چاوەڕێ ی وەڵامی تۆم من چونکە نەمویست دایکت بخەمە زەحمەتەوە و فشاری بۆ بێنم . ئەوە بوو کە بە ئەوم ووت کو من هەرهیچ پارەم ناوێ یانی ئەو وتی من ناتوانم ، منیش وتم من هەر پارەم ناوێ . ئێستا ئیتر خۆت ئەتوانی بیربکەیتەوە کە چی ئەبێ . بەهەرحاڵ من چاوەڕێی وەڵامی تۆم و چاوەڕێی بینینی تۆ

ماچت ئەکەم

فروغ





**پەروێزی** ئازیزم ئەمڕۆ دوونامەم لە تۆوە پێگەیشت ، نامەی یەکەم بەیانی زوو گەیشت و دووە میشان ئێستا کە من گەیشتمەوە . یانی کاتژمێری 2ی دوانیوەڕۆ . بەڵام من نازانم چیت بۆ بنووسم . من هێندە بەسەر دایکما گریام کە ئێستا چاوەکانم ئەسوتێتەوە بۆ من وەڵامدانەوە بە موحیبەتەکانی تۆ گرفتە بەڵام لە بێ توانایی خۆشمەوە ئازار ئەچێژم . پەروێز تۆ زیاد لەرادەی توانینی خۆت یارمەتی منت داوە من ئەزانم کە تۆ لەبەر خاتری من بڕێکی زۆر چۆتە سەرقەرزەکانت و لەهەموو شوێنی هەم ئەلێی فروغ مارەییەکەی بە خیشوە بە من لە کا تێکا کە بەکردەوە وانیە . خۆزگە مارەییەکەم بە تۆ نەئەبەخشی و تۆم هێندە ناڕەحەت نەئەکرد و قەرزەکانیشتم بۆ زیاد نەئەکرد . بەڵام پەروێز سوێند ئەخۆم بەخوا لە ناخی دڵمەوە و بەهەمەمە بوونمەوە ئەڵێم کە تەنها تۆم خۆشئەوێ و رۆحم هی تۆیە . کاتێ بیرلە تۆ ئەکەمەوەوە ، هەست ئەکەم کە بۆ من ئیتر هیچ شتێك بوونی نیە کە بتوانم بیخەمە شوێنی عیشقی تۆ . حەزئەکەم کەتۆ خۆشبەخت بکەم .حەز ئەکەم بوونی من کاریگەرییەکی لە ژیانی تۆدا هەبێت کە ببێتە هۆی شادمانی تۆ . بەڵام بەباشی لەبێ تواناییم تێ ئەگەم .

پەروێز من ئەمەوێ لێرەبڕۆم لەبەرئەوەی کە لێرە مانەوەو شەووڕۆژ خەریکبوون و سەرقاڵبوون بە یادگارییەکانی تۆو ئەو شتانەی کە تۆ بەردەستت کە وتوون مێشکی منیان ورد کردووە کاتێ ژن و پیاوێکی گەنج و خۆشبەخت ئەبینم لانی کەم تایەك هەفتە وەکو شێتم لێ دێ ، شەوانە خەو نامبا تەوە لانیکەم ڕۆژی دووسێ جار ئەچمە سەر ئەو یادگارییانەی کە لەگەڵ تۆدا هەمە. کاتێ ئەڕۆانمە نێوچاوەکانی کامی ئەمەوێ هاوار بکەم. کاتێ بەهۆی بوونی ئەمەوە بیر لەو عیشقە ئەکەمەوە کە جەستەی ئێمەی بەیەك گەیاند حەسرەتێکی سوتێنەر دڵم لێوان لێو ئەکات پەروێز من نامەوێ بیر لە تۆ بکەمەوە ، من بۆ ئەوەی تۆ لە بیر بەرمەوە خۆمم لە ناو بردوە . بەڵام تۆ ڕۆژ بە ڕۆژ بۆ من زیندووترو بەماناتر ئەبی . من تۆ لە کامی یا ئەبینم و تا چاوەکانی من بە ڕووی ئەوا ئەکرێنەوە ، یادی تۆ من ئازار ئەدات . پەروێز گیانم لەم ڕۆژانەدا کە هیچ کەسێ لە بیری منا نیە و هیچ کەس ناتوانی درك بەشەپۆلدانی ڕۆحم بکات تەنها تۆیت کە ئەمکەیتە گریان،لەبەرئەوە هەست ئەکەم کە چاوەکانی تۆ لە چەندین فرسەخ ڕێی دوورەوە نیگەرانی منە . دوێنێ شەو لەبەر خۆمەوە بیرمئەکردەوە کە ئەگەر هەموو ئاسوودە ئەبن و ئەشێ لەبەر پێی تۆشدا ڕێیەك بەرەو ئاسایش و خۆشبەختی بکرێتەوە ، بۆئەوە کە بەوشێوەیەی کە ئێستاهەیە . من جگە لە ئەرك و شێواندنی ڕەوشی ژیانی تۆ هیچ بەرهەمێکم بۆ تۆ نیە. کاتێ نامەکانی تۆ ئەگا ، لەشم وەکو مۆمێ لە شەرما ئەتوێتەوە.تۆ ئەوەندە چاك و من ئەوەندە خراپ ..!خوا یە ئەگەر تۆ منت بکوشتایە باشتر بوو . چونکە من توانای بەرگە گرتنی چاکیم نیە . پەروێز من لێوان لێو بووم لە





هەقناسی ئەمەوێ لە شەقامەکاندا بقیژێنم کە بمکوژن بمکوژن . من خراپەم لەگەڵ کە سێکاکرد کە وەك فریشتەکان پاك بوو . پەروێز من نازانم چی بۆ تۆ بنوسم لێوەکانی من کپ و بێ دەنگن و من ناتوانم تۆ تێ بگەیەنم کە چەندە لەبەردەم تۆدا خۆم بە بچووك و ریسوا ئەبینم. من حەز ئەکەم تۆ لە مانای قسەکانم بگەی . من خۆشم ئەوێی.نەك لەبەرئەوەی یارمەتی من ئەدەی ، نەك لەبەرئەوەی کە ئاگات لەمنە،نەك لەبەر ئەوەی کەپارەم ئەدەیتێ نا پەروێز لەبەرئەوەی کە زانیم کە تۆ چاکیت وهیچ کەس ناتوانێ مەزنێتی ڕۆحی تۆی هەبێ . من بە تۆی ئەسە لە مێنم کە پیاوێکیترم نیە. من بە تۆی ئە سەلمێنم کە لەدوای تۆ هەموو شتێك بۆ من کۆتایی هاتووە ئەگەر کەسێ بتوانێ دووبارە خۆشبەختی بە من ببەخشێ تۆیت نەك یەکێکی تر. من بە تۆی ئەسەلمێنم کە بۆ عیشقی تۆو عیشقی کارەکەم ئەژیم. پەروێز سەرم گێژ ئەخوات ئێستا ئەمەش بۆتە نەخۆشیەکی تازە. من لە هەر کوێ بم و هەرچە ندێ بژیم دیسان ماڵێ تۆم و ڕۆحم نزیك بەتۆیە خۆزیا دەمزانی کە تۆباوەڕ بەقسەکانم ئەکەی حاڵم خراپ نیە تەنها وەکو بۆم نووسیت ، ماند ووم و حەزئەکەم بڕۆم.وەڵامدانەوە بەداوا کارییەکانی نامەکەی تۆو قبوڵکردنی فیداکارییەکانی تۆ زۆر گرفتە بەلامەوە . بەڵام تۆ خۆت ئەزانی کە چەندە ئێستا پێویستم بەوەیە کە لێرە بڕۆم و لانی کەم خۆم بەشتێکەوە خەریك بکەم . من لەوەی کە باس و خوازەکەت بۆ دایکت نەنووسیووە ، زۆر سوپاست ئەکەم بەلامەوە زۆر گرفت بوو . یانی خەجا لەڵت ئەبووم ئێستا ڕاست و دروست بۆ تۆی ئەنوسم کە چ خەرجیەکم هەیە و " چەندی تێ ئەچێ " و چەندیش پارەم هەیە . بیر

یشم چوو بنوسم ئەوپارەیەی کە ناردبووت ماوەیەك لەمەوپێش وەرمگرت و دیسانەوەش سوپاست ئەکەم . من بڕیارە هەقی چاپی کتێبەکەم 2500تمەن لەئەمیر کە بیر وەربگرم کە هەڵبەت هەمووی بەیەکجار ناداو رەنگە بتوانم نزیکەی 1000تمەن سەرەتا وەربگرم وئەوەی کە ماوەتەوە بە مانگانە ئەیدا تۆش کە وتووتە 2000تمەن ئەدەی . نزیکەی 1500تمەن خەرجی سەفەرم هەیە یانی 3000تمەن پاسپورت 1000تمەن گومرگو ، 75تمەن ڤیزە ، نزیکەی 8700تا 900 تمەن بلیتی فڕۆکە . هەڵبەت هی کۆمپانیا ئێرانیەکان و کەمێکیش خەرجی ئەملاو ئەولا . من بە 1500تمەن خەرجی سێ مانگی دواتر ئەمجا مانگانەی کتێبەکەم وەرئەگرم . یانی خەرجی سێ مانگی تر .دوای ئەوە پارەم هیچ نیە بەڵام لەجیاتیدا لەماوەی شەش مانگدا بەدڵنیاییەوە کتێبێکم بۆ چاپ ئامادەکردووە و زمانیش فێربووم و ئەتوانم لەوێ ئیش بکەم . کێشەی کارەکەم تەنها ئەوەیە کە کاتم زۆر کەمە . ئەگەر بمەوێ درەنگتر بڕۆم پارەکانم خەرج ئەبن . ئەگەر بمەوێ لەکاتی خۆیدا بڕۆم. پێویست ئەکات کە پارەکەم زووتر یش بەدەست بگات . لەبەرئەوەی کە ئێستا پاسپۆرتەکەم لە فەرمانگەی پاسپۆرتە ، جەعفری تاچاپی کتێبەکە تەواو نەبێ پارە بە من ناداو بۆ وەرگرتنی پاسپۆرتیش ئەبێ 300 تمەن پارە بدەی . من ئەگەر پاەی فڕۆکەکەم هەبێ ، یانی کتێب فرۆش زوو بیدات ، ئەڕۆم تۆ ئەتوانی مانگانە ئەو بڕە پارەیەی کە ئەتەوێ یارمەتی منی پێ بدەی بۆمی بنێری و فەرشەکانیشت نەفرۆشی

پەروێز گیان بۆ دایکتی بنووسە کە ئەگەر ئەیەوێ فەرش بفرۆشێ زووتر ئەوە بکات فەرش بفروشێ . من ئەرۆم ئەوکاتە دواتر ئەگەر





پارەکەم کەمی هێنا بۆتی ئەنووسم . من تایەکەمی تیر ئەبێ بۆ رۆیشتن لێر3000 تمەنم هەبێ . هەر ئەمە و ئەگەر تۆ ئەتوانی زووتر پێمی بدەی دنیایەك مەمنوونت ئەبم . من ویستم تەخت و کومێدی یەکەی کامی بفرۆشم و بەپارەکەی پاسکیلێکی سێ تایی گەورە ی بۆ بکرم ، بەڵام دواتر پەشیمان بوومەوە . لەبەر ئەوەی کە بینم زۆر کەم هەیە کەئەیانەوێ بیکڕن و ئێستا هەر لەوێ یەو هۆی فرۆشتنی بێ پارەیی من نەبووە . پەروێز گیان چاوەڕێی وەڵامی تۆم . ئیشی پێناسەکەشم چونکە تۆ دەرنگ کەوتی جێبەجێ بوو . یانی سوودم لەتەلا قنامەکە وەرگرت . پەروێزگیان ئیتر ماندوو بووم . نامەم زووتر بۆ بنوسە

ماچت ئەکەم

فروغ

**پەروێزی** ئازیزم هیوادارم حاڵێ تۆ باش بێت. ئەمڕۆ کاتێ تەلەفونم بۆ ماڵێ ئێوە کرد دایکت وتی کەتۆ سەر لەبەیانی دەرچوویت لەکاتێکدا کە " دۆخی " دوێنێ شەو بە منی وت کە تۆ سەر لەبەیانی هەینی ناڕۆێت ، من حەزم ئەکرد جارێکی تر بەر لە ڕۆێشتنت تۆم بدبیایە . چونکە دوور نیە کە ئیتر تاماوەیەکی زۆر ئێمە نەتوانین یەکتری ببینین . هەر چەندە من لەهەرکوێیەك بم لە تۆ دوورنیم و جەستەو ڕۆحم هەست بە گەرمی و بێگەردی جەستەو ڕۆحی تۆ ئەکات .

پەروێز قسەم زۆر پێ بوو کە ئەمویست پێتی بڵێم . حەزم ئەکرد جارێکی تر تۆم ماچکردایە و جارێکی تر لە چاوەکانی تۆدا تەماشای نیگای میهرەبان و دڵڕ فێنم بکردایە . پەروێز بوونی تۆ هەمدیسان ژیانی منی ڕۆشنکردۆتەوە . هەست ئەکەم کە هیوا بودۆستایەتی تۆ و زەو گەرما ییەکی تازە لە منا دێنێتە گۆڕێ . زستانی ڕابردوو دوور لە تۆ بە بێ ئومێدی دیداری سەرلە نوێ ی تۆ و بێ دڵنیابوون بە درێژەپێدانی دۆستایەتی تۆ ڕۆژانێکی سەختم بەسەر برد . بەڵام لە و کاتەوەی کەتۆم دووبارە دیتەوە حاڵم فەرقی کردووە تۆ ئەتوانی لەهەر حالێکدا مایەی خۆشبەختی من بێ . حەزمئەکرد ئەو توانایەم هەبووایە کە بزەی تاهە تابیم بخستایە تەسەر لێوەکانی تۆ.





حەزمئەکرد لەبەردەم ئەم هەموو فیداکاری و دڵسۆزییەی تۆدا بمتوانیایە کارێکی چکۆلانەم بەئەنجام بگەیەندایە کە تۆ خۆشحاڵ بکات . پەروێز ئەفسوس کەبوونم لەوە کەمترە کە بتوانێ خۆشبەختی بە تۆ ببەخشێ و ئەفسوس کە گڕێك لە ناخمدا کڵپەی سەندووە و دانا مرکێتەوە و خۆشم ئەو توانایەم نیە کە دای بمرکێنمەوە . لەگەڵ هەموو ئەمانەدا پەروێز من لە هەر کوێ بم هەرهی تۆم . هێشتاش لە بۆ چوونی خۆما خۆم بە و کچە قوتابیە شانزە ساڵەییە ئەزانم کە لە نێو خەرمانەیەك لەشەرم و حەیای کچێتی دا بەرەولای تۆ هات و یەکەمین ماچەکانی ڕژاندە سەر لێوەکانی تۆ وەك بڵێی زەمەن ڕێرەوی خۆی تەی نەکردووە و ژیان پەردە ڕەنگینەکانی بەرووی منا نەکردۆتەوەو گەردوخاکی تاڵییەکانی بەسەر سەری منا نەڕشتووە. هێشتاش تا چاو لێك ئەنێم وەك ئەوە وایە کە تۆ لەتەنێشت دۆلأبە کەوە ڕاوەستاوی و لێوکانت گەرمی ئەدەن بەروومەتەکانم.وەك هەمیشە بڵێی " فروغەکەم".بەڵێ"من هێشتاش فروغی تۆم . هێشتاش هەر ئەو فرووغەم کە تەنانەت بەبینینی پێڵاوە هاوینە ییەکانی تۆ کە ڕەنگی زەردباوێکی قاوەیی هەبوو لەراڕەوی ماڵێ دایکتا دڵمی پێ تێك ئەچوو و وەکو شێت هەڵئەهاتم . هێشتاش خۆشم ئەوێی مەگەر ئەتوانم فەرامۆشت بکەم. شەوانە لە نێو جێگەی نوستندا تەنها هێشتاش وەك ئەوە وایە کە تۆ لە پاڵما ڕاکشاویت و خەریکی جگەر ە ئەکێشی . چاوە میهرەبانەکانت ئەبینم و سەرم ئەچەقێنمە پشتی یەکەوە تا کەسێ گوێی لە دەنگی گریانم نەبێ . پەروێز نازانم پەنا بۆ چ شتێ بێنم تابتوانم رابردووم لە خۆما بکوژم . خوا تۆ لە مندا زیندوئەکاتەوە هەر خولەك و هەر ساتێ ئەو چەند ڕۆژەی کە تۆ لە

تاران بوویت رۆژێك بۆ نانی نێوەڕۆ لە ماڵێ یەکێ لە دۆستەکانم میوان بووم . سێ چوار کەسی تریشی لێ بوو  لەسەر مێزەکە یەکسەر ماڵێ خۆمانم لە ئەهواز بیرکەوتەوە بەوەی کە هەندێ شەو من وتۆ میوانمان هەبوو و پێکەوە ژوورەکەمان رێك ئەخست . یەکسەر دڵم پڕ بوو لە گریان . هەموو نارەحەت بوون بەڵام خۆشم نەمزانی بۆچی وام لێ هات . ئەشێ هۆکەی ئەوە بووبێ کە رووی مێزەکە شین بووە ، وەکو ئەو سەر مێزەی کە تۆ کڕیببووت, بیرم هاتەوە کە چەند بەدیقەت بووی. پەروێز تۆ تێکەڵێ من بوویت چۆنە ئەتوانم فەرامۆشت بکەم . ئەمڕۆ زۆر نارەحەت بووم . حەزم ئەکرد بهاتمایە بەردەم شەمەندفەرەکە تا تۆ تەنها نەبویتایە نامەوێ تۆ هەست بە تەنیایی بکەی بۆم بنوسە چی بکەم تا تۆ خۆشحاڵ بیت. پەروێز ئەگەر هەموو تەمەنیشم لەرێی ئاسایشی تۆدا دابنێم دیسانە نەمتوانیوە وەڵامی قسەکانی تۆم دابێتەوە . حەزم ئەکەم باش بم باش بم وەی تۆ بم لەهەر شوێنێکم هی تۆ بم تا تۆ قبوڵ بکەی کە من بەزگماك خراپ نیم ، بەلاَ م تەنها بۆ ماوەیەکی کورت تووشی هەلە ببووم .

پەروێز گیانم من وەك لە تاران پێم وتی بریارمداوە بڕۆم یانی ئەبێ 20 تیر لە ئیتالیا بم . دوو رۆژە ئەچم بۆ قوتابخانە ی ئیتالیا یی و بەڵگەنامەی خوێندینشم ئەمڕۆ لە رێگای باڵیۆزخانەی ئیتا لیلوە نارد بۆ هەمان قوتابخانە . حەز ئەکەم کاتێ ئەگەڕێمەوە بتوانم قەرەبووی زەحمەتی یەکانی تۆ و فیداکارییەکانی تۆ ، بکەمەوە . پەروێز چاوەکانم دیسان دوو قات ئێشی تێچووە و من ئیتر ئەم مانگە ئەوەندە پارەی دکتۆرم داوە تاقەتم چووە . چوومە لای ژنێکی مامان ـ یش بۆ نارە حەتیەکانی خۆم . چونکە تۆ راتسپارد بووم . بەهەر



حاڵ ئەبینی کە خەریکم بە تەواوی دەردە دڵت لە لائەکەم . هیوادارم لە کارە کارگێر ییەکانتا سەر کەوتوو بیت.تۆ ئەتوانی نارەحەتیەکانت لە هەر دید ێکەوە بۆمی بنوسی . چونکە مرۆڤ هەمیشە پێویستی بەوە هەیە کە دەردە دڵێ لای یەکێ بکات . راستە کە من بە ڕواڵەت ئیتر ژنی تۆ نیم ، بەڵام تۆ ئەزانی و خواش ئەزانیٚ کە دیسانەوەش هی تۆم و سەرتاپای بوونم بۆ تۆ ئەگەڕێتەوە و ئەمجاش بیرم نەچووە کە تۆ چەندین سەعات بەژوورەکەدا ئەهاتی و ئەچووی و دەنگ و باسی فەرمانگەت بۆ باس ئەکردم . پەروێز ئێستا ش بۆم بنوسە و دڵنیا بە  کە ماندوو نابم .

پەروێز گیان چاوەڕێی نامەی تۆم . زووتر بینووسە . من دیسان نامەت بۆ ئەنووسم . ئەمشەو ئالێرەدا کۆتایی پێ دێنم . ئاواتمە رۆژ بە رۆژ خۆشبەختر بیت . لە دوورەوە بەتاسەوە ماچت ئەکەم

**فروغی تۆ**

**پەروێزی** ئازیزم دوێنێ نامەت گەیشت . هیوادارم حاڵێ تۆ باش بێ . نامەکەت زۆر ناڕەحەتی کردم . لە دوێنی شەوەوە تا ئێستا بیر ئەکەمەوە کە چەند ئەتوانم لە بەرامبەر مرۆڤایەتی تۆدا خۆڕاگری و پایە داری بکەم . ئەگەر توانایەکم بووایە کە منیش بەرامبەر بە تۆ چاکە بکەم و . بوونی من لە ژیانی تۆدا لانی کەم هێندەی کڵاو رۆژنەیەکی چکۆلە روەو روناکی و شادمانی بێ . ئیتر ئەم جار ە ئەوەندە قورسایی نەدەخستە سەر شانم . پەروێز تۆ ئەتەوێ بە چاکی یە کانت لە پێم بخەی و من توانای بەرگە گرتنی چاکیم نیە . کاتێ ئەبینم کەسەنزیکەکانم ، ئەو کەسانەی کە لەگەڵ منا لەژێر ینمیچێکدا ئەژین"بچووکترین ئاگایەکیان لە ناڕەحەتیەکانی من نیە و تۆ کە بەڕواڵەت لەمن دووری و من لەبەردەم تۆدا بونەوەرێکم " بەشێوەی سرۆشتی کە نابێ ئیتر منت خۆشبوێ ، هێشتا ئەوەندە لە بیری منداى و لە ناڕەحەتیەکانی من ناڕەحەت ئەبی و هەر لە خۆوە حەز ئەکەم خۆم بەم بەسەر پێ یەکانی تۆدا و لە تۆدا بتوێمەوەو لە نێو بچم . پەروێز نامەکانی تۆ ، تەنیایی لە ژیانم دور ئەخاتەوە . هەست ئەکەم کە لە ژێر ئەم ئاسمانە شینەدا لە یەك گۆشەی دورە پەرێز دا بوونەوەرێك بیر لە من ئەکاتەوە و ژیانی من نرخ و بەهایەکی بۆی هەیە و ئەیەوێ گەرمی و تیشکی بزەو خەندە





بەلێوەکانم ببەخشێ .ئیتر سێبەری شومی نائومێدی لە سەر سنگم لا ئەچێ . تەنیایی وردمی ئەکردو تۆ لەو گێژاوە من دەرئەهێنێ. پەروێز نامەوێ شتێ بە تۆ بڵێم . تەنانەت حەز ناکەم لە نامەکەمدا سوپاسی تۆ بکەم ووشەکان جێگەی هەستەکانمانیانی تیا نابێتەوە .کاتێ شێوازێك ئەدەین بە هەستەکانمان لە چوارچێوەی ووشە دا و دەستکردەکان لەگەڵ رەسەنەکان ، ئەبێوین رووبەرووی ئەو ڕاستیە ئەبیتەوە .کاتێ سەراپای بوونی من گوڕاوە بۆ هاوارێك ، لە هەقناسی و تاسە من چۆن ئەتوانم ئەم هەستە سوتێنەرو پڕشۆرە لە چوار چێوەی وشەیەکی وشك و بێ گیاندا نیشانی تۆی بدەم .چۆن ئەتوانم بۆ تۆی بنوسم کە نامەکانت چەندە من وردو خاش ئەکەن و چەندە لە بەرامبەر مرۆڤایەتی تۆدا هەندێ هەست بە ریسوایی و بێچارەیی ئەکەم .من ئەبینم کە تۆ ئامادەیت ژیانت لە رێگەی بوونەوە رێکا بەخت بکەی کە لە خۆپەرستی و شێتێتی بەولاوە ناتوانێ هیچ کارێ ئەنجام بدا . کاتێ ئەبینم تۆ بەو دڵسوزییە منت خۆشئەوێ و هێشتا باوەشت ئەتوانێ پەناگای من بێت ،حەزئەکەم بمرم . پەروێز هەمیشە بیر ئەکەمەوە ئیتر ژیانی من چ بەهایەکی هەیە کاتێ نەمتوانی لەرێی خۆشبەختی تۆدا بەسەری بەرم . مرۆڤ هەمیشە لە بەردەم چاکەدا بەچۆکداا دێت و ، تێك ئەشکی ، نەك لەبەردەم خراپەدا نازانم چی بنوسم رەنگە ئەگەر تۆ لێرە بویتایە ئەو فرمیسکانەی کە ئێستا بە زەحمەت لە چاوەکانما هێشتومەتەوە ئەمڕشت بەسەر دەستەکانتا . جووڵە لە ووشە گۆیاترە !

پەروێز من ئیتر سەلامەتیم بۆچی یە جوانیم بۆچی یە من حەز ئەکەم تەنها بەو قۆناغە لەگەشەی رۆحی بگەم کە بتوانم هەر مەسەلەو

بابەتێ لە خۆما شی بکەمەوە . بۆ من پێویستی ووشە بێ مانابێ بتوانم ژیان وەکو گیایەکی ژهراوی لە نێو پەنجەکانما بپروێنم و وردی بکەم و ئەمجاش بیخەمە ژێر پێمەوەو شەقێکی تێ هەڵدەم . حەز ئەکەم دەستم بگات بە ئەبەدیەتی ٚ کە ئارامیی لەوێ وەك پێخەفێ چاوەڕێم ئەکات و ئەتوانم چاوەکانم لە نێو ئەو پێخەفەدا بەبێ هیچ چاوەڕوانیەکی وردو خاش کەر ، لێك بێنم . بە قسەکانم پێ مەکەنە . ئەشێ کەمی ٚ پێکەنیناوێ بێ کەمن لەم تەمەنەدا بیرو بۆ چوونێکی ئاوام هەبێ . بەلأم پەروێز ژیان زۆر پووچ و هیچە بەقسەی هیدایەت"هەموو بنیادەمەکان هاوشێوەی یەکترن.بەغەریزەو پێداویستی گەمارۆدراو لە دەوربەرێکی پیسدا " من ناتوانم بەرگەی ناشیرینیەکان بگرم . رۆحم وەك بەڵندەیەکی بەندکراو بێ تاقەتە . من دنیای جوانە و روناکم خۆشویست و ئێستا بەچاوی کراوەوە دیسان پیسی و تارمایی شوێنگەی ژیانم و کۆمەڵم جیائەکەمەوە و ئەپشکنم پەنا بۆ کوێ ئەتوانم بێنم . خۆم توانای بەرگە گرتنی خۆمم نیە قسەکانی من زۆر هیچ و پووچ و تورەهاتە ئێستا نزیکەی سەعات دەی شەوە .من چووم سەیری شانوگەرییەکی باشم کرد کە لە شانوی تاران خستبویانە سەر شانۆ و کاری زۆری لە مێشکم کرد . لە رێگا بیرم ئەکردەوە کە هەر ئەبێ ئەمشەو نامە بۆتۆ بنوسم . پەروێز تۆ ئەگەر بتەوێ کەمن بمرم زیاتر رەحەت ئەبم تا ئەوەی کە ئەوەندە لە بیری سەلامەتی مندا یت . پەروێز تۆ تێکەڵ بە رۆژانی جوانی و ژیانی من بووی .ئێستا بۆنی عەتری گوڵە ئەقاقیەکان لە پەنجەرەکەوە دێت ناوژوورەکەی من . حەز ئەکەم هەست و نەستی خۆمت بۆ بنووسم . نازانم بۆچی . حەز ئەکەم تۆ لێرە بویتایە . نازانم بۆچی لە





خۆڕا کەوتمە یادی ئەو خانووەی کە لە گەڕەکی موقەدم هەمبوو . پەیوەندیی بۆنی عەتری ئەقاقیاو ئەو یادگارییە ، ئەتوانی چی بۆ من رۆشن بکاتەوە. هەندێ کات بیر ئەکەمەوە کە ئایا من راست و دروست بیر ئەکەمەوە، ئایا هەموو بنیادەمەکان وەکو منن. درواسێکان دەنگی رادێو یان زۆر بەرزکردۆتەوە ، بیرت دێ تۆ هەمیشە ئەتویست رادیۆیە کی باش بکڕی و پێکەوە ئەرۆیشتین سەیری رادیۆکانمان ئەکرد . ئێستا من زۆر ڕقم لە رادیۆیە رەنگە لەبەرئەوەی لە ساتەوە ختێکا ئلەگەڵ تۆدا خۆشم ویستووە و هەرشتێ ژیانی رابروردووم بیر بخاتەوە .

ئەبێتە شتێکی ترسناك ، لەو شتە ئەترسم و حەز ئەکەم بگریم . هەندێ جار ئەو مۆسیقای جارە زۆر لەگەڵ شێواوی و هەڵسوکەوتی شێتانەی رۆحی منا یەك ئەگرنەوە . ئێستا حەز ئەکەم گوێیە کانم بئاخنم .دەنگی کامیش لەو ماڵە وە دێ ئەو کەمێ لەولای منەوە ئەژی .من گوێم لە دەنگییەتی و ئارەزووی لە باوەش گرتنی لە رۆحما ئەسووتێ و ئەبێتە خۆڵەمێش و ئەو هەروا لە پشت دیوارەکەوە پێ ئەکەنێ و من وەك شێت ئەمەوێ هەرچی یەك لە دەوروبەرمایە ببێتە هەڵم .

تۆ لە قسەکانی من ماندوو ئەبی من خۆشم نازانم چی ئەنووسم . حاڵم باشە ؟ نازانم ,خراپە ؟ نازانم بەوتەی " گۆتە " کە لە زمانی دکتۆر فاوست وە ئەڵێ " ماوەیەکە بەرزایی و نشێو لای من مانای خۆیان لە دەستداوە . لای منیش لە مبارەوە باش خراپ و بێ مانان". پەروێز گیان بۆ من نارەحەت مەبە . من ئەگەر نێوەندی ژیانم بگۆڕدرێ ئەگەر ماوەیەك لە نێو ئەو دەنگە دەنگە بچمە دەرەوە حاڵم

باشتر ئەبێ بێ هێزیی مێشکم هۆکەی ئەو بەرگرییەیە کە لە بەرامبەر فشاری دەوروبەردا ئەیکەم . ئەگەر لە نێو شەقامدا سەری من گێژ ئەخواو دەمارەکانم رادە کێشرین و لەسەر زەوی ئەکەوم  جگە لە نارەحەتی دەماری و رۆحی هیچ هۆیەکی تری نیە و بۆ چارەسەرکردنی ئەمجۆرە نارەحەتیانە سەرەتا ئەبێ هۆکەی لە ناوبەریت من ئەگەر دەسالێش لە ئاسایشگای دکتۆر  "رەزاعی " بخەوم بەلاًم دواتر دیسانە وەش لە مالەوە ئەم ریسوایی و ئەم تێکشکانە رۆحیە هەبێ بۆم ، هیچ کاتێ باش نابم . من ئەبێ لە نێو ئەو خەلکەی کە بەسەیرکردن کانیان و فبیتنە فتوولی ئازارم ئەدەن دوور بکەومەوە . هەرچەندە نەبینینی کامی بۆ من خۆی ئازارێکی گەورەیە بەلاًم لانی کەم ئەو هیوایە هەیە کە دواتر بۆ هەمیشە ئەتوانم لەگەلیا بم .

پەروێز گیان بۆ من نارەحەت مەبە . من هەموو ئەو پارانەی کە بۆت ناردبووم لە دکتۆر و دەرماندا بۆ خۆم و کامیم خەرجکرد . هیوادارم لێم رازی بوو بیت . چاوەکانی کامی کەمێ نارەحەت ببوو ، ئەوم بردە لای دکتۆر هەروا خۆشم دیسان چوومە لای دکتۆری مێشك و دیسانەوە کۆمەلێ دەرزیم وەرگرت . چوومە لای دکتۆری چاو لەوێش برێك دەرمان من ئەو رۆژانەی کە زۆر بیر ئەکەمەوەو لە مالەوە نارەحەتم بەزۆری تووشی حالەتێکی ئاوها ئەبم . یانی بەیەکجار سەرم گێژ ئەخوات و چاوەکانم رەش ئەبێ " وەك ئەوەی کە یەکێك هەموو دەمارەکانم رائەکێشی و ئەوکاتە ئیتر هیچ شتێ نازانم وتێ ناگەم . وەك ئەوەی  کە ئیتر زیندوونیم . تا دووسێ خولەك ئاوهایە ئەمجا باش ئەبێ . لەو ساتانەدا حالەتێکی لە بیر چووتەوەم تووش





دێ . مێشکم لە هەر بیرو ئەندێشەیەك بەتالْ ئەبێ و وەك ئەوەی کە چیتر " فروغ " نیم . بەلکو بنیادەمێکم بێ ناو ، بنیادەمێك کە ناوەکەی بزر کردووە . خۆم ئەزانم هۆکەی هەمان ئەو فشارە زۆرەی سەر مێشك و رۆحە . بۆم نەنووسیت کە ئەرۆم رەنگە دوری من لەو دەوروبەرە کاریگەر بێ بۆم . من ناتوانم کۆمەکی تۆ رەت بکەمەوە ، هەرچەند ئەم کارە زۆر ئازاراو بیە بۆ من . بەلاًم ناچارم ، کتێبەکەم لە تەواو بووندایە . پاسپۆرتەکەش لە هەفتەی داهاتوودا بەدەستم ئەگات . کە هەر مەسەلەی پارەکە ئەمێنێتەوە . لە کتێبەکانم نزیکەی 2700یا 2500تمەن ئەبێ وەربگرم کە هەلبەت هەمووی بەیەکجار نادا . من لەمەی کە بە تۆی ئە لێم یارمەتیم بدە ئازار ئەکێشم . بەلاًم ناچارم چونکە جگە لە تۆ هیچ کەسێکم نیە. بۆ دایکتی مەنووسە کە ئەو پارەیە بۆچی خەرجیەك ئەدەی بە من ، تا ئەتوانی تکا ئەکەم باسو خوازەکە " مەسەلەکە " بە جۆرێ بخەرە روو کە ئەوان بە مەسەلەکە نەزانن و وا خەیالْ بکەن کە من بەوپارەیە کارێ بۆ خودی تۆ ئەنجام ئەدەم . لەبەر ئەوەی کە من لەبەردەم ئەوانەدا خەجالەتم . من بۆ تۆم نووسی کە پەلەمە تا لە کاتی خۆیدا بگەم بە خوێندنەکە . ئەگەر نەچم پارەکەم خەرج ئەکەم و دیسانەوە پلەوپایەو پارە لە ناو ئەچێ . تۆش بۆ دایکت بنووسە کە ئەگەر ئەتوانن کارێ ئەنجام بدەن زووتر بۆ ئەوەی کە وەرگرتنی دۆلار زەحمەتە . پەروێز بە خوا زیاتر حەز ئەکەم بمرم ، تا ئەوەندە نەبم بەئەرك بە سەرتۆوە بەلاًم تۆ من ئەبەخشی .

ماچت ئەکەم

فروغ

**پەروێز** هیوادارم کە حاڵت باش بێ ، لە حاڵێ ئێمە بپرسی خراپ نین . کامی ساغ و سەلامەتەو من نزیکەی هەفتەیەکە کە لە نەخۆشخانە هاتوومەوە حاڵم خراپ نیە. تەنها بیری یادگاری رابردوو بە توونددی ئازارم ئەدا . ئەگەر بتوانم رابردووم فەرامۆش کەم ئەو کاتە ئەتوانم بڵێم کە سەلامەتم هۆی ئەوەی کە نامەم بۆ نەنووسیوویت ئەوە بووە کە نەمویستووە بە نووسینی نامە تۆ بەبیری خۆم بێنمەوەو بیرەوەری شوومی خۆم لە مێشکی تۆدا بێدارکەمەوە . ئێستاش کەئەم نامەیە ئەنووسم تا سوپاسی تۆ بکەم ، لەبەر ئەو تێکۆشانەو فیداکارییەی کە بۆ سەلامەتی من نواندوتە . ئاواتم ئەوەیە کە رۆژێ بەچاوانی خۆم خۆشبەختی تۆ ببینم و دەرکی پێ بکەم کە ژیانی تۆ دوبارە رێرەوی سروشتی خۆی ئەگرێتەوە ، تۆ لە ژیان رازیت. ئەو کەلوپەلانەی کە بۆت نارد بووم ئەمڕۆ بەدەستم گەیشت . کتێبەکانم وەك ئەوەی کە زۆر کەمبۆتەوە . من زۆر کتێبم لەوێ هەبوو. هەڵبەت لەبارەی ئەوەی کە چەند دانە بووەو ناوی کتێبەکان چین ناتوانم روونکردنەوەیەك بدەم . تەنها دێتە پێش چاوم کە لەدە دانە زیاتر بووە . ئەو بڕە پارەیەی کە بۆ ئێمە ت دانا بوو تا رادەیەکی زۆر بۆ زستانی کامی جلم کڕی و بەنیازم ئەو بخەمە دایەنگە . بەڵام نزیکەی 100تمەن خەرجی سەرەتایی ئەوێ کە





ئێستا نیمە تادواتر رەنگە بتوانم زووتر هەقی نووسینی کتێبەکەم وەربگرم . بۆ چاپی دووەم بڕیار درا بە 3000نوسخە چاپ بکرێ و 15٪ ی بدرێ بە من . کە پێم وایە بەو پارەیە بتوانم بۆ زستانی خۆشم جل ئامادە بکەم . هەڵبەت ئەگەر زووتر بمدەنێ . پێناسەکەم لەلای تۆ ماوەتەوە یانی رۆژێ کە بڕیار بوو بڕۆینە " مەحزەر " لێت وەرگرتم و ئیتر نەتدامەوە . تکا ئەکەم بۆمی بنێرەوە کەش و هەوا ساردی کردووەو منیش زۆربەی کاتم بەخوێندنەوەی کتێبەوە بەسەر ئەبەم .شیعرێکی تازەم نووسیوە کە چونکە تۆ ڕقت لە شیعر هەڵساوە بۆتی نانووسم . من کە نەمتوانی لە ژیانا بۆ تۆ ژنێکی باش بم بەڵام هیوادارم تۆ هەروا بەدۆستی خۆتم بزانی . وەك چۆن منیش هێشتا و بۆ هەمیشە تۆ بە تەنها کەسێ ئەزانم کە ئەتوانم لە ناخی دڵەوە متمانەم پێی هەبێ و ئازارەکانمی لەلا بدرکێنم لە بارەی کامیەوە نیگەران مەبە . خۆشت ئەگەر بتوانی بیبیت و ئەو ئەتوانێ بتبینێت باشترە . سڵاوی گەرمم قبوڵ بکە . چاوەڕێی وەڵام .

خوا حافیز
فروغ

## سێ شەممە ( 8 ی کانوونی دووەم )

پەروێزی ئازیزم بێ گومان سەیرت لێ دێ لەوەی کە پاش ماوەیەکی زۆر نامەت بۆ ئەنووسم بەڵام بڕوا ناکەم ئەوەت لەبیر کردبێت کەبەمنت وتبوو, هەر کاتێ یارمەتییەکت ویست سەرت لێ بدەمەوە . من گفتم بە تۆ دابوو کە نامەت بۆ بنوسم بەڵام دوایی ڕۆیشتم لەبەر ئەوە بیرم کردەوە بەم شێوەیە دیسانەوە خۆم ئەهێنمەوە ناو ژیانی تۆ و ناهێڵم تۆ لە بیری ئایندەتدا بیت ، لەگەڵ ئەوەی کە لەرادەبەدەر حەزم ئەکردو ئێستاش حەزئەکەم کە لەگەڵ تۆ رایەڵێ نامەنووسینم هەبێ .بەڵام پێ بە حەزی خۆما ئەنێم و حەز ئەکەم سێبەرێکیشم لە ژیانی تۆدا نەمێنێ . پەروێز دەربارەی حاڵێ خۆمت بۆ نانوسم لەبەرئەوەی تۆ خۆت باشتر ئەزانی کە من ئەو بنیادەمە نیم کە قەدری ئارامی و خۆشبەختی بزانم و هەمیشە لە داوا کردنی شتی مەحاڵ و هیچ و پووچ دا بووم . ئێستاش هەروایە لەگەڵ ئەو جیاواز ییەی کە ئێستا لە خۆم بێ تاقەت و بیزارم و ئەو ئارەزوو پووچەش کە بەبەردەوامی لە داوا کردنیدا بووم, مردنە . کەمتر بیر لە رابردوو ئەکەمەوە ، بەلامەوە سامناکە . ئەزانم کە ئەگەر دیسانە بمەوێ.جڵەوی بیرو بۆچوونم رەها بکەم،ئیتر لەدۆزەخی حەسرەتەکانی رابردوو دەرناچمو هەر ئەوە ش بەسە کە دوو قات





شێتم بکات . خۆم خەریك ئەکەم . کتێب ئەخوێنمەوەو شت ئەنووسم و کامیم برد بۆ لای دایکت چونکە ژینگەی ماڵەکەی ئێمە بۆ ئەو باش نەبوو .جگە لەوەش من خۆم لە ماڵەوە وەزعییەتێکی باشم نیە تا ئەو هەی بێ لەم رووەوە پێم باش بوو کە لەو دووربم و ئەو لەلای دایکت بژی . کاتێ هاتی بۆ تاران هۆی ئەو کارەت بە درێژی بۆ باس ئەکەم . لە ماڵێکدا کە هیچ جۆرە سەربە خۆییەکم نەبێ چۆن چۆنی ئەتەوێ بتوانم کامی بەحەزو ئارەزووی خۆم پەروەردە بکەم . هەڵبەتهەموو تاوانەکە بە گەردنی خودی منەو هەڵەیەکی بچووکی خۆم بووە هۆی ئەوەی کە ژیانمانە بەوشێوەیەی لێ بێ " بەڵام دڵنیابە کە ئەگەر تۆش منت بەخش بێ ، خۆم, خۆم نابەخشم .

پەروێز وەزعی من هیچ باش نیە ، پارەی کتێبەکەم بڕێکم وەرگرتووەو خەرجم کردووە .ئیشیش دوو سێ یەکم لێ هەڵکەوتووەو تەنانەت رێکیش خرا.بەڵام چونکە لەگەڵ ئارەزووی منا نەبووە نەڕۆیشتم وئەمڕۆ کەخەریکم ئەم کاغەزە بۆ تۆ ئەنووسم لەکتێبخانەی رێکخراوی بەرنامە کارێکی باشم لێ هەڵکەوت ئێستا بڕیارە کە بچم بۆ ئەوێ . من پێویستم بەبڕی 500 تمەن پارە هەیە . هەڵبەت ئەم پارەیەم بە قەرز لە تۆ ئەوێ هەر کاتێ پارەی کتێبەکەم وەرگرت بۆتی ئەنێرمەوە یان مانگی داهاتووە مانگانە 100 تمەن . . .ئەگەر ناتوانی هەموویم بەیەکجار بۆ بنێری بەدووجار بینێرە بەڵام جاری یەکەم300 تمەن بنێرە چونکە ئەمەوێ کەمێ کەلوپەلی ناوماڵ بکڕم . ئەم مانگە تا مووچە وەرئەگرم با پارەم پێ بێ . پەروێز لە بیرت نەچێ کە من تۆ بە تەنها سەرچاوەی کۆمەکی خۆم ئەزانم لە ژیانا . زۆرم بۆ خۆم هێنا تا ئەم داوایە لە تۆ بکەم . هیوادارم خۆشبەخت بی

. من ئەم پارەیەم زوو زۆر زوو ئەوێ  هەوڵدە تا هەفتەی داهاتوو بە دەستم بگات .وەسڵەکەی بە ناو نیشانی مانەوە بنێرەو بیمەی کە . بەهیوای رۆژێ کە جارێکی تر تۆ ببینمەوە

فروغ



**یەکشەممە 24 ی کانوونی دووەم )**

پەروێزی ئازیزم ئەو برە  پارەیەی کە بۆت ناردبووم ئەمڕۆ وەرمگرت . نازانم چۆن چۆنی سوپاست بکەم . هەرچەندە ئیتر تۆ بۆ من لە دەست دەرچوویت ، بەڵام هیچ کاتێ یادت لە دڵم دەرناچێ . چەندجارێك بە تۆم وتبوو کە لەدوای تۆ ئیتر ژیانی من ئەبێتە هیچ و ئێستا بەباشی هەست بەو راستییە ئەکەم . رووی گەڕانەوەم بۆ لای تۆ نیە و قەتیش نامەوێ بە شێتێتی و دەبەنگیی خۆم هەمدیسان ژیانی تۆ تێك بدەم و بشێوێنم . هیچ شتێ ئیتر ناتوانێ لە دوای تۆ من بۆ لای خۆی رابکێشی . تەنانەت شیعریش تەنانەت شیعر کە لام وابوو هەموو شوێنە بەتاڵەکانی ژیانم پڕ ئەکاتەوە . ئێستا بە بۆ چوونم ئەویش بێ نرخ و بێ مانا دەرئەکەوێ . هەندێ جار حەز ئەکەم لە تاریکیا وون بم ، لە خۆم هەڵدێم . کە هەمیشە مایەی ئازاری خۆم بووم ، لەخۆم کە نازانم چی ئەکەم و چیم ئەوێ . . . پەروێز بەخوا ژیانم لە گۆڕێك ئەچێ . بەگۆڕێ کە جە ستەم لەناو خۆیا ئەگوشێ و هیوا  روناکەکانم دا ئەپۆشێ . رقم لە هەموو شتێ ئەبێتەوە من بە 21ساڵ ژیان هێندەی ژنانی 60یا 70ساڵە پیر بووم . هەندێ کات لە خۆم ئەپرسم کە بۆچی ئەژیم . ژیان کاتێ لە عیشق و دڵنەوایی بە تاڵ بووەوە . کاتێ چاوانی پیاوێ بە موحیبەتی پڕاو پڕ

بەبەردەوامی نیگەرانی مرۆڤ نەبوو ، کاتیٚ مرۆڤ هەستی کرد کە تەنها یە ، بەکەڵکی چی دیٚ . گێلە ییەکانمانم بیردێتەوە ، ئەو مەلە کردنا لەم بیر دێتەوە کە دوانیوەڕوانی گەرمی هاوین پێکەوە ئەمانکرد ، شەڕەکانمانم بیر دێتەوە ، روخساری تۆ وەکو خاڵێکی رووناك لە بەردەم چاوەکانما سوڕ ئەخوات . سوڕ ئەخوات گریانم لە قوڕگما ئەتاسێنم . نامەویٚ کەسیٚ بزانیٚ کە هیچ کاتیٚ ناتوانم تۆ لە بیربەرمەوە. پەروێز بە خوا بە هەموو شێتێتی یەکمەوە خۆشمویستی و خۆشم ئەوێی . رەنگە بەقسەم پیٚ بکەنی ئەشیٚ لەبەر خۆتەوە بڵێی چۆن چۆنی رێی تیٚ ئەچیٚ ژنیٚ کە پیاوێکیوا خۆش بویٚ خیانەت لەو پیاوە بکات . بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا من خۆشم ویستی . بیرکردنەوە لە دووری تۆ هەمیشە دڵم ئەلەرزێنیٚ لەو رۆژەوە کە تۆ رۆیشتووی هەر هەمووی ویستوومە فێڵ لە خۆم و کەسانی تریش بکەم . بەڵام هەرکاتیٚ ناوی تۆ لە جیٚ یەك ئەبریٚ بەوپەڕی بیٚ توانایی و بیٚ دەسەڵاتیەوە هەست ئەکەم کە لە دوای تۆ مەحالە ئیتر بتوانم پیاوێکم بەو چۆنێتی یەوە خۆشبویٚ . خۆشبەختی و ئارامیی بەڕۆیشتنی تۆ وەکو خۆرێك ئاوابوو, من پێشبینی ئەوەم بۆ خۆم کردبوو, . من لەو ساتەوەی کە لە تۆ جیابوومەوە ، تۆم زیاد لە هەمیشە خۆشویستوویت ، من لەگەڵ زانینم بەوەی کە بەجیابوونەوە لە تۆ ئیتر هەموو شتیٚ کۆتایی پیٚ دیٚ بۆم ، ئەم جیابوونەوەیەم ویستووە نەك بۆ ئەوەی کە سەربەست بم بەڵکو بۆ ئەوەی کە خۆم بەشایستەی ئەو عیشق و خۆشبەختی یە نەئەزانی کە تۆ ئەتدا بە من .من خۆمم نەبەخشی. خۆش نەبووم لە گوناحەکانم . بێلە بابەدبەخت بم لێگەڕیٚ با ژیانم لە عیشق و لە خۆشبەختی بە تاڵ بیٚ . بۆ منیٚ کە





خیانەتم لە عیشق و خۆشبەختیم کرد ، چ سزایەکی شایستەتر لەم درەوشەی ئێستا م ئەتوانیٚ بوونی هەبیٚ ، ئێستا هەرکاتیٚ ژن و مێردانی گەنج لەگەڵ یەکدا ئەبینم لە خۆڕا دەستی ٚ چنگ لە دڵم ئەگریٚ . ئەو رۆژانەم بیر دێتەوە کە خۆم لە هەموو ئەوانە خۆشبەختر بووم . تۆم هەبووی تۆم بە دڵی پاك و میهرەبانتەوە . . . و لە دڵمەوە ئەگریم ئاخ ئەگەر لێرە هەبووایە . بیٚ گومان من ئەچووم و ئەبوومە راهیبە . هەست ئەکەم کەشتیٚ لە خۆڕا بەرەو ئاین و خوام رائەکێشی . حەز ئەکەم هەموو چێژو خۆشییەدنیاییەکان بنێمە ژێرپێمەوە و ووردو خاشیان کەم . حەز ئەکەم لە سروشت بەهێزتر بم. حەز ئەکەم سەرتاپا رووناکی و موحیبەت بم و یادگاریی ژیانی رابردووم بەپەنا بردن بۆ هیچ و پووچی و هەوەس دەرکردنە نە شێوێنم . پەروێز هەموو شتیٚ بۆ من کۆتایی هاتووە ، تەنها ژین ماوە ژیان بەیارییە دووبارە بووەکانی ، من سام لە خۆم ئەکەم من هیش کاتیٚ نامەویٚ لەگەڵ خۆما بەتەنیا بمێنمەوە . چونکە تۆ لە ناو منا ئەژیت و تۆ ئەمخەیتە گریان . هەرچی یەك لەدەوروبەرمایە ئەملەرزێنی. حەز ئەکەم باوەڕ بەقسەکانم بکەیت . ئەمانە قسەنین پەروێز بە خوا نالە و هاوارن .خەریکبوو ئەتاسام . دواتر بەدرۆ وتم کە هیچ خەمێکم نیە . شێت بووم هەموو ژیانم ئازارە... ئازار....نازانم درك بەمەزنیی چەمکی ئەم ووشەیە ئەکەی یانە نا؟ کاتیٚ ئەڵێم ئازار تۆ بیر لە ئازاریٚ مەکەرەوە کە دورنیە جەستەی مرۆڤ لە نەخۆشیەکی توونەدوە بێچژیٚ .... نە... رۆحم ئێشی دیٚ و حەز ئەکەم خۆم بەیەکجاری رەحەت بکەم. پەروێز تۆ ئیتر رۆیشتی وەکو هەورێك کە هێواش هێواش بە ئاسمانا تێئەپەڕیٚ و خەڵکی بەسەرسامیەوە لە جوانیی کەی ئەڕوانن

. ناتوانم بێم بەدواتا " دوات کەوم " لەبەرئەوەی بوونی خۆم بە ژەهرێکی کوشندە ئەزانم بۆ کوشتنی خۆشبەختی تۆ ,تۆ رۆیشتی و ژیانی من لەلاواننەوەکانی تۆ بەتاڵ بووە . بەڵام بیرتە شەوانە _ و رۆژانە _ خولەك و ساتەکانە _ هەموو پڕیەتی لەیادی تۆ و _ هەڵاتنی من...لەژووردا دائەنیشم سەرم لە نێو هەردوو دەستم دائەنێم و بەخۆم ئەڵێم " نا ، نا ، نا ئیتر نابێ بیر لەو بکەیتەوە. ئەو وەکو ئاو بۆتە هەڵم . ئەو وەکو خۆر ئاوابووە هەر وابزانە کە ئەو نەبووەو نیە . بەڵام روخساری تۆ لە بەردەم چاوانما سوڕئەخوات.بیری گەرماوەکا نمانم ئەکەوێتەوە ، بیری ئەو مەلە کردنانەم ئەکەوێتەوە کە نیوەڕوانی گەرمی هاوین پێکەوە ئەمانکرد.لاواندنەوە پڕ لەدڵسۆزییەکەی تۆم بیر ئەکەوێتەوە . پەروێز بە خوا بەد بەختم و ئەو بەدبەختیە وەکو شەرابێ مەستم ئەکات ئەو بەدبەختیە مێشکمی بە نج کردووە . تۆم ئەوێ و ناوێ . نامەوێی لەبەر ئەوەی بەد بەختیم لێ ئەسێنێتەوەو ئەمەوێ لەو رووەوەی کە ئارامیی منیت نابێ قسەکانی من بەبۆ چوونی تۆ زۆر رۆمانسی بێت بەڵام باوەڕکە کەئاوا هەست ئەکەم . ئەزانم کە نابێ ئەم قسانە بۆ تۆ بنوسم . ئەزانم کە چیتر تۆ هی من نیت بەڵام نابێ . ناتوانم هەر ئەمجارە بێڵە بیڵێم ئەمجا ئیتر نامە نانووسم . پەروێز ئەمڕۆ بەفر ئەبارێ لە دوای چوار ساڵ ئەمڕۆ رەنگی بەفر ئەبینم . بیرمە هەمیشە پێم ئەووتی ئەهواز ئێمەی لە بینینی بەفر بێ بەش کردووە . لە دڵەوە حەز مئەکرد زستانی راستە قینە بە چاوی خۆم ببینم . بەڵام ئێستا وا ئەزانم ئەم بەفرە بەسەر دڵێ منا ئەبارێت و ساردی شوومی ئەو بەفرە لە هەموو دەمارەکانو رەگەکانمدا هەست پێ ئەکەم . خۆزگە ئەم بەفرە بەسەر





گۆڕەکەی مندا ئەباری و من ئێستا زیندوو نەبوومایە ، یانە ئەگەر زیندوو ئەبووم لەگەڵ تۆدا تەماشای بەفرم بکردایە . پەروێز بە من پێ مەکەنە . گاڵتە بەقسەکانم مەکە ، بەخوا حەز ئەکەم بۆ شوێنێ هەڵبێم تا رابردووم نەبینمەوە . حەز ئەکەم شێت بم و شعورم لە ناو بچێ . تارابردووم بەبیر نەهێنمەوە لە بەرئەوەی رابردوو حەسرەت لە دڵی منا ئەژێنێتەوە و سەراپای بوونم لە ناکامی و ئازارا ئەلەرزێنێ . رەنگە تۆ وای بۆ بچیت کە ئێستا من خۆشبەختم . ئێستا سەربەست و رەحەتم و ئێستا بە ئامانجم گەیشتووم ، بەڵام نا ، تەنها مردن ئەتوانێ من لە دەستی خۆم بڕەتێنێ و ئاسایشم پێ ببەخشێ . ئەگەر ویستت وەڵامێکم بۆ بنوسە . من ئارەزووم ئەوەیە کە خۆشبەختی تۆ ببینم . چونکە ناتوانم ئیتر لە مەز یاتر بنوسم . خوا حافیز بەیادی ئەوساوە ماچت ئەکەم .

وێنەیەکم بۆ بنێر پێوسیتمپێیەتی .

فروغ

## چوار شەممە ( 28ی شوبات )

پەروێزی ئازیزم دایکت ئەمڕۆنامەکەی تۆی داپێم . من لەلای خۆمەوە بیرم کردبۆوە ، کە تۆ نەتویستووە وەڵامی نامەکەی من بدەیتەوەو نەمئەزانی کە نەخۆش بوویت . هیوادارم حاڵێ تۆ هەمیشە باش بێ و ئەگەر هەندێ جار نامەیەکت بۆ ئەنووسم وەڵام بدەیتەوە . حاڵێ من خراپ نیە . یانی هیچ شوێنێکی لەشم نائێشێ بەڵام ئەگەر بتەوێ قوڵتر حاڵم بپشکنی ئەبێ بە تۆ بڵێم کە بە هیچ جۆرێ حەز بە ژیان ناکەم ژیانی بۆم بێ مانایەو ئیتر بەرگەی ناگرم . بەپێچەوانەی تۆوە من حاڵم بەخوێندنەوەی کتێبی دەروونناسی و هی تر باش نابێ . من مرۆڤێکی هەستیاو وشێتم و وەکو تۆ ناتوانم بەسەر مێشکما زاڵ بم . ئازارەکانم لەوە گەورەترن کە دەیان بینم و هیچ کاتێ توانای رووبەرووبوونەوەی راستیەکانی ژیانم نیە . چەندین جار ئارەزووم کردووە کە وەکو تۆ بم بەڵام وادیارە خوا نایەوێ کە من رووی خۆشبەختی ببینم . متمانەو باوەڕ بە خۆ کردن لەمنا مردووە . ئەو ژینگەیەی کە من تیایدا ئەژیم بۆ من کوشندە و ئازاراوییەو بەبەردەوامی هۆکاری لاوازی و ورەلەقیی من ئەدا . هەمیشە بیر ئەکەمەوە کە تەنها بۆ مردن باشم . لەبەرئەوەی لە ماڵدا کەسێ نرخ و بەهایەکم بۆ دانانێ و کەسێ نیە کەکە سێتیم بەهێز بکات . ناتوانم





هیچ کارێ بەباوەڕومتمانە ئەنجام بدەم . لەقی و دوودڵیی وەکو سێبەرێکی شووم قورسایی ئەخاتە سەر کاروکردەوەو ، بیرو بۆچوونەکانم و کە سێتم وەکو پارچە سەهۆڵێك کەوتێبتە بەرهەتاوی تانەو تەشەروخراپ گوتنی خەڵکانی تر دڵۆپ ، دڵۆپ وا ئەبێت بە ئاو ، هیچ نیە لە ئازاری من بگات و کۆمەکم بکات تەنها بەو شێوەیەی کە هەم بمناسێ . ئاخ ئێستا ئەزانم کە دەردی غەریبی چ دەردێکی گەورەیە . چ کەسێ ئەتوانێ ئێستا باوەڕ بکا کە هیچ شتێك لە دڵی منا نیەو من جەستەمم کوشتووە... جەستەمم بە هەموو شۆرو شەیدایی و هەستێك کوشتووە کە لاوێتی تیایدا خوڵقاندوییەتی تا بەیادی پاکی تۆ وە فادار بمێنمەوە و یادی تۆ نەئالێنمە یادی هەوەس و ئارەزووە پووچ و بە خەرج چووەکان . هیچ کەس ناتوانێ باوەڕبکا کە ئائەمە بۆ من بەسەکە بیرکەمەوە شەوانێکی درێژ لە باوەشی تۆدا تا بەیان نووستووم و دڵێ تۆ لە سەرسنیگم لێیداوە . لەدوای تۆ ناتوانم هیچ کەسێکم خۆشبوێ . چێژو خۆشی پیاوان لای من لە گاڵتەجاڕیی ئەچێ . لەبەرئەوە بە بەردەوامی تۆم لە یادە و تۆ بۆ من وەك کێشانەو پێوانەیەکیت کە بەهۆیەوەکە سانی تر ئەپێوم. کاتێ پاکی و بیگەردیی دڵێ تۆ بەبیردێنمەوە رووپایی و دووورووییی کەسانی ترم زیاتر لە بەرچاو دەرئەکەوێ من . پەروێز بەخوا من شایستەی ئەو چارەنووسە نەبووم .دڵێ من پاك بووە. رۆحم هێستا خڵتەی گوناهێك پیسی نەکردووە تۆ ئەتوانی باوەڕ بەقسەم بکەی لەبەرئەوەی من هەمیشە هی تۆ بووم و ساتێکیش چی یە لە خۆش ویستنیتۆ دو دڵ نەبووم . تەنها .... نازانم چ هێزێکی قووڵ و نهێنی منی تووشی ئەم کێشەیە کرد . بۆچی ئەو کارەم کرد . هیچ

نازانم هەندێ کات لە بیر نەکردنەوە لەو مەسەلەیە ئەوەندە ماندوو ئەبم کە لەلای خۆمەوە ئاوا لێکی بدەمەوە ، بێجگە لەمەش نابێ با ببێ .هەرجێیەك رووبدات سروشتی و بەشیك بووە لە چارەنووسی من . من ئەبێ لەبەردەم ئەو چارەنووسەی کە ژەهری بە دبەختی لە جێی شەهدی خۆشبەختی دڵۆپ دڵۆپ کردە . ئاواتمەوە سەری خۆ دەستەوەدان دانەوێنم لەمەزیاترت دەربارەی خۆم بۆ نانووسم. تۆ ئەتوانی چی بۆ من بکەی . ئەو رۆژەی کە بە عیشقی خۆت خۆشبەختیت پێ ئەدام ، قەدری تۆم نەزانی و ، وەك شێت دوای قسەی هیچ و پووچ بەرباد کەوتم و ئەمڕۆ ئیتر ئەتوانم چاوەڕێیی یت لێ بکەم . بائەوانەی کە زۆر کەمتر لە من لە تۆ نزیك بوون . لە بوونی تۆ شادبن و من کەساڵانێکی دوور سات و خولەکەکانی تەمەنم تێکەڵ بەسات و خولەکەکانی تەمەنی تۆ کردووە و یەکەمین ترپە عا شقانەییەکانی دڵمم لەبەر خاتری تۆ بووە ، دور لە تۆ لەپرسەی خۆشبەختی لەدەست چووما بژیم و بزەو پێکەنینم لە بزەو پێکەنێکی کورت بچێ. کە نزیکبوونەی خولەکەکانی دوا دوای تەمەن هەست پێ کردووە رۆژانە تێ ئەپەڕن بێ ئەوەی من ئاگایەکم لە تێپەڕبوو نیان بێ کەوتوومەتە ناو بۆ شاییەکی ترسناکەوەو بۆ ژیان پێویستم بە هیوایەکە . من ئەزانم کە کۆتایی بە خۆشبەختیم هاتووە و ئەگەر هەموو کتێبەکانی جیهانیش بخوێنمەوە هەرگیز دووبارە بەدەستی ناهێنمەوە لەبەرئەوەی من بنچینەی ژیانم بزر کردووە . پەروێز لە حاڵ کامی بپرسی خراپ نیە کە من ئەوم لەلای دایکت داناوە وای بۆنەچیت کە من لە گلدانەوەی ئەو کەمتەرخەم بووم . بەڵکو لێرە زیاتر بیرم لە ئاسایش وحەسانەوەیئەو کردۆتەوە تا لە





خۆشبەختی خۆم . پەروێز بەخوا من درۆناکەم . من نەمویست رۆحی ئەو کە ئێستا وەکو گولێکی جوان و بوندارە لە دەوروبەری ماڵ ئێمە کە تێکەڵە بە دەنگە دەنگ و کێشمەکێشە هەمیشە ییەکان ژەهراوی بێ . من لەلای خۆمەوە بیرمکردەوە کە ئەو نابێ دایکی لە خراپترین رەوشدا ببینێ کە تۆ خۆت ئەتوانی بیهێنتە بەرچاوی خۆت کە چی یە . وە هەر لە ئێستا وە متمانەو دڵنیایی لە ژیانا لێ زەوت بکرێ لە ماڵ ئێوە دا بێ گەردیی و دڵسۆزییەك هەیە کە پەروەردەی رۆحی ئەو ئەکاو لێرە دانین . دوور بوون لەو بۆ من ئازارێکی گەورەیە بەڵام پێم باشترە کە ئەو لە من دوور بێ وەلە بریدا ژینگەی شووم و کارەساتباری ماڵ ئێمە کاریگەرییەکی نەخوازراو لە رۆحی پاکی ئەودا جێ نە هێڵێ من خۆم لێرە وەزعییەتیکی باشم نیە و حەز ناکەم ئەوبە ئاگری من بسووتێ . ئەو پارەیەی کە نارد بووت هێشتا پێم نەگەیشتووە . نامەوێ سوپاست بکەم لەبەرئەوەی زۆر سوپاسکردن کارێکی هیچ و بێ مانایە من لە دڵەوە رێز لە تۆ ئەنێم و ئاواتم ئەوەیە کە رۆژێك بتوانم بە هەموو خراپیەکانمەوە کۆمەك بە خۆشبەختی تۆ بکەم گە.

فروغ





## پێشکەشە بە هاوسەرەکەم
## (گەڕانەوە)

لە دەست نامەو سکالآناخۆشەکانت
تا نیوە شەو خەو نەچۆتە چاوەکانم
ئەی پاڵپشتی دوورو مایەی ئومێدی من
قەت مەڕەنجێ لەنهێنی شیعرەکانم

رەنگە توانای وام نەبووبێ بەبێ دەنگی
هەستی دڵێ بچکۆلەی خۆم پەنهان بکەم
بهێڵە با گۆرانی من راز درکێن بێ
دە با ئەوەی نەم و تووە بە یانی کەم

کە سەیری رابوردووی ئەوینی خۆم ئەکەم
دێتە یادم وەکو خۆرێکی بزر بوو
ئەناڵێنم لەدڵێکی نوقمی خوێناو
" رەنجانی یار نەبێ ، سوودی شیعر چی بوو ؟ "

چۆنە ئەم ژانە لە ناو دڵدا پەنهان بکەم ؟
ئەویش کاتێ دڵ لە دەستی تۆ تەرەبوون
ئەو شیعرانەی کە گیانی تۆ ئازار ئەدەن
ناڵە و هاواری دڵێکی مەینەت چە شتوون

وتی قەفەس ! ..... بەلاّم بلّێم چی کە پێشتر
بیّ ئاگا بووم لە دووڕوویی مرۆڤەکان
داخەکەم ئەم جیهانە خەلّە تێنە پڕ لە رازە
هاوار ! بەباق بریقەی ، منی رفان

ئێستاش ماندوو لە داوی فێلّ و خەلّەتانی
دیسان پەنام هێناوە بۆ کونجی قەفەس
بیکەرەوە دەرگا کەوا لە ژیانما
خۆشحالّ نە بووم مەگەر لە پشت توولیّ قەفەس

هەردوو پیّ ی من دیسانەوە لە زنجیر نیّ
نەوەکا فڕو فێلّ و فیتنە لە پێم بخا
نەوەکا دەستی بەتینی حەزی رەنگاو رەنگ
دیسانەوە کۆتێکی تر بکاتە پێم

( 22 ی مایس ) فروغ

ئێستا ئەزانی چەندم خۆش دەوێیت و چەندیش پەشیمانم .





## یەکشەممە ( 30ی حوزەیران )

پەروێز ی ئازیزم ئەم نامەیەت بۆ خوا حافیزی بۆ ئەنووسم . نازانم لە کویّ وە دەست پیّ بکەم ، بەخەم و پەژارەیەکی توونددەوە لێرە ئەڕۆم . ئەمویست نامەت هەرهیچ بۆ نەنووسم زۆریش هەولّمدا بەلاّم دیسان نەکرا . نازانم بۆچی ، تەنها حەزم ئەکرد فێلّ لە خۆم بکەم وەك بلّێی ئەم کارە زۆر ئازاراوی بیّ بۆم ، کە قەلەّم هەلّبگرم و بۆتی بنووسم " خوا حافیز " . ئایا پاشانە چی ئەبیّ ؟

خۆشم نازانم ، ئەڕۆم خۆم بزرکەم لە کاتێکدا کە چاوەکانم نیگەرانی تۆو کامی یە . بیری ئەوەی کە رونگە ئیتر هیچ کاتیّ نەتوانم ئێوەو مانان ببینمەوە ، شێتم ئەکا ، ژیانم بەو جۆرەی لیّ هات کە دواجار منی گەیاندە ئەم شوێنە . من خۆم ئەزانم کە خەریکم بەرەو نادیار ئەڕۆم ، یانی ناچارم بڕۆم باری دەروونیم بە جۆرێکە کە ناتوانم بەرگەی مانەوە ی ئێرە بگرم . تۆ دواتر چی بیریّ ئەکەیتەوە ؟ ئێستا نووستبووم و رابردوو وەك کاسێتکی رەنگاو رەنگ بەبەرچاوما تێئەپەڕی .هەستم بە ئازار کرد لە ناو هەموو دەمارەکانما هەموو چوونە سەربان و نووستن . شەو ئەوەندە قورسە کە ناتوانم هەناسە بدەم و من ئەوەندە تەنیام کە هیچ شتیّ ناتوانیّ تەنیایم پڕ بکاتەوە . ئەشیّ تۆ و کەسانی تر لە دوای من بیربکەنەوە کە من زۆر

خراپ بووم, من منالەکە مم خۆش نەویستووە . بەلاّم من نازانم چی بلّیّم من ئەو تەنها بە تۆ ئەسپیّرم . تۆ ئەتوانی هەست بکەیت کە بە کویّ گەیشتووم لە ژیانا بیری ئەو فرمیّسك بەچاوانما دیّنیّ . حەز ئەکەمدایکیّکی باش بم بۆی ، بەلاّم ئەفسوس هەرچیەك کە لە دەوروبەرمایە دژایەتی ئارەزووەکانم ئەکات و بە بەردەوامی ژیان دورم ئەخاتەوە لیّی . من ئەڕۆم و ئەو تەنها ئەمیّنیّتەوە نابیّ ئاوا بیّ " بەلاّم ئەبیّچی بکەین .

پەرویّز لەم ساتانەدا کە چاوەکانم ئەیانەویّ هەموو یادگارییەکان هەموو ژینگە و شتەکان لەناو خۆیا بەنەمری رەنگ پیّ باتەوە . دلّم لیّوان لیّوە لەخەم . تەنها بیر لەو ئەکەمەوەو تەنها بەبوونی تۆ هیوادارم . رەنگە بۆ ئەو ، رۆیشتنی من زۆر ناڕەحەتکەر نەبیّ . بەلاّم لەگەلّ هەموو ئەوانەدا تەنها داوام لە تۆ ئەوەیە کە زووتر بیّی بۆ تاران ، تا ئەو بەتەواوی تەنها نەبیّ .

پەرویّز من نازانم بە چ زمانیّ سوپاسی موحیبەتەکانی تۆ بکەم ئەگەر تۆ نەبوویتایە ، من نەمئەتوانی پشت بەهیچ کەسیّ ببەستم . بەخوا بە هەموو بوو نمەوە ئاواتە خوازم کە تۆ خۆشبەخت بیت و بە هەموو بونمەوە ئاواتە خوازم کە من و خراپیەکانی من فەرامۆش کەیت . من هەمیشە خۆشم ئەویّی. نەمویست ئەم رستەیەت بۆ بنوسم لەبەر ئەوەی کە من ئەو نرخ و بەهایەم نیە کە تۆم خۆشبویّت . تۆ رۆحت زور لەوەگەورەترو پاکژترە کە لە رۆحی من بئالّیّ من مرۆڤیّکم کە خۆم لە نیّو ریّڕەوی ترسناکی شیّتیتی یەکانم ناوەو زیاد لە هەموو شتیّ بیر لە هیّزیّکی قوولّ ئەکەمەوە کە واز لەدەستەکانم ناهیّنیّ و لەناو دەروونمایەو لە نیّو پەنجەکانیدا بوونەوەریّکی لاوازم





و هیچی تر . ژیانی من لەو شویّنانە بەسەر ئەچیّ کە چەندین فرسەخ لە خۆشبەختی و کامەرانیی واقیعی یەوە دوورە . هەروا لە ژیانی تۆ ... و من ئەگەر سەرەنجام شیّوازی بیری خۆمم بزانیبا هیچ کاتیّ ژیانی تۆم نە ئەئەشیّوان . ئیّستاش کە ئەڕۆم ، تۆ بمبەخشەو هەرلەبیرم بەرەوە من خۆم تازانم چی بکەم. چوار شەممە بەیانییەکەی ئەڕۆم . هەر هەموو گالّتەم پیّ ئەکەن بەلاّم بۆ من هەموو شتیّ لیّ بۆ تەوەو بەدبەختی و خۆشبەختی مانایەکی نیە . من بۆ ئەوە ناڕۆم کە خۆشبەخت بم . ئەڕۆم خۆم لە بیرئەبەمەوە و تۆ لەبیر بەرمەوە و رابردوو لە بیربەرمەوە . بەلاّم ئەزانم کە هیچ کاتیّ ئەمە نابیّ . هەمیشە جیگەی بە تالیّ تۆ لە پالّ خۆمدا ئەبینم و هەمیشە یادی تۆ و یادی عیشقیّ کە پیّت بەخشیوم و ئامیّزیّکی گەرم کە کردتەوە بەرووما ژیانم لەلا تالّ ئەکات .

من خۆشم ئەویّی و ، هەرچی زیاتر ئەمەویّت فەرامۆشت بکەم . زیاتر هەست بەو هەقیقە تە ئازارو ییە ئەکەم . گەڕانەوە بۆ لای تۆ و تەحە ممولّکردنی ژیانی سنورداری خیّزانیی گرفتەبۆم ، بەلاّم راکردن لە تۆ و فەرامۆشکردنی تۆش لە توانا مدانیە . تۆ بۆ من بویتەتە مەتەلّ . بۆم بویتەتە ئەشکەنجەو باشیەکانت ئازارم ئەدا . پەرویّز جاریّکی تر ئەینوسمەوە کە کامی بەتۆ ئەسپیّرم . تۆمەهیّلە ئەو هەست بە نەبوونی من بکات . ئەوەندە خۆشت بویّ کە منی لە بیر بچیّتەوە.هەموو نیگەرانیەکانم لەبەر ئەوە خۆم جلوبەرگی بۆ ئەدوروم و ئەینیّرمەوە . کاتیّ هاتیەوە بۆ تاران ئەو لەگەلّ خۆتا بەرە . پەرویّز هەر لەگەلّ گەیشتنمدا ناو نیشانەکەمت بۆ ئەنیّرم کە وەلاّمی نامەکانم بەو ناونیشانە بدەرەوە . حەز مئەکرد بەرلە رۆیشتن ، تۆم

بديبايه بەلاًم تۆ نەهاتيتەوەو ئێستا نازانم كە ئايا هەمديسان لە ژيانما رۆژێ تۆ ئەبينمەوە يا نە . وێنەی كامی و خۆتم بۆ بنێرە .

بەوپەڕی موحيبەتمەوە

ماچت ئەكەم .

خوا حافيزی تۆ   فروغ




IRAN. AHVAZ
ROMA

## پشتی کارتی جەژنە پیرۆزە "

پەروێزی ئازیزم ، هیوادارم حاڵت باش بێ ، ئەم نامەیەت لە ڕۆماوە بۆ ئەنووسم . سەفەرەکەم بەخۆشی تێپەڕی . بە درێژایی ڕێگا بیرم لەتۆ دەکردەوەو لەبەرکامی نارەحەت بووم . داواکارم زووتر بچی بۆ تاران تا ئەو تەنیا نەبێ . ئێرە شارێکی زۆر گەورە و قەرەباڵغە . بەلاّم من لای دۆستێکم ، ژوورێکی باشم گرت.نامەی درێژت بۆ ئەنووسم ناونیشانی خۆمم نووسی.

**ماچت ئەکەم**

پەروێز گیان . بەو ناونیشانەی ژێرەوە نامەم زوو بۆ بنوسە و دەربارەی کامی بۆ دایکتی بنوسە کە زۆر ئاگایان لێ بێت . پەروێز بە خوا زۆر ناڕەحەتم ئێستا لەبەر ئەوەی ئوتو مبیلەکە ئەیەوێ بڕوات ، بەخێرایی ئەم کارتەم نووسی تا هەواڵێ حاڵێ و ئەحواڵێ من بزانی .

هەمدیسان ماچت ئەکەم

**فەرمانگەی داوایی _ ئاغای پەروێز شا پور**

IRAN _ AHVAZ

**ناو نیشانی من**

ROMA _ VIA CAlDEZINI NO 25/ 2





**دایکی ئازیز** ئەم کارتە لە وێستگەی شەمەندەفەری رۆماوە ئەنێرم چونکە زۆر نارەحەتم بۆ کامی و ئەشمەوێ سوپاسی تۆ بکەم کە هەمیشە ئاگات لێیەتی . حالێ من باشە .تکات لێ دەکەم کە جارجار بەو ناونیشانەی ژێرەوە دەربارەی حالێ کامی بۆ بنوسیت لەلایەنی منەوە سەد هەزار جار ئەو ماچ بکە . من جلوبەرگ و کە لوپەلی یاری بۆ ئەنێرم ئەگەر کارێکت هەبوو سەردانی دایکم یاکلۆر بکە . کلۆر جلی بۆ ئەدورێ . سەبارەت بەئەو بۆ پەروێزیشم نووسیووە . هەموو ئومێدێکم بە ئێوەیە و لە دڵما دنیایەك موحیبەتم بۆتان هەیە . لەلایەنی منەوە سلاو بە هەمووان بگەیەنە کامی ماچ بکە . بەئومێدی دیداری سەر لە نوێ .

**فروغ**

شەقامی ئەمیرییە.چوار رییانی گومرگ.کۆلانی کەمیلی . بەرامبەر گەرماوی سبزی کار . ماڵێ دکتۆر سەجادی .خانمی

**شاپور**

Iran.tehran






ئەم نامەیە فروغ لە پشتی پۆستکاردا نووسیوویەتی‌و لە ڕۆماوە بۆ شاپوری ناردووە.



ئەو پۆستکارتانەی کە فروغ لە ڕۆماوە بۆ شاپوری ناردووە



**یەکشەممە ( 30ی جوزەیران )**

پەروێزی ئازیزم هیوادارم حالّت باش بیّ .لەو کاتەوەی کەلە تارانەوە هاتووم لەگەلّ ئەوەی کە 2اکارت و نامەیەکم بۆ ناردوویت هێشتا هەوالّێکی تۆ نازانم دلّم بەسەختی تەنگەو نازانم بۆچی تۆ لێم زیز بووی . ئەگەر ئەتزانی کە چەندە تۆم خۆشئەویّ و چەندە لێرە شەوو رۆژ لەبیری تۆدام ، رەنگە نامەت بۆ بناردمایە . حالیّ من خراپ نیە ، کەش و هەوا لێرە زۆر گەرم بووە . وەکو ئەهواز بورۆژ لەمالّ هەر نایەمە دەرەوە تەنیای تەنیام هیچ هەوالّێکی تاران نازانم هیچ کەسیّ لە بیری مندا نیە . حەز ئەکەم ئەوەندە بچوك ببمەوە تا هێندەی بالّندەیەك لێ دیّ . ئەوکاتە بەم لەشەقەی بالّ و بێم بۆلای تۆ . پەروێز هەرگیز رابوردووم فەرامۆش ناکەم رۆژانی ئەهواز.... ئەشیّ هەرگیز ئیتر نەتوانم هاوشێوەیان لە ژیانما بێنمەکایەوە. ئێستا ئیتر هیلاك و نائومێدم . دلّم بۆ کامی تەنگ بووە .ئێستا کە ئەهاتم لە ئوتۆبۆسێکدا کورێکی بچکۆلەم بینی هاوشێوەی ئەو.دلّم بەجاریّ داکەوت و گریام . هیچ کاتیّ نەبوو ە کە خەمەکانم تەواو بن بۆم . پەروێز لە بیرم ناچێتەوە کە لە تاران بێت وتم کە خۆشم ئەوێی و مەرجم کردووە کە بۆیەك بین . ئێستا کەواتە بۆچی نامە نانووسی . بۆچی فەرامۆشت کردووم . تۆ ئەزانی کە من لێرە تەنیام . تکام وایە

لانی کەم مانگی نامەیەك بنووسە.من هیچ باش نیم. ئەبیٚ ئیش بکەم. بەیانی تا شەو ئیش ئەکەم. مێشکم ئیتر دەیەشیٚ ، ئەگەر بگەڕامایە تەوەو جارێکی تر ژیانی رابوردووم دەست پیٚ بکردایەتەوە رەنگە باشتربووایە . بەلاّم بەداخەوە کە لەتارانیش ئاسوودەنیم . لەهیچ شوێنێ ئاسوودە نیم پەروێز بەخوا چاوەڕێم زوو نامە بنێرە سەبارەت بەکامیش بۆمی بنووسە . لەبەرئەوەی کە دلّم بۆ ئەو بەتووندی تەنگ بووە . پەروێز ئەگەر ویستت شتیٚ بۆ کامی بکڕی مەیکرە " بیلّە لێرە من بۆی بکڕم " چونکە هەرزان و جوانە .

**ماچت ئەکەم**

**فروغ**



## سیٚ شەممە ( 7ی تەمووز )

پەروێزی ئازیزم هیوادارم حالّت باش بیٚ .ئێستا وا هەفتەیەکە کەلە ڕۆمام .حالّم خراپ نیە . بەلاّم خەریکم ئەتاسێم .لەبەرئەوەی کە زۆر تەنیام وجورئەتیش ناکەم تێکەلیٚ ئێرانیەکان بم . لەبەرئەوەی بیرەوەرییەکی باشی ئاشنایەتیم لەگەلٚ هیچ یەکێکیاندا نیە . بەرۆژ ئەڕۆم بۆ سەیری شارو بەشەویش لە ژوورەکەمدا دائەنیشم و کتێب دەخوێنمەوە یان شتیٚ ئەنووسم.یەکەم رۆژ کە هاتمە ئێرە ناونیشانی هاوڕیٚ یەکی کۆنم پیٚ بوو کە لەخانەی هونەر پێکەوە بووین لام وابیٚ تۆش بیناسی . ئەو خوشکی " علیسەدر " ە کە گوایا لە سەربازیدا لەگەلٚ تۆدا بووە . بەڕێکەوت لە مالّەکەیدا ژورێکی بەتالٚ هەبوو کە من یەکسەر تێی چووم . لە لا یەنی خانوەوە خەیالّم ئاسوودە بوو . بەلاّم لە بارەی کارەکەمەوە بۆت بنوسم . چونکە من درەنگ بەڕیٚ کەوتم ، بۆ سیٚ مانگی هاوین چیتر ناتوانم بچمە زانکۆ.منیش بڕیارمدا ئەو سیٚ مانگە زمان فێر ببم و دواتر بڕۆم بۆ قوتابخانەی" سیرامیك " واتە کاشی دروستکردنی مودێرن کە لێرە زۆر پەرەی سەندووە و ئەو جاش چنینی سەر قوماش فێر ببم تا دوارۆژ بتوانم ژیانم لە تاران دابین کەم . ژیان لێرە زۆر گرانە من ژوورێکم گرتووە مانگی بە 18000لیرە یانی 180 تمەن ئەگەر بمەویٚ ژورێکی

هەرزانتر بگرم ئەوا رۆحم دەرئەچیّ . یانی ئەگەر ماوی هەیە و ئەگازو جگە لەوەش بچووك و پیسیشە . خەرجی خواردنیش لەبەرئەوەی دەستی پێوە ئەگرم رۆژانە 600 لیرە یانی بە 6 تومەن ئەکریّ بیبەیتەسەر ئەمجا ئەمێنێتەوە خەرجی دەرەوە ، یانی تراموا و بینینی مۆزە خانە و ئاسەواری مێژوویی کە زۆری تیّ ئەچیّ . بەهەرحالّ من لەبیری ئەوەدام کە بەجۆریّ ئیدارەی خۆم ببەم بەڕێوە ، تابتوانم بۆ ماوەی یەك سالّ لیرّە بمێنمەوە . من ئیرەم پیّ خۆش نیە . لیرە ژیان بیّ گیانە وخەلّکی زۆر ماشێنیین .کاتیّ لە پارکە گشتی یەکاندا کچان و کوڕان ئەبینم کە جوانترین و تاریکترین ساتەکانی عیشقیان لەوپەڕی ئاسایی بووندا بەسەر ئەبەن . حەز ئەکەم هاوار بکەم.لیرە عیشق یانی قەلاّیەکی داگیرکراو و یانە کتێبکی خوێندراوە ،خرۆشان مانایەکی نیە و عیشق لەو پەڕی پووچی دایە و من لەو رەوشە زۆر ناڕەحەتم . دلّم بۆ تۆ تەنگ بووە . هیچ کاتیّ باشیەکانی تۆ لەبیر ناکەم و چەندە زیاتر ئەچمە نیّو خەلّکیەوەو لیّ یان ورد ئەبمەوە زیاتر هەست بە دوری تۆ ئەکەم و زیاتر بۆم دەرئەکەویّ کە چەندە دەرهەق بە تۆ هەقنەناس و بیّ رابوردوو بووم. باری دەروونیم خراپ نیە لەبەر ئەوەی کە لە دەنگە دەنگی تاران رزگارم بووە و دوورم لەو خەلّکانەی وەك ئەوەی کە دوژمنایەتی هەشتا سالۀ یان لەگەلّما هەبووە لیرە هێشتا شیعرم نەنووسیووە . لەبەرئەوەی کە ئیّستا سەرقالیّ بیرکردنەوە لە ژیان و دۆزینەوەی ریّگەیەکم بۆ ئیدارە دانی ژیانم ، لیرە ئەمویست بچم بۆ دوبلاژکردنی فیلم یانی پیّشتر بانگیشت کرابووم . بەلاّم کە بینیم ناوەندێکی پیسە ئەمە بوو جێم هێلاّ . ئیّستا سەرەنجام بە جۆرێك ئەبیّ و من بە دلّنیایەوە برسی





نامێنمەوە . هاتنم زۆر ئاسان بوو لە تارانەوە بەفڕۆکە هاتم شەو لە بەبروت بووم . بەبروت شارێکی زۆر جوانە . رۆیشتم گەڕام بە هەموو شارەکەدا و بەیانی زوو دەرچووم و کاتژمێر 8/5 ی8گەیشتمە باشوری ئیتالیا . لەویّ بە کەمیّ ئیتالیایی کە فیر بوو بووم ، ناونیشانی وێسگەی شەمەندەفەرم وەرگرت و بلیتم بۆ کاتژمێر 8/5ی شەوم کڕی تا شەو لەکەنار دەریا دانیشتم. شەویش بە ڕێکەوتم و بەیانی کاتژمێر 8/5ە گەیشتمە رۆماو چونکە ناونیشانی هاورێکەمم پیّ بوو یەکسەر سواری تاکسی بووم و چووم بۆ مالیّ ئەوان و بەرێکەوت ژورێکیش چۆلّ بوو و من شانم هێنا ، بەلاّم خەرجیەکەم زۆر بوو یانی هەرچی پارەم پیّ بوو رۆیشت هەلّبەتە تا خوا هەیە ژیانیش بەجورێك ئەگوزەری ٚ و نابیّ لەمبارەوە زۆر بیربکەیەوە . بەلاّم پەرویّز حەزم ئەکرد لە هەمان جیّ دا لە ئەهواز بوو مایە و شەو رۆژ هەستم بەبوونی تۆ بکردا یە لە پالّ خۆمدا و کامیم بۆ گەڕان ببردایە . خۆشبەختی لە بەرز فڕیندا نیە و کەسانی قانیع لە ژیانا هەمیشە رازی ترنە . من کویّم گرتووەو چۆن چۆنی ئەتوانم لاف لیّ دەم کە ژیانم داگیرکردوە ، نەو من لاوازم و ناتوانم قبولیّ بکەم کە ژیان یانی مێردو منالّ و چاوم لەدوی خەیالّ و ئارەزووی بیّ بنەما بێت . ئیّستا کە خەریکم ئەم نامەیە بۆ تۆ ئەنووسم ، لە پۆستخانە دانیشتووم . کۆمەلّیّ مرۆڤیش لە دەورم دانیشتوون کە هەموویان سەرقالیّ ئیش و کاری خۆیانن . کاتیّ سەیری ئەوانە ئەکەم لە لای خومەوە بیر ئەکەمەوە کە لە هەموویان بە دبەخترم لەبەرئەوەی کە ژیانم بزر کردووەو ئیّستا ئەمەویّ خۆشم بەجۆریّ بزرکەم . یادی کامی دلّم ئەگوشیّ .ناتوانم بەرگەی دووریی کەی بەم خۆێن

ساردییەوە  بگرم . هەموو شەویٚ تا چێنیك نەگریم . خەو نامباتەوە سووچی خۆم بوو کە ژیانم وای لیٚ  هات بەلاٌم نازانم بۆچی ؟ پەروێز بەخوا هیچ کاتیٚ لەبەرچاوم دوور ناکەوێتەوە . ناتوانم پیاوانی ترم خۆشبویٚ پیاوان بەلامەوە پیس و گاڵتە جارنەو کاتیٚ سەیرم ئەکەنە دڵم تێك هەڵدیٚ و ئەمەویٚ بڕۆم و بیان خنکێنم .حەزم ئەکرد تۆ بویتایە و تۆم بەسنگمە وە بنوسانایەوەتاوێك بگریامایەو جارێکی تر لەگەڵ تۆدا بگەڕامایەتەوە بۆ ئەهواز و ئەبوومە ژنێکی چاك . بەلاٌ م ئەفسوس کە تۆ زۆر لە من دوری و ژیانی ئێمە لە یەك جیابۆتەوە بیٚ ئەوەی دڵەکان یەکتریان فەرامۆش کردبیٚ . پەروێز نامەم بۆ بنوسە زۆر زیاد ، لانی کەم هەفتەی دووجار . حەز ئەکەم تۆ خۆشبەخت بیت حەز ئەکەم تۆ لە ژیانا بگەی بە هەرشتیٚ کە ئەتەویٚ ، چونکە خۆشم ئەوێی . لە ناخی دلەٌ وە خۆشم ئەوێی و لە هەڵسوکەوتی رابردووم زۆر شەرمەزارم .  پەروێز دەربارەی کامی بۆم بنوسە و تکائەکەم زووتر بچۆ بۆ تاران تا  تەنیا نەبیٚ .

لە دوورەوە ماچت ئەکەم

فروغ










## 12 ی ئاب " _ رۆما

پەروێزەکەم ئەمڕۆ لە تارانەوە نامەیەکم هەبوو ، زانیم کە تۆ هاتوویتەوە بۆ تاران . دنیایەك خۆشحاڵ بووم . چونکە ئێستا ئیتر کامی تەنیانیە و ،ئە گەرمنی لێ نیم تۆ هەیت کە زۆرت خۆشبوێت ، چونکە خۆت ئەزانی کە کەسانی تر هەر چەندێکیش موحیبەتیانە بۆ بنیادەم هەبێ " هیچ کاتێ ناتوانن جێگەی بەتاڵێ باوك یان دایکی بنیادەمەکە پڕ بکەنەوە . پەروێز تاکو ئێستا بەلانی کەم دە دانە نامەم بۆ نووسیوویت و نەمناردوون.نازانم بۆ ؟ وام ئەزانی کە تۆ ئیتر خۆشت ناوێم چونکە هەرهیچ وەڵامی نامەکانمت نەداوە نەوە چەند رۆژێك لە مەوبەریش کە کتێبێکت بۆ ناردبووم هەرچەند لاپەڕەکانیم هەڵدایەوەو سەرەو ژێرم کردن بەشکو وشەیەکت بۆ نووسیبم " بینیم کە نەخێر هیچ شتێ نیە . بەسەختی خەمبارم بڕیار بوو نامەم بۆ بنووسی بڕیار بوو هی یەکتربین بەڵام تۆ یا فەرامۆشت کردووم یا ئەوەندە بەلایقت نەزانیوم کە جارێکی تر نامەم بۆ بنووسی . بەڵام پەروێز من هەمیشە لەبیری تۆ دام . ئالێرە کە ژینگە بە تەواوی گۆڕڕاوە لێرەکە سەربەستی قورسایی ئەخاتە سەرشانم و لێرەکە ئەوەندە جوانیی هەیە و من ئەتوانم سوودیان لێ وەرگرم . هەرگیز بێجگە لە تۆ هیچم ناوێ هەموو رۆژێ بەیانی و هەموو رۆژێ دوای

نیوەڕۆ ئەڕۆم و سەیری سندۆقی پۆست ئەکەم و هەموو شەوێ بە خۆم ئەڵێم کە بەیانی هەر ئەگات . پەروێز تۆ هەقتە ئەگەر منت خۆش نەوێ ، هیچ کاتێ ژنێکی چاك نەبووم بۆ تۆ هەمیشە ئەشکەنجەم ئەدایت و نوقمی ناوخەونەکانی خۆم بووم . بەلأم لانی کەم بۆم بنوسە کە ناتەوێ لەگەڵ من نامەگۆڕینەوەت هەبێ . پەروێز لێرە تارادەیەك حالْم باشتر بووە چونکە ئیتر لە میوانخانە ژوورم گرتووە کوڕێکی بچکۆلەی لێ یە کە کوڕی خاوەن مالْە کەیە . قژی سەری زەردو چاوەکانی شینە . ناوی "ئە رێکو" یە بەیانیان و شەوان کە لە مالْوەم ئەو دێت بۆ لای من بەیادی کامیەوە ئەوم زیاد خۆشئە وێ . هەرچەند ە ئەشکەنجەم ئەدا هیچ نالیێم چونکە بیر لەوە ئەکەمەوە کە نەوەکو کامی ئەشکەنجەی کەسێ بدات و سزای بدەن و ئەوبگری و منی لێ نەبم کە فرمێسکە کانی ماچ بکەم و بە سنگمیەوە بنو سێنم .فێری ئیتالیایی بووم یانی ئەمەندەی کە لەماوەی مانگێکدا ئەبێ فێربم . ئێستا ئەتوانم پێویستیەکانمی پێ دەستەبەر بکەم . خەیالْم نیە بچم بۆ " پروجیا " چونکە لە ڕۆما قوتابخانەی زمان فێر بوون زۆرە بەلأم ئێستا چونکە پشووی هاوینە ، لەهەموو شوێنێ داخراوە . دوومانگی تر ئەکرێتەوە من ئەچم بۆ قوتابخانەی " سیرامیك " یان کاشی سازی مودێرن کە وای بۆ ئەچم لە ئێران چاك بێ بۆ ئیش کردن سێ و چوار دانە شیعرم وتوە . ئەمەوێ سوود لە دەرفەت وەرگرم و کتێب بنووسم ، ئێستا خەریکم لە مێشکما بابەتی ئەوە تاوتوێ ئەکەم بەلأم هەمیشە لە رووی باری داراییەوە نارەختم . وتارگەلێکی زۆرم بۆ گۆڤارەکانی تاران ئامادە کردووە کە بە نیازم سەرەتای مانگی داهاتوو بینرم بەلأم ئەو پارانە





بە کوێ ئەگاو جگە لەمەش ئەگەر بمەوێ هەمووکاتم لە نووسینی و تاردا بەسەر بەرم لە کوێ ئەتوانم شیعر بڵێم یانە کتێب بنوسم یا وانە بخۆینم و موتالأ بکەم . بەسەختی بێچارە بووم . ئێستا حەز ئەکەم پارەی زۆرم هەبێ . ئێستا هەست ئەکەم کە پارەو پوول بۆم بۆتە مەسەلەیەکی ژیاری بەهەر حالْ هەموو شتێکیپێ جێ بە جێ ئەبێ . ئەبێ بیرێکی تر بکەمەوە . سەرەنجام تۆ لە رەوتی باس و خوازی هەمووکارەکانم ئاگادار ئەکەمەوە و تۆ ئەوسا ئەزانیت کەچۆنە پارە پەیدا ئەکەم .

پەروێز ڕۆما زۆر جوانە . ئەمەندەشتی لێ یە بۆ سەیرکردنە کە مرۆڤ گێژ ئەبێ،بەلأم خەڵکێکی باشی نیە. پیاوەکانیام هەموو هەرزەو بێ تەربیەتین و ژنەکانیشان هەموو بیرو خەیالێکیان ئەوەیە کە گیرفانی پیاوان بە تالْ کەنەوە . بەلأم بەگشتی جوانیەکان زۆر ترن و مرۆڤ ئەتوانێ خۆی بەو شێوەیە دامرکێنێ .لێرە ئێرانیەکان زۆر نین وەئەگەر هەشبن من هەقم بە سەریانەوە نیە. زۆر شت هەیە لە پشت جامخانەی شووشەی دوکانەکانەوە ئەبیینم ،هەرزانە و جوانە و لە خۆڕا حەز ئەکەم کە پارەم پێ بێ و بۆ تۆ کامی بکڕم و بێنیرمەوە ، بەلأم یەکسەر رەوشی خراپ و سەیری خۆمم بیر دێتەوە و پێ یەکانم خێرا ئەکەم و چاوەکانم دائەخەم تا ئیتر هیچ شتێ نەبینم و هیچم نەوێ . تاکو ئێستا زۆر تر مۆزە خانەکانم بینیە . مۆزە خانەی" ڤاتیکان" ئاخ خۆزیا تۆش لێرە ئەبووی و ئەتبینی تاچ پلەیەك هونەر پێش کەوتن و گەیشتن بە ترۆپکی هەیە و چۆن چۆنی مرۆڤ لەبەردەم مەزنێتی ئەودا خۆی بزر ئەکات . بۆ تۆ توانای هاتن هەیە چونکە لە ڕۆما مەسرەف هەر زانە مانگی بە 50000 لیرە یانی 600تمەن بە

پارەی خۆمان ئەتوا نی بژیت . هەڵبەت بەباشی یانی ژووری باشت هەبێ ، خواردنیشت رێکوپێك بێ و بتواتی شەوان بچی بۆ سینەماو یات بەرۆژ تەماشای مۆزە خانە بکەی و بەلاّم ئیتر لەمە زیاتری تیا نابێ .یانی جلوبەرگ و سەفەرو نەخۆشی و بەکورتی پاشماوەی خەرجیەکانی تر ئەبێ پارەی زۆرت هەبێ پەروێز حەز ئەکەم زۆر شتت بۆ بنوسم بەلاّم کاتێ بیر ئەکەمەوە سەیر ئەکەم چ سوودێکی هەیە ئەگەر سەد هەزار جاریش بنوسم کە خۆشم ئەوێی ، تۆ باوەرناکەی ، بەلاّم هەقیقەت نیە . هەقیقەت ئەوەیە کە لێرە لە رۆما لە نێو دەستەیەك کچ و کوڕی ئێرانی کە خەریکن تا ئەوپەڕەکەی سوود لە ئازادی خۆیان وەرگرن من شەو ورۆژ بیر لەتۆ ئەکەمەوە و ناوی تۆ فرمێسك دەزێنێتە چاوم و هەرکاتێ کەسێ لە من پرسێ کە بۆچی چوار دیواری ژوورەکەم جێ ناهێڵم و ناچم بۆ پیاسەو رابواردن لە دڵەوە پێ ئەکەنم . چونکە بۆ من ئیتر ئەم پیاسە و رابواردن و ، ئەو سەماکردن و لەدەوری‌یەك کۆبوونەوانەو ، کات بەسەربردن بەقسەی بێ مانا بۆتە کارێکی گەلحۆیانە و بێ واتا بۆ من خەڵوەتی خۆم خەڵوەتێ کە بە خەمی لەدەستدانی تۆ و شادمانی رابردووم نەخشاوە ، زۆر خۆشتر و شیرینترە . بیر لە تۆ ئەکەمەوە ، لە تۆ ، لە قسەکانی تۆ ، لەچاوەکانی تۆ ، لە پێکەنینەکانی تۆ ، لە گاڵتە جاڕییەکانی تۆ ، لەو پیاسەو گەڕانانەی کە لەگەڵ تۆدا دەرچووم . بەو ساتانەی کە لەگەڵ تۆدا بەسەرم بردوون . بەشەوان و بەبەیانیان بەنیوە شەوان و بە ماچ و بەفرمێسك و بە شەڕو بەزیزبوون و بە ئاشتی بەماڵەکەمان و بەکامی و هەندێ کات بە خەونەکانی خۆم پێ ئەکەنم و کاتێکیش دێ





کە سەرم ئەخەمەسەر سەرین و ئەگریم . چونکە ئیتر هیچ شتێ تازە نابێتەوە بۆم . کاتێ تۆ رۆیشتی ئەمزانی کە بۆ هەمیشە ئەتەوێ بڕۆی بەلاّم ددانەکانم لە یەگ توند کرد و وتم ئەبێ تەواو بێت . چونکە نەمویست پیس بێ .

پەروێز ئێستا وەکو ئەوە وایە کە خەریکم ئەم قسەیەی تۆ بە خودی تۆی ئەڵێمەوە وەك ئەوەیە کە تۆ لە پاڵما دانیشتووی قووڵێ چاوەکانت کە خۆشم ویست و لێوەکانت کە ماچم ئەکردن و قژت کە کاتێ ئەتشۆردو سفت ئەبوو زۆر جوان بوو و بە دزییەوە لە تۆی ئەڕوانی کە نەوەکو پێی بزانی ولە خۆت بگۆڕێیت . ئێستا هەمووی لە بەرچاوما زیندووبوونەتە وە. سەرم رائەوەشێنم چونکە یادی تۆ هەمیشە لەگەڵ فرمێسکا دێت. نامەوێ بگریم چونکە ئیتر ماندوو بووم ماندوو بووم . تاکەی ئەبێ بیر لە تۆ بکەمەوە . ئارەزووی تۆ بکەم ، تۆم بە هەموو بوونەوەوە, هەموو هە ستێکە وە بوێ و دەستم پێت نەگات .حەزئەکەم جەستەم بە گەرمیی جەستەی تۆ بسووتێ. ماوەیەکی زۆرە کە چیتر جەستەم ئارەقی نە کرد ووەو داخ نەبووە. ماوەیەکی زۆرە کە ماچەکانت لەسەر لێوەکانم هەلاّتوون . جگە لە تۆ هیچ کەسێکم بۆ خۆش ویستن لەلانیە .بەدوای عیشقا ئەچم و بە پەشیمانیەوە ئەگەڕێمەوە .چونکە عیشق و چێژی من لەبوونی تۆوە یەو ناتوانم فێڵ لەخۆم بکەم..کاتێ بیر لە چێژوەرگرتن ئەکەمەوە جەستەم رائەکێشرێ ، جەستەی تۆم بیر ئەکەوێتەوە و بە یادی رۆژ و شەو و ئەوخولەکانەی کە لە بوونی تۆدا نوقم ئەبووم و تۆ دە ستت ئەگرتم و ئەو دنیا جوانەت نیشان ئەدام کە بنیاتت ناو،چاوانم ئارەقی

ئەكرد . ئای پەروێز زۆر شێت بووم . نازانم چی ئەنووسم . ئەمەندە هەیە كە ئەزانم درۆنانوسم . تەنیا داواكار ییەكم لە تۆ هەیە نامەم بۆ بنوسە تەنانەت ئەگەر یەكێ بێت . تەنها

یەكێ . هەمدیسانیش رازیم ، چونكە خۆشم ئەوێی ئەوەندەش كە بزانم كە لە بیرتام و فەرامۆشت نەكردووم ، بەسە . دەربارەی كامیش بۆم بنووسە . لە دوورەوە سەد هەزار جارت ماچ ئەكەم

**فروغ**





## سێ شەممە 8ی ئۆكتۆبەر

پەروێز نازانم بۆچی دیسان خەریكم نامەت بۆ ئەنووسم . ئەمڕۆ لە دوای مانگێ كاغەزی دایە هات و هەواڵێ حاڵێ كامیم زانی . رەنگە من هەقم نەبێ كە لەوبپرسم و ئەو بەهەی خۆم بزانم ، بەڵام ئایا ئەتوانی نكوڵی لە هەستی دایكایەتی من بكەیت . پەروێز كاتێ ئەو نیگارو وێنانە یم بینی كە بۆمی كێشا بوون ، زۆر گریام . حاڵم باش نیە . لێرە لە تەنیایدا رۆژ بەرۆژ ورەم خراپتر ئەبێت. بەتابیەتی كە نەبوونی پارە و پەشێویی ژیان و دەربەدەری زیاتر وردوخاشی كردووم . سێ مانگە كە لێرەم بەڵام هێندەی سێ ساڵ لە بەرچاوەما چۆتە پێش. ئەمەوێ چاوەكانم لێك بنێم و خۆم لەتاران و لەلای كامی ببینم . تۆ منت فەرامۆش كردووە. هەقت ئەدەمێ من شایستەی هیچ جۆرە موحیبەت و بەزە ییەك نیم.من مرۆڤێكی بەدبەختم كە رۆحی سەرگەردانم هەر ساتەو بەرەو لایەكم رائەكێشێ و سەرەنجامیش ئەزانم كە جێگەم لە كوێ یە .لێرە ژیانم شووم و ترسناكە . ئێستا سێ مانگە نەخۆشم و دەم لێك نانێم . تۆ ئەزانی كاتێكیش كە لە تاران بووم لە دوای مناڵبوون هەمیشە وەزعی زێدانی من خراپ بووەو چارەسەرم ئەكرد.لەو كاتەوەی كە هاتوومەتە ئێرە هەر لەسەرەتاوە هەستم كرد كە حاڵم خەریكە رۆژ بە رۆژ خراپتر ئەبێ

توانیم تەنها جارێك بچمەلای دكتۆرو وتی هێلكە دانەكانت ئاوساوەو هەوی كردووە وەئەمە تازە نیە . رەنگە ساڵێك بێ و تۆبێت نەزانیوە و ئەبێ زوو چارەسەری بكەی . بەڵام پەروێز چۆن چۆنی ئەمتوانی هەموو جارێ 430تمەن بە دكتۆر بدەم وپسوولەی گران گران بكڕم ! وتم بەجەهەنم ، ئێستاش ئەڵێم بەجەهەنم ، دواتریش ئەیاڵێم بەجەهەنم . من تەنها ئەبێ بمرم . كاتێ خۆشبەختی ئەڕوا لێگەڕێبا بۆ هەمیشە بڕوات ئێستا ئیتر هەندێ جار لە تاو ئازاری زۆر ئەمەوێ هاوار بكەم . بەڵام بەرگەی هەموو شتێ ئەگرم . رەنگە مەرگم زووتر بێ و ئاسوودەم بكا . كاتێ هەمووان روویان لێ وەرگێڕاوم كاتێ مانگ بە مانگ لە منالەكەم بێ خەبەرم ، كاتێ تۆ كە تەنیا پاڵپشتی من بوویت ، پشتت تێكردووم ، ئیتر ئەمەوێ چی لە ژیان بكەم . پەروێز رەنگە تۆ باوەڕ بەقسەكانم نەكەی ئەشێ من بەدرۆزنەو بەدڕەگەزو تەلەكە باز بزانی ، بەڵام من تەنها زۆر بەدبەختم هەر ئەوەو تەنها گوناهم ئەوەیە كە زۆر زوو هاتمە نێو ژیانی كۆمەڵایەتیەوە . یانی كاتێ كە كچانی تر لە ماڵەوە ماڵە باجێنە و بوك بوكێنەیان ئەكرد ، بۆیە توانای بەرگەگرتنی راستیەكانی ژیانم نەبوو و ، ئێستا تێكشكاو و بەدبەخت كەو تووەمەتە ئەم سووچی دنیایەوەو دڵنیام كە ئەگەر بمرم لەبرسانا یا بە نەخۆشی یا بە بەدبەختی و ئائوومیدیا هیچ كەس نازانێ . پەروێز لە مەزێتر نانوسم ناتوانم بنوسم سوێندت ئەدەم بە گیانی كامی و بەیادی ئەو رۆژانەی كە پێكەوە ئەژیاین و یەكتریمان خۆش دەویست و ئێستا حەسرەتی ساتێكیش ئەخۆم ، ئەگەر من خرا پەمكردووە بمبەخشە ، من گۆڕڕاوم ، زۆر گۆڕڕاوم .من منالێ بووم و ئێستا ژیان بەسەختی مات و حەیرانی كردووم . پەروێز



رابوردوو لە بیر بەرەوە و بەخاتری ئەوەی كە من لانی كەم بتوانم لێرە بەبیرێكی ئاسوودەوە دەرس بخوێنم هەندێ كات سەبارەت بە حاڵێ كامی بۆم بنووسە و وەكو جاران لەگەڵ منا دۆست بە . پەروێز من نامەوێ پشت بە یەكێكی تر ببەستم من ئەمەوێ هەمیشە تۆم هەبیت . ئەگەر ئەتەوێ ژنیش بێنی ، دیسانیش بیهێنە بەڵام دۆستی من بە بەخوا هەر بەوەش ڕازبم . تەنها نامەیەكم بۆ بنوسە ، بنوسە كە بۆچی لە من زیز بوویت . پەروێز سوێندت ئەدەم تەنها یەكێ ، پاشان ئیتر هیچ شتێكم لە تۆ ناوێ . من ناتوانم رایەڵم بەرابردوومەوە بپچڕێنم . من هەمیشە خۆم بە هی تۆ و ، كامی ئەزانم . بێلە من لانی كەم بە و هیوایە دڵخوش بم بێلە منیش ساتێك بژیم . پەروێز بەخوا نەخۆش و بەدبەختم و تۆ ناتوانی تێ بگەی كە چەندە پێویستم بە تۆ یە تومەر گی كامی ، نامەم بۆ بنووسە .

فروغ

## گۆرانییەکانی حەکیم عومەر خەیام

بە کۆشش و سەرمایەی حسین کوهی کرمانی , بەڕێوەبەری گۆڤاری(نەسیمی سەبا)بەدەست و خەتی تاهیری خۆشنووس .

مانگی مایسی 1941

ئەمە جیاکارییەکانی کتێبێکە بە ئەندازەی لەپی دەست کە پەروێزی شاپور لە بەرواری 13|11|1951 پێشکەشی کردووە بە فروغ. لەسەر بەرگی کتێبەکە نوسراوە (پێشکەشە بە فروغی خۆشەویستم).لە پشتی بەرگیش نوسراوە( ئەم کتێبە بچووکە لەلایەن پەروێزەوە پێشکەشکراوە بە فروغی ژنی بەوەفای بۆ یادگاری.بۆیە ئەم کتێبە لە بەرواری( 13|11|1951)وە بەهی فروغ حسابە. فروغیش لە ژێر دەست و خەتەکەی شاپوردا نووسیویەتی: (ڕاستە , پشتگیری دەکەم). بەسەر هەتدیٚ لە چوارینەکانی خەیام دا نیشانەی(×) هێنراوە کە نازانم ئیشی کیٚ یە. باشتر وایە ئەو چوارینانە بخوێنینەوە .





### چوار ینەکان:

زان پیش کە بر سرت شبیخون ارند
فرمای بتا نا می گلگون ارند
تو زر نئی ای غافل و نادان کە ترا
در خاك نهند و باز بیرون ارند

******

گویند بهشت و حور عین خواهد بود
انجا می و شیر و ا نگبین خواهد بود
گرما می و معشوق پرستیم رواست
چون عاقبت کار همین خواهد بود

******

روزی کە گدشتە ست ا ز او یاد مکن
فردا کە نیامدە ست فریاد مکن
بر نامدە گدشتە بنیاد مکن
حالی خوش باش وعمر برباد مکن

**هنگام صبوح ا ی صنم فرخ پی**

**بر ساز ترانه ا ی پیش ا ور می**

**کافکند به خاك صد هزاران جم و کی**

**ا ین امدن تیر و مه رفتن دی**

*********

**یارب بگشای بر من ا ز رزق دری**

**بی منت مخلوق رسان ما حصری**

**ا ز باده چنان مست نگه‌دار مرا**

**کز بی خبری نباشدم درد سری**

***********





## له ڕۆژمێرێکی بەر باخە ڵی فروغ:

ئەم ڕۆژمێرە بە ئەڵمانییەو هی ساڵی 1956ی زایینییە کە دەکاتە 1334 و 1335ی هەتاوی.پێدەچێ فروغ کاتێ کە لەئیتالیا بووە , چووبێت بۆ ئەڵمانیا کڕیبێتی . چواردە لاپەڕەی سەرەتای ڕۆژمێرەکە , لێ کراوەتەوە و دیار نیە کە ئیشی کێ یە . یاداشتەکان لە ملنگی ئازارەوە دەست پێدەکەن, واتە لە مانگی ئیسفەندی 1334(1955) بەشێکی تری یاداشتەکانی د ەربارەی ساڵی (1956) ەو زۆربەی یاداشتەکان دەربارەی ئیشوکاری ڕۆژانەیە. وەك: کاغەز بۆ پەروێز , بەرنامەی کامی, باخچەی ساوایان, وێنە کێشان, پۆرترەیتی خۆم, دوکتۆر, ئاوێنە, پەردە, کورسی, قوماش, کلاوی سوور , خاتوو ماریت,بازاڕی گوڵی لالەزاری نوێ. فیکری ماڵ, کار, جلوبەرگی کامی,وەرگرتنی پارە لە ئەمیر کەبیر, قوماشی پاڵتۆ لە ئەستار , لالەزار کۆلانی قوتابخانەی ئەدیب, چاپخانەی فیردەوسی, پەخشی ئێران و فەرەنسا, پزیشکزاد بۆ وتارەکە , وەرگێڕانی کتێب, ڕەزەوی و خوشکەکەی لو ماڵی ئێمە , هۆنراوە بۆ سپیدەی فەردا,لایم لایت لەگەڵ مێزی, هۆنراوەیەکی نوێ بۆ خۆشە , لوعبەتی شیبانی, بۆ چاپ لە ڕۆژنامە, ڕێستۆرانی ئەدەب, ئەنجومەنی هونەری, وتاری چەند شیعرێك, هونەرە





جوانەکان, بڕیارە لەگەڵ پەروین بچینە سینەما, جەعفەری بە مەبەستی ڕێکەوتننامە , دێتە ماڵمان, هۆنراوە بۆ ژمارەی سێزدەبەدەری ڕۆشەنفیکرو لەم جۆرانە. لە ڕۆژمێرەکەدا هەندیێهۆنراوە بە خەتی فروغ دەبینین کە زیاتر هی (سەعدی) و( سایە) ن , گرینگیدانی فروغ بە سەعدی , ڕنگە پێویستی بە لێکۆڵینەوە بێ.



لەکوێ خەبەری هەیە نووستوو, کە سەری بەسەر سەری یارییەوە
بێت

کە شەو چەندە درێژە لە چاوی پاسەوانان
ئەی سوبحی شەو نشینان , گیانم ئارامی لێ برا
ئەوەندە درەنگ کەوتی , وەك شێو لای ڕۆژو وانان
غەزەلێکی سەعدی ببینن"
گورگی دەم پیس و .........

عیشق ما لە دڵاو یار لە دەست چوو
دۆستان کۆمەکێ , کار لەدەست چوو
بە کۆچی تۆ , دەزانی چی ماوە لە دڵ
لە کاروان چی دەمێنێ, جگە ئاگرێ لە مەنزڵ

تاماوم لەم خوماری مەستییە سەر هەڵنابڕم
چونکە هێشتا من نەبووم , کە تۆ لە دڵما جێگیر بوویت
سەیرێکی ڕەفیقان کەم , هەزار جار باشترە لەوەی کە
سڵاوێ بنووسی , یان دیارییەك بنێری

یا عەتری گوڵە یاسە وەنەوشەییەکان ئێواران
بەرەو سەر زەمینی هەوەس , ڕاپێچم دەکەی
گەردنم چاوەڕێی ئەڵقەی دەستانی تۆ بوو
لە سەر سەرچاوەی خراپ
بەڵام بینیم بە دوو چاوی نیگەران



کە دەستانی تۆ تێپەڕین
وەکو ئاوێك , ڕەوانە بەرەو خە ڵکان
گریەم سەر هەڵدا , لە دامێنی ئەودا
بە هەنسکێ کە ئێستاش
یادی,جەستەم دەسووتێنێ

قاوخی پێخەفم بەتاڵی تەنیاییەو
تۆش وەك مرواری
ئاویزانی گەردنی خەڵکی تری

کچێ نوستووە لەبەر مانگە شەو
وەك گوڵە نیلۆفەرێکی سەر ئاو
خەو دەبینێ کە یارەکەی بیمارە

بینیمیت لە خەوا , خەمبار هەڵتوتاو
سازێکی شکاو لە باوەش داناو
باشی دەناسم ئەم سازە پڕ سۆزە
درێغ... عەشقی من ...عەشقی تێك شکاو

(سایه)
کێشەی ئەوانەی لە خوا هەڵگەڕاونەتەوە , ئەوەندە زەحمەت نیە
زەحمەت, کێشەی ئێمەیە کە خوا لێمان هەڵگەڕاوەتەوە
دەزانم لە کۆڕی نەیاراندا شەو بادەت خواردو, نازانم
کۆڕت بە جێ هێشت , یا هەر لەوێ نوستی
ئەی زاهید لە تۆ چ نەمرینێ , چی دوعیێ هەبووە
کە خاوەن نەفسێ لەم خێڵە سەر دەربێنێ

(موجەممەری ئەسفەهانی)

شیتاڵ دەبوو ئەی شێخ , بەرگی تەقوا لەبەرتا
گەر گرفتاری کەسێ دەبووی , تۆش وەکو من
(واله)
لەم گرینەی ناصح مەبەست دەبێ چی بێ , حاڵی نابم
دڵ هی منەو , چاو هی منەو, دەست هی منەو , قۆڵیش هی من .



**ئەمەش کلێشەی سەرەتایی** هۆنراوەیەکە کەفروغ پەیتا پەیتالەڕۆژژمێرەکەیدا نووسیوویەتی و خەتی بەسەردا هێناوە.شێوەی کۆتایی ئەم هۆنراوەیە بەناوی (تێکشکانی پێویستییە) لە کتێبی (دیوار)دا چاپکراوە. ئەو شیعرەی فروغ پێش و پاش دەستکاری دە خوێنیتەوە

ئای کە خۆشە
وازهێنا ن لە تۆ و خۆ بە ستنەوە بە یەکێکی تر من
لەسەر گۆڕەکەت........
لەسەر گۆڕەکەت ئەی عەشقی نیاز ئالأو
سەما کردن
ئای کە خۆشە
وازهێنان لە تۆ
لە تۆ ئەی سێبەری ترس
لە تۆ ئەی ماچی سوتێنەر
باشتر وایە تۆ چاو بپۆشی
هاتم خۆم بە تۆدا هەڵواسم
بەلأم بینیم کە تۆ چڵێکی بێ گەلأی

بەڵام بینیم کە تۆ لەسەر ڕوخساری هیوام
زەردەخەنەی مەرگی
کڵپەیەک بوو دامرکاوە
ڕێسمانێک بوو , هەڵوەشاوە
دڵ کە لە بەندت ڕزگاری بوو
جامی جادوویی خەفەت شکا
ئۆخەی
ئۆخەی کە تەلیسمی تۆ بەتاڵ بوو
بووم بە گوڵ تا لە شەوی تۆدا
عەتری (...) خەونێک
کڵپەیەک بوویت و دامرکای
خەندەیەک بوویت و قەتیس مای
باشتر وایە بیرنەکەیتەوە
لەمن و ئێشی دەروون سووتێنم
هاتم تا لەگەڵ تۆ
لە (...) مۆم
گڕێک بوو دامرکا
دڵ کە لەبەندت ڕزگار بوو
جامی جادوویی خەفەت شکا
کڵپەیەک بوو دامرکاوە
ڕێسمانێک بوو هە ڵوەشاوە





## تێکشکانی نیاز

ئاگرێ بوو دامرکاوە
ڕێسمانێ بوو هەڵوەشوە
دڵ کە لە بەندت ڕەهابوو
جامی جادوویی غەم وردبوو

هاتم تا خۆم بە تۆوە هە ڵواسم
بەڵام بینیم کە تۆ چڵێکی بێ گەڵای
بەڵام بینیم کە تۆ لەسەر روخساری ئومێدم
خە ندەی مەرگی

ئای کە خۆشە
لەسەر گۆڕەکەت ئەی عیشقی نیازئالاو
سەماکردن ...

ئای کە خۆشە
لەتۆ بڕان و بە غەیری تۆ گەیشتن
لەسەر غەم دەرگا داخستن
بەهەشت کەوا لێرەدایە
سێبەری هەورو کەناری مەزرا
بە خوا لێرەدایە

باشتر  وایە تیٚ نەفکری
لە من و ئازاری دەروون  سوتێنەرم
کەمن  ئۆقرەم نیە  لە دەست  ئێش و ئازار
کەمن  بە کڵپە  ناگرێم

کتێبی (دیوار)



**لە زەرفێکدا** کە شاپور  نامەکانی فروغی تێدا  هەڵگرتووە , چەند  هۆنراوەیەك  هەبوو کە هەموویان  لە ڕۆژنامەکان  کراونەتەوە , لام وابوو کە دەبیٚ شاپور  هۆیەکی هەبیٚ , بۆ هەڵگرتنی ئەم نامانە .چوار هۆنراوەیان  هی  فروغە و یەکێکیشیان  هی شاملۆیە. پێشکەش  بە شاپور کراوە   . یەك دوویەك  لەم  هۆنراوانە پەیوەندی  بەنامەکانەوە هەیە . جگە لەوەش  کە  نامەکانی فروغم خوێندەوە , هەستم کرد هەندێکبان پەیوەندییان  بە شیعرکانییەوە هەیە . پارچەیەك  لە نامەکانی دێنم و پارچەیەکیش  لە لە هۆنراوەکانی .خۆتان بەراوردیان بکەن“ (هیچ  شتێك  دادی تەنیایی گیانی من  نادا. وەك  قاپێکی خاڵی وام و لەزۆنگاوەکاندا بەدوای گەوهەردا دەگەڕێم ) ،،لەجۆگەیەکی بچووکا کە دەڕژێتە ناو  چالأویٚ , هیچ  ڕاوچییەك مرواری ناخاتە داویٚ ) ئەو مەلەکردنانەم  بیر دێنەوە کە نیوەڕوانی گەرمی هاوین پێکەوە دەمانکرد،جلم  داکەند , تالەو هەوا دڵگیرەدا ....... (ئەگەر  نەگریامایە , دەتاسام)

(من زۆر  تەنیام , ئەمڕۆ لە ئاوێنەکەدا سەیری خۆم کرد . ئێستا وردە  وردە لە ڕوخساری  خۆم دەترسم ).– بەدرێژایی ڕۆژ لە ئاوێنە کەدا \ریامئێستا بۆنی عەتری گولە  ئەقاقیبەکان  لەپەنجەرەکەوەدێتە ناو ژوورەکەم ,

حەز دەکەم هەست و نەستی خۆمت بۆ بنووسم . نازانم بۆچی حەز دەکەم تۆ لێرە بوویتایەنازانم بۆچی لە خۆڕا کەوتمە یادی ئەو خانووەی کە لە گەڕەکی (موققەدەم) هەمبوو.پەیوەندی زیهنی نێوان عەتری ئەقاقی و ئەمیادەدەتوانێ چی بۆ من ڕوون بکاتەوەکوڵانەکانی وڕ بە عەتری ئەقاقیکەسایەتیم وەکو پارچە سەهۆڵێك کەوتبێتە بەرهەتاوی تانەوبەدزمانی خەڵکی.دڵۆپ دڵۆپ وا دەتوێتەوە.بڕوانە خەم لەناو دیدەما دڵۆپ دڵۆپ چۆن دەبێ بە ئاو

پەروێز ئەمڕۆ , بەفر دەبارێ . پاش چوار ساڵ ئەمڕۆ ڕەنگی بەفر دەبینم. بیرمە هەمیشە پێم دەوتی "ئەهواز ئێمەی لە بینینی بەفر بێبەش کردووە. و لە دڵەوە حەزم دەکرد, کە زستانی ڕاستەقینە بە چوی خۆم ببینم . بەڵام ئێستا وا دەزانم ئەم بەفرە بەسەر دڵی مندا دەبارێ و ساردی شوومی ئەو بەفرە لە هەموو دەمارەکان و ڕەگەکانمدا هەست پێدەکەم . خۆزگە ئەم بەفرە بەسەر گۆڕەکەمدا دەباری .

لەو دیو شووشەوە بەفر دەبارێ
لەو دیو شووشەوە بەفر دەبارێ
لە مەرزەی خامۆشی سینەمدا دەستێ
تۆوی خەفەت دەچێنێ
دوا جار سەرت سپی بوو , ئەی بەفر
بۆیە سەرەنجام وات لێ بەسەرهات
باریت لە دڵی مناو درێغا
نەباریتایە بەسەر گۆڕەکوی منا !..





مایەی سەرسامییە کە ئەو ڕۆژەی فروغماڵئاوایی لە دنیا کرد , بەسەر گۆڕەکەیدا بەفر دەباریو ئێمەش شاهید بووین. نامەکانی فروغ کۆمەکێکی باش بە خوێنەر دەکات لە تێگەیشتنی هۆنراوەکانیدا.

## تەنیایی بۆ تۆ

لەو دیو شووشەوە بەفر دەبارێ
لەو دیو شووشەوە بەفر دەبارێ
لە توێی خامۆشیی سینەما دەسنێ
تۆوی خەفەت دەچێنێ

دواجار سەرت سپی بوو ئەی بەفر
بۆیە سەرەنجام وات لێ بەسەر هات
باریت لە دڵی مناو درێغا
نە باریتایە بەسەر گۆڕەکەی منا

وەکو نەمامی لاواز دەلەرزێ
گیانی من لە دەست سەرمای تەنیایی
بەناو تاریکایی دڵما دەخزێ
ترس و وەحشەتی دنیای تە نیایی

تۆ ئیدی گەرمی نابەخشی بەمن

ئەوین، ئەی خۆری زوقم بەستوو
سینەی من سەحرای نائومێدییە
ماندووم، تەنانەت لە عەشقیش ماندوو

خونچەی تاسەی تۆش ئیتر واژاکا
هۆنراوە، ئەی شەیتانی ئەفسونکار
گیاتیشم لەم خەونە پڕ لە ئازارە
سەرەنجام بێداربوەوە , بێدار

لە دوای ئەو ئیتر رووم کردە هەرلا
بینیم کە سیحری سەرابێکەو بەس
ئەوەی کەوا من لەدووی دەگەڕام
ئەیداد کەوا وێنەی خەوێك بوەو بەس

ئەی خودا، دەسا بۆ ساتێکیش بێ
بە روومدا بیکەوە دەرگای دۆزەخ
تاکەی لە دڵدا پەنهانی بکەم
ئاخ و حەسرەتی گەرمای دۆزەخ

ئای چەندم بینی ئەو هەتاوەی کە
پەیتا پەیتا لەگەڵ ئێواران مات بوو
هەتاوی بێ خۆر ئاوابوونی من
درێغا , کە لە باشوورا....مات بوو *



دوای ئەو من ئیتر لەدوای چی وێڵم
دوای ئەو من ئیتر لە چی دەگەڕێم
فرمێسکێکی سارد هەتا بیڕێژم
گۆڕێکی گەرم تاتیا بحەوێم

مەبەستی لە باشوور ( جنوبی ئێران) ە واتە ئەهواز، چونکە لەوێ_فروغ و شاپور لەیەك جیابوونەوە.

لەو دیو شووشەوە بەفر دەبلرێ
لەو دیو شووشەوە بەفر دەبارێ
***لە توێی خامۆشی سینەما دەستێ***
تۆوی خەفەت دەچێنێ

کانوونی دووەمی 1955

1–لە گۆڤار بڕاوە " وێنەی محەمەدی تەجویدی .دەستەواژەی " بۆ تۆ" و دوو کەوانەکەی فروغ .بە پێنووس زیادی کردووە.

## اوازی ژان

له ناخمدایت و هێندەش لێم جودای تۆ
لەگەڵ مندایت و چاو بۆ لایەکی تر
هیچ ڕێگەی گفتوگۆم بۆ نەماوە
تۆ خەریکی گفتو گۆی , لای یەکێ تر

نوقمی خەمە , دڵ لە سینە , ترپەی دێ
لە گەڵ تۆ بێ قەرارە, بێ تۆش بێ قەرارە
وای لەو ساتەی بێ خەبەر لە حاڵی من
کۆچ کەی و بە جێ بێڵی ئەم هەوارە

بەرەو هەر کوێ بڕۆی سێبەری تۆم
سەرم داناوە لە ژێر هەردوو پێی تۆ
وەك تۆم قەت لەدنیادا نەدیوە
هە تاکو هەلبژێرم ئەو لە جێی تۆ

تۆ شادیو خەمی منی ....سەرسامم
لە تۆم دەویۆ تۆی پەناگەی ژیانم
شەپۆلێکی کێویم بێ ئاگا لە خۆ
ئەسیری جازیبەی مانگی تابانم



فەرمووت وازت لێ بێنم ......هەی حەیف و داخ
مەگەر هەودای وەفا , مایەی پسانە
لەخۆم گەر واز بێنم , لە تۆ واز ناهێنم
مەگەر پەیمانی عاشق, مایەی شکانە

بینیمیت شەوێ لە خەوناو پێی سەر خۆشم
وای... مەگەر هەر لە خەونا بێی دیدار
خۆ خونچە نیت منی سەرمەستی تاسە
تەکان دەم و لێت کەمەوە لە لقێ دار

کلْپە دەکا لە تاریکایی شەوما
ئاگری شینی هەردوو چاوانی تۆ
ڕێگە مەگرە........بەڵکو بگەم بەتاسە
لەبن ساباتی خەمی پەنهانی تۆ

تشرینی دووەمی 1955
تاران

## یاری من  فروغ فەروخزاد

یاری من
بەو جەستە رووتە بێ شەرمەوە
لەسەر لاقە بێ هێزەکانی
وەکو مەرگ ڕاوەستا
**********
هێڵی بێ ئارامیی خوار
ئەندامە یاخییەکانی ئەو
لە کلێشە پتەوەیدا
دەداتە بەر
****
یاری من
دەڵێی لەوەچەی فەرامۆش کراوەکانە
دەڵێی تەتەرێك
لە کۆتایی چاوەکانیا
بەردەوام لە کەمیندا وەستاوە
دەڵێی بەر بەرییەك
لە بریقەی گەشی ددانەکانیا
سەر مەستی خوێنی گەشی نێچیرێکە
******
یاری من



هەروەکو سروشت
مانایەکی تەواو روونی هەیە
ئەو بە تێکشکانی من
قانوونی ڕاستگۆیانەی هێز
پشت ڕاست دەکاتەوە
*********
ئەو وەك كێوییەك , ئازادە
وەك غەریزەیەکی بێ کەمو کوڕ
لە قولایی دورگەیەکی چۆڵدا
بە پارچە خێمەکانی مەجنوون
تۆزی ڕێگا
لە کەوشەکانی پاك دەکاتەوە
*********
یاری من وەك خواوەندێك , لە پەرستگای خەیاڵ
دەڵێی هەر لە سەرەتای بوونیەوە
بێگانە بووە
ئەو
پیاوێکە لە سەدەکانی رابردوو
بیر هێنەرەوەی ڕەسەنایەتی جوانیی
***********
ئەو لە هەوای خوی دا
وەك بۆنی منداڵێ
بەردەوام بیرەوەری بێ گوناهانە

دێنێتەوە یاد
ئەو وەك سروودێكی خۆشی ناو خەڵكە
پڕ لە زەبرو زەنگ و سۆز
ئەو دڵسۆزانە عاشق دەبێ
ئەو دڵسۆزانە خۆشی دەوێ "جێ بە جێ بووە"
********
گەردەكانی ژیان گەردەكانی خاك
خەمی مرۆڤەكان ..خەمە پاكەكان
ئەو دڵنەوازانە خۆشی دەوێ
باخچەی گوندێك ..درەختێ
قاپێ دۆندرمە.. دوگمەی جلێ
******
یاری من
مرۆزێكی سادەیە
مرۆڤێكی سادەیە كەمن
لە ولاَتی شوومی سەر سامیدا
وەك دوا نیشانەی ئایینێكی سەبر
لە پەنای دەوەنێكدا
شار دوومەتەوە

**هاوینی** 1960
**لە گۆڤارێك براوە**
**بەژێر هەندێ لە دێڕەكاندا پاشان خەت كێشراوە .**





## لە شەقامە ساردە كانی شەودا

من پەشیمان نیم
من بیر لەم خۆ بەدەستەوە دانە دەكەمەوە , ئەم خۆ
بەدەستەوە دانە بە ژانە
من خاچی چارەنووسی خۆمم
لەسەر گردەكانی كوشتارگای خۆم ماچ كرد.
***
لەشەقامە ساردەكانی شەو دا
جووتەكان پەیتا پەیتا بە گومانەوە
یەكتری بە جێدێڵن
لەشەقامە ساردەكانی شەودا
بێجگە لە خوا حافیزی , خواحافیزی
هیچ دەنگێكی تر نایەت ,
*****
من پەشیمان نیم
دەڵێی دڵی من لەوسەری زەمانەوە دەبزوێ
ژیان دڵی من دووبارە دەكاتەوە
وە گوڵی هەواڵبەر كە بەسەر دەریاچەكانی با دا دەڕوات
ئەو من دووبارە دەكاتەوە
*****

ئای دەبینی ؟
کە چۆن لە ژاندا پێستم شەق دەبا
چۆن شیر لە دەمارە شینەکانی
مەمکی ساردی مندا
دەمەیێ
چۆن خوێن ، ڕووانی کرکڕاگە ئاسای خۆی
لە کەمەری بەتاقەتی مندا
دەست پێدەکات

*******

من تۆم تۆ ,
وە کەسێك کە عاشقە
وە کەسێکم کە لەناخی خۆیدا
لە ناکاو پەیوەندییەکی نادیار دەبینێتەوە
لەگەڵ هەزاران شتی نامۆو نەزانراوا
من هەموو ئارەزووی بە تینی زەویم کە ئاوەکانی گۆی زەمین
هەڵدەلووشی
تا هەموو دەشتەکان بێنێتە بەر

*******

گوێ بگرە
لە دەنگی دور دەستی من
لەناو تەمی چڕی وێردەکانی دەمەو بەیاندا
وە لە خامۆشیی ئاوێنەکاندا بۆم بگەڕێ
کە چۆن دیسان بە پاشماوەی دەستەکانم



هەست بە قولاَیی تاریکی هەموو خەونەکانی دەکەم
وە دڵم وەك پەڵەیەکی خوێناوی
خاڵکوت دەکەم
بەسەر بەختەوەریی بێ گوناهانەی
وجود

******

من پەشیمان نیم
بدوێ لەگەڵ من ئەی خۆشەویستم
دەربارەی منێکی تر
کە تۆ لە شەقامە ساردەکانی شەودا
هەر بەم چاوە عاشقانەوە دەبینێتەوە
وە یادی من بکە " کاتێ ماچی خەمناکی ئەو
دەکەوێتە سەر هێڵە ناسکەکانی ژێر چاوانت .

**فروغ فرخزاد**
**مانگی تشرینی دووەمی** 1960

## سرود

## ئەحمەدی شامیلۆ

## بۆ پەروێزی شاپور

برۆ پیاوی بێدار, ئەگەر کەسێ نییە
کە دڵی لای تۆ بێ , تەنها بۆ یەك نەفەس !
بە تاڵیی ڕۆیی هەموو ژیانت ,
چۆن لەبەرە هووتی تالاودا , بەدووی شەکەر دەگەڕێی ؟

تێکی شکاندی بێهودە گەڕان
پاڵتۆی هیلاکیی دانێ لەسەر شان
پاڵتۆیەك هەمووی پینە پینەیە
پاڵتۆیەك هەمووی رق و کینەیە
لە هیلاکی , پێم پڕ ئێش و زامە
نەڕێو, نە زیندەوەرێ, لەپێش و دوامە
ناوەختم هەیە , بێمەوە ماڵێ
نە بەخت بەسەرا , دەمخاتە چاڵێ
لەپێش و لە پاش , نە هیواو نەترس
درك و بیابان, بیابان و بەس !
سوودی چییە گەر بێ دەنگ نەمێنم , چونکە :
" یاران ! لەم دەشتە , تەنیا منم " ؟.



گریمان بە هاوارێ , گەرووم بدڕێنم ,
کە بە چاو تروکاندنێك , وەك خۆڵەمێشی لێ بێت
گریمان بروسکە هەڵکەم , چ سوود
کە دوکەڵ و گڕی نیە , ئەم دارە
گریمان هاوارم گەیاندە هەوا
خەنجەرێکم کرد بە گیانی شەوا

تیغی هاواری من , هیچ نابڕێ
لەو مەرگ ئاوایە , کەس زیندوو نییە !

برۆ, پیاوی بێدار , ئەگەر کەسێ نییە
کە دڵی لای تۆ بێ , بۆ یەك نەفەسێ !
با بخەون ئەگەر خۆشییان لێ بڕوا
ژانی ڕێ, دوایی, حاڵییان دەکا

بێڵە با شەو زاڵ ببێ , دەبینی کەوا
لە فرمێسکیان خۆرێ سەر هەڵدەدا
لەتاوی گەرما , کە سەحرای مردوو
گەنی وەك لاشەی شەوی بۆن کردوو
گەر هێشتا هەر لە کونجێ دوور دەست
هیوایەك جێماو , لە دوو توێی خەڵوەت

**دەبینی فرمێسك لە قورسایی شەو**
**دەبارێ وەکو تینی خۆری تاو**

****

**بڕۆ پیاوی بێدار, ئەگەر کەسێ نییە**
**کە دڵی لای تۆ بێ , بۆیەك نەفەسێ !**
**رێگا پڕ دڕکەو , لە دووی گوڵی تۆ**
**لە بۆ شەکر دۆست, قسەیەکی تاڵ بەسە !**

**تاران** 1960--1958



**تێبینی**

**سەرجەم ئەم هۆنراوانە لە لایەن هاوڕێی بەڕێزم " دکتۆر ناسح فاتح" ناسراو بە " ئارام قەرەداغی"یەوە داڕێژراونەتەوەو بە شیعرەوە وەرگێڕدراون.**



دخی (خواهر پرویز شاپور) ،فروغ و گلوریا



پرویز شاپور و فروغ

1-دوخی ( خوشکی پەروێز شا پور فروغ و گلۆریا

2- پەروێزی شا پور و فروغ







فروغ و امیر در آلمان

فروغ و ئەمیر لە ئەڵمانیا





ـــــــماعیل محرابی، نسرین پورحسینی و فروغ در نمایش "شش شخصیت در جست و جوی نویسنده"

ئیسماعیلی میحرابی _ نەسرینی پور حوسەینی
فروغ لەشانۆنامەی ( شەش کەس بەدوای
نووسەرێکدا دەگەڕێن )







فروغ در نمایش "شش شخصیت در جست و جوی نویسنده"

فروغ لەشانۆنامەی ( شەش کەس بەدوای نووسەرێکدا
دەگەڕێن )









تهران ـ دربند ـ گورستان ظهیرالدوله

**تاران. دەربەند- گۆڕستانی زەهیرو لدەولە**

# زنجیرەی بڵاوکراوەکانی خانەی وەرگێڕان لە ساڵی 2005

| ناوی کتێب | زمان | نووسەر | بابەت | وەرگێڕ |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ئەفغانستان و پێنج ساڵ دەسەلاّتی تاڵیبان | فارسی | وحید مژده | سیاسی | عەلی بیروەندی |
| تۆپەکە | ئینگلیزی | سی. ئێس. فۆریستەر | رۆمان | ئەمین شوان |
| ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمەریکا لەسەدەی (21) | | ئا/( ئە نجومەنی داڕشتنی ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا ) | سیاسی | دلاوەر عەبدوڵلا، مجید ساڵەح - تارا شێخ عوسمان |
| نهێنی یاری کاغەز | دانیمارکی | یۆستاین گاردەر | فەلسەفە | بەهرۆز حەسەن |
| کلتوری بەجیهانی بوون و بەجیهانی کردنی کلتور | عەرەبی | د.بورهان غلیۆن /د. سەمیر ئەمین | کۆمەڵناسی | خەبات مەحمود |
| چەند لاپەڕەیەك لە سەربوردەی خۆم | فارسی | سەدرەدین عەینی | ژیاننامە | عەزیز گەردی |
| رەوشی ئابووری وکۆمەلاّیەتی کوردی رواندز | | ئی. ئار. لیچ | کۆمەلاّیەتی | عەزیز گەردی |
| تێگەیشتنی تیۆرە سیاسییەکان | فارسی | تۆماس ئارتۆر سپراگێنز | سیاسی | فەرشید شەریفی |
| التنین | کوردی | محەمەد موکری | ڕۆمان | نەبەز کەمال |
| پلانداناو پلاندانانی ڕاگەیاندن | عەرەبی | د.عماد محمد حسین الهلالی | ڕاگەیاندن | دلاوەر عوسمان ساڵح |
| تۆماری شێتێك | ڕووسی | ن. گۆگۆڵ | شانۆی | جەلال تەقی |
| جوگرافیاو پەیوەندییە سیاسییە نێودەوڵەتییەکان | عەرەبی | محمد عبدالغنی سعودی | جوگرافی | جەزا تۆفیق تالیب ئەحمەد عەلی ئەحمەد |
| گەمییەکەی نوح | تورکی | یەشار کەمال | ڕۆمان | ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل |
| گوتارو وەرگێڕان | فارسی | عەلی سوڵحجوو | وەرگێڕان | کۆساری فەتاحی |
| رینێ دیکارت | ئەڵمانی | رینێ دیکارت | فەلسەفی | د. حەمید عەزیز |
| ڕۆژی شۆڕش | ئینگلیزی | ڕاجی عمر | مێژووی | شیاو محمود کاوە سەباح |
| دۆنی ئارام | عەرەبی | میخائیل شلۆخۆف | ڕۆمان | محەمەد حەمە ساڵح |
| دووبرا | ڕووسی | لێرمەنتۆف | شانۆی | جەلال تەقی |
| هونەری وانەگوتنەوە | عەرەبی | محمد عبد الرحیم عدس | پەروەردەی | محەمەد ساڵح مەلا حەسەن هۆرێنی |
| کلیلی دەسەلاّتی چوارەم | عەرەبی | د.فاروق عمر علی | ڕاگەیاندن | هیوا ساڵح ئەحمەد |
| هنری کیسنجەر | عەرەبی | هنری کیسنجر | سیاسی | نەبەز کەمال نوری |
| شیخوخة کلیوباتراو أطفال المطر | کوردی | لەتیف هەڵمەت | هۆنراوە | لەتیف هەڵمەت |
| سەرچاوەکانی دیموکراسی | عەرەبی | لاری دا یمۆند | سیاسی | دلێر میرزا |
| خۆڕاگرەکان | عەرەبی | بۆریس گۆرباچۆڤ | ڕۆمان | خانەی ڕادۆگا-مۆسکۆ |
| سۆفیگەریتی | عەرەبی | نێکۆس کازەنتزاکیس | | ڕەئوف حەسەن |
| نەریتی فاشیزم | فارسی | جۆن وایس | مێژووی | کارزان کاوسێن |
| کورتە مێژووی گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵناسی | فارسی | بۆتۆڵ | کۆمەڵناسی | فەرشیدی شەریفی |
| تاو | عەرەبی | لاوتزۆ و چوانگ تزۆ | فەلسەفی | دیاری عەلی و ڕەئوف حەسەن |





| | | | | |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| خاڵە ساڤا | ڕووسی | أ.پ.چیخۆف | شانۆی | جەلال تەقی |
| الأنفال الکورد و دولة العراق | کوردی | شۆڕش حاجی رسول | بەڵگەنامەی | خانەی وەرگێڕان |
| ڕاوچی | عەرەبی | یەشار کەمال | چیرۆك | تەها ئەحمەد ڕەسول |
| زانستی کیمیا بۆ هەمووان | ئینگلیزی | جی.بی. شولپین | زانستی | د.بایەزید حەسەن |
| صفحات من تأریخ کفاح الشعب الکوردي ج1 | کوردی | فاتح ڕەسول | مێژووی | کەمال غەمبار |
| لەدەربارى شاوە بۆ زیندانی شۆڕش | عەرەبی | إحسان نرغی | سیاسی | ئەحمەد قادر سەعید |
| ڕۆڵی کارکردن لەگۆڕینی مروۆڤ بۆ مە یمون | ئەڵمانی | فردریك ئەنگڵس | کۆمەڵناسی | کەریم مەلا ڕەشید |
| هونەری شیعر | ئەڵمانی | ئەریستۆتلس | فەلسەفە | د.حەمید عەزیز |
| کۆمەڵگەی نەریتی و کۆمەڵگەی مۆدێرن | فارسی | مالکوم واترز | فەلسەفە | عبدوڵلاّ ڕەسوولی |
| خمسون قصیدة مترجمة عن الشعر الأنکلیزی الحدیث | ئینگلیزی | الأدب الأنکلیزی | هۆنراوە | وفاء عبداللطیف زین العابدین |
| حەوت گوتار دەربارەی وەرگێڕان | فارسی | کورش صفوی | وەرگێڕان | رفعت مرادی |
| دیموکراسییەتی ڕاگەیاندن و پەیوەندیکردن | عەرەبی | د. محمد عبدالقادر حاتم | ڕاگەیاندن | مەم بورهان قانع |
| دڵشاد | عەرەبی | سەلیم بەرەکات | ڕۆمان | جەوهەر کرمانج |
| گوڵبژێرێك لە پەندو سەرهاتە ناوازەکان | عەرەبی | هادی عەلەوی | پەند | حسێن عوسمان نێرگسەجاڕی |

| ناوی کتێب | زمان | نووسەر | بابەت | وەرگێڕ |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| چەردەیەکی کۆمەلاّیەتیانە لە مێژووی نوێی ئێراق /2 | عەرەبی | د. عەلی وەردی | کۆمەڵناسی | کوێستان جەمال |
| چەردەیەکی کۆمەلاّیەتییانە لەمێژووی نوێی ئیراق/5 | عەرەبی | د. عەلی وەردی | کۆمەڵناسی | حەسەن جاف |
| چەردەیەکی کۆمەلاّیەتییانە لە مێژووی نوێی عێراق بەرگی (6) | عەرەبی | علی وردی | کۆمەڵناسی | دلێر میرزا |
| چەردەیەکی کۆمەلاّیەتییانە لە مێژووی نوێی عێراق پاشکۆی بەرگی (6) | عەرەبی | علی وردی | کۆمەڵناسی | دلێر میرزا |

